# ناوەڕۆك

بەرگی یەكەم

## بەشی یەكەم زمانی كیمیا 4


بەندی 1

### شێوگ و ئاوێتە كیمیاییەكان 6

1-1 ناو وشێوگە كیمیاییەكان ........ 7
2-1 ئۆكسانە ژمارەكان ........ 20
خوێندنەوەیەكی زانستی: كیمیا و دەپەهونەرییەكان 24
3-1 بەكارهێنانی شێوگە كیمیاییەكان ........ 25
4-1 دیاریكردنی شێوگە كیمیاییەكان ........ 37
پێداچوونەوەی بەندی 1 ........ 42

بەندی 2

### هاوكێشە و كارلێكە كیمیاییەكان 46

1-2 وەسفی كارلێكە كیمیاییەكان ........ 47
خوێندنەوەیەكی زانستی: مەتەڵی كیمیایی ........ 95
2-2 جۆرەكانی كارلێكە كیمیاییەكان ........ 60
كردە چالاكییەكی خێرا: بەكارهێنانی نموونە،
لە هاوسەنگكردنی هاوكێشە كیمیاییەكاندا ........ 67
3-2 زنجیرەی چالاكی توخمەكان ........ 68
خوێندنەوەیەكی زانستی: ترشە ئاو –
هەڕەشەیەكی شاردراوەیە ........ 71
پێداچوونەوەی بەندی 2 ........ 72

بەندی 3

### ژمار كارییە كیمیاییەكان 67

1-3 پێشەكییەك لە ژماركارییە كیمیاییەكاندا ........ 77
خوێندنەوەیەكی زانستی: پێكهاتنی كیمیایی
ڕۆن –زەیتوون ........ 80
2-3 ژماركارییە كیمیاییە بیردۆزییەكان
(نموونەییەكان) ........ 81
3-3 كارلێككردووە دیاریكراوەكان و ڕێژەی
سەدی بەرهەم ........ 89
پێداچوونەوەی بەندی 3 ........ 92


بەرگی دووەم

## بەشی دووەم دۆخەكانی ماددە 96


بەندی 4

### ڕەوشە فیزیاییەكانی گاز 98

1-4 بیردۆزی گەردە جووڵەی ماددە ........ 99
خوێندنەوەیەكی زانستی: یەكۆكسیدی كاربۆن
بكوژە نادیارە ........ 103
2-4 پەستان ........ 104
3-4 یاساكانی گاز ........ 109
پێداچوونەوەی بەندی 4 ........ 123

بەندی 5

### گەردە پێكهاتەی گازەكان 128

1-5 گەردە پێكهاتنی گازەكان ........ 129
خوێندنەوەیەكی زانستی: هەڵكشان بۆ بۆشایی.. 134
2-5 یاسای گازی نموونەیی ........ 135
3-5 ژماركارییە كیمیاییەكانی گازەكان ........ 142
4-5 دەرپەڕین و بڵاوبوونەوە ........ 146
كردە چالاكییەكی خێرا: بڵاوبوونەوە ........ 148
پێداچوونەوەی بەندی 5 ........ 151

بەندی 6

### شلەكان و ماددە ڕەقەكان 156

1-6 شلەكان ........ 157
2-6 ماددەی ڕەق ........ 161
3-6 گۆڕانی دۆخ ........ 166
خوێندنەوەیەكی زانستی: ماددە دۆخ
گۆڕۆكەكان ........ 175
4-6 ئاو ........ 176
پێداچوونەوەی بەندی 6 ........ 179

خشتەی خولی ........ 184
پاشكۆی خشتەی نەگۆڕاوەكان (أ) ........ 186
زاراوەكان ........ 192

بەشی

1

# زمانی کیمیا

## بەندەکان

1 شێوگ و ئاوێتە کیمیاییەکان

2 هاوکێشە و کارلێکە کیمیاییەکان

3 ژمارکارییە کیمیاییەکان



## جوزێف گریفن دەڵێت:

**بەتەنیا گوێ لە بەشەوانەگرتن و کتێب خوێندنەوە، دادی فێرخوازی کیمیا نادەن، چونکە ئەم ماددەیە تەنیا لە ڕێی کارپێکردنە کردەییەکانەوە دەخوێندرێن. بەوردی جێبەجێکردنی یەك تاقیکردنەوە، لە لایەن فێرخوازەوە و بەدرێژی تێگەیشتنی، زانیاریی لە تەواوی کتێبێك زۆرتر دەداتێ، کەوابێ خوێنەری بەڕێز، چی لەوە زۆرتر هانت دەدات کە تاقیکردنەوە جێبەجێ بکەیت؟**

(لە مێژووی کیمیایی ئۆرتۆن) دوە.



بەندی 1

# شێوگ و ئاوێتە کیمیاییەکان



کیمیاگەران، ناو و شێوگ بەکاردەهێنن بۆ باسکردنی پێکهاتنی گەردیلەیی ئاوێتەکان

کەرتی 1-1

# ناو و شێوگە کیمیاییەکان

## ئاماژەکانی جێبەجێکردن

- گرنگی شێوگی کیمیایی ڕوون دەکاتەوە.
- شێوگی ئاوێتەیەکی ئایۆنی کە لە دوو ئایۆن پێکهاتبێ دیاری دەکات.
- پێی دەڵێن ئاوێتەی ئایۆنی لە شێوگە کیمیاییەکەیەوە.
- پێشگر بەکاردێت بۆ ناوانی گەردە ئاوێتەییەکی دووانی لە شێوگەکەیەوە.
- شێوگی گەردە ئاوێتەیەکی دوانی (دوو توخمە)، لە ناوەکەیەوە دەنوسرێت.

تێکرای ژمارە ئاوێتە کیمیاییەکان، سروشتی و دەستکرد، لە ملیۆنەها تێ دەپەڕن، هەندێك لەو مادانە ناوی باویان هەیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، بۆ نموونە: کاربۆناتی کالیسیۆم ناسراوە بە بەردی قسلَ یان بەردی کلس و، کلۆریدی سۆدیۆم ناسراوە بە خوێی خۆراك، کەچی ئۆکسیدێکی دوانە هایدرۆجین هەرپێی دەڵێن ئاو و هیچی تر.لەم بەندەدا، فێری هەندێ لەو ڕێسایانە دەبین، کە بۆناوانی ئاوێتە کیمیاییە سادەکان بەکاردێن.

## گرنگی شێوگی کیمیایی

شێوگی کیمیایی، ڕێژەیی ژمارەی هەموو ئەو جۆرە گەردیلانە پێشان دەدات، کە لە ئاوێتەیەکی کیمیاییدا هەیە، لەگەردە ئاوێتەیەکی هاوبەشدا، شێوگ، ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمە پێشان دەدات، کە لە گەردێکی ئاوێتەداهەن، وەك لەو شێوگەی خوارەوەی گەردی ئۆکتاندا دەیبینین، کە ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنییە(لە هایدرۆجین و کاربۆن پێك دێت):

$C_8H_{18}$

| ڕەنووسەکەی خوارەوە، پێشانی دەدات کە لە گەردی ئۆکتاندا، 18 گەردیلە هایدرۆجین هەیە | ڕەنووسەکەی خوارەوە، پێشانی دەدات کە لە گەردی ئۆکتاندا 8 گەردیلە کاربۆن هەیە. |
|---|---|

ئاوێتە ئایۆنییەکان، بە پێچەوانەی ئاوێتە گەردییەکانەوە، لە تۆرە ئایۆنێکی موجەب و سالیب پێك دێن، کە توند پێکەوە بەستراون بەهۆی یەکتر ڕاکێشانەوە، هەروەك شێوگی کیمیایی ئاوێتەی ئایۆنی لە شێوگی یەك گەردەوە دیار دەبێت، واتە سادەترین ڕێژەی ئایۆنە موجەبەکان (کاتایۆن) و ئایۆنە سالیبەکان (ئانایۆن) لە ئاوێتەکەدا بەو پێیە شێوگی کیمیایی ئاوێتەی ئایۆنی گۆگرداتی ئەلەمنیۆم، لە کاتایۆنی ئەلەمنیۆم و ئانایۆنی فرە گەردیلەی گۆگردات پێك دێت و بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسرێت:

$Al_2(SO_4)_3$

ڕەنووسی 3 پێشانی دەدات کە نێوانی دوو کەوانەکە 3 ئایۆنی گۆگردات دەدات کە تێکرا 3 گەردیلە گۆگرد و 12 گەردیلە ئۆکسجینە.

ڕەنووسە 4 ەکەی خوارەوە پێشانی دەدات کە 4 گەدیلە ئۆکسجین لە ئایۆنی گۆگرداتدا هەیە.

ڕەنووسە 2 ەکەی ژێرەوە ئەوە پێشان دەدات کە دوو گەردیلە ئەلومنیۆم هەیە.

دەبێت وریای ئەوەبین کە چۆن دوو کەوانەکە بەکاردێنین، کە نیشانەی ئەوەن ئایۆنی فرە گەردیلە خۆی بەشێکە و ڕەنووسەکەی خوارەوە 3 ، بەشەکە بە هەموو پێکهێنەکانییەوە پێشان دەدات، سەرنج بدە ڕەنووسی خوارەوە لە تەنیشت هێمای گۆگردەوە نییە، هەر کاتێکیش ڕەنووسی خوارەوە لە تەنیشت هێمای توخمەوە نەبوو، بە هـای ڕەنووسەکە 1 دەبێت.

## ئایۆنە یەك گەردیلەییەکان

زۆربەی توخمەکانی کۆمەڵە سەرەکییەکان ئایۆنی وا پێك دێنن کە ڕێزبوونی ئەلیکترۆنییان وەك ڕێزبوونی ئەلیکترۆنی گازە خانەدانەکان (سستەکان) وایە، بە ونکردن یان وەرگرتنی ئەلیکترۆن، بۆ نموونە کانزاکانی کۆمەڵەی 1 ، ئەلیکترۆنێك ون دەکەن، بۆ ئەوەی ببنە کاتایۆنی بارگە 1+ ، وەك لە $Na^+$ داو، کانزاکانی کۆمەڵەی 2 دوو ئەلیکترۆن ون دەکەن بۆ پێکهێنانی کاتایۆنی بارگە 2+ ، وەك $Mg^{2+}$ ، **بەو ئایۆنانەی لە یەك گەردیلە پێك دێن دەڵێن ئایۆنە یەك گەردیلەییەکان monatomic ions** و ناکانزاکان کۆمەڵەکانی 15 ، 16 ، 17 ئەلکترۆنەکان وەردەگرن و ئانایۆن پێك دێنن، بۆ نموونە نایترۆجین لە ئاوێتەکاندا، ئانایۆنی بارگە 3– ، $N^{3-}$ پێك دێنن، چونکە ئەو سێ ئەلیکترۆنەی دەچنە سەر ئەو پێنج ئەلیکترۆنەی کە لە ئاستی دەرەکی گەردیلەکانی نیترۆجیندا هەن، ئاستێکی دەرەکی پڕی هەشت ئەلیکترۆنی پێك دێنن، هەروەها دوو توخمەکەی کۆمەڵەی 16 ، ئۆکسجین و گۆگرد ، ئانایۆنی بارگە 2– پێك دێنن و هالۆجینەکانی کۆمەڵەی 17 یش، ئانایۆنی بارگە 1– پێك دێنن.

هەموو توخمەکانی کۆمەڵە سەرەکییەکان، بەئاسانی ئایۆن پێك ناهێنن ، لە جیاتی ئەوەی گەردیلەکانی کاربۆن و سیلیکۆن ئەلیکترۆن وەربگرن یان ون بکەن، هاوبەشەبەند لەگەڵ گەردیلەی تر پێك دێنن و، بەشداریيان لەگەڵدادەکەن، بە ئەلیکترۆنەکان بۆ پێکهێنانیان. توخمی تریش هەیە، ئارەزووی ئایۆن پێکهێنان دەکەن کە ڕێزبوونی ئەلیکترۆنی گازی خانەدانیان نییە، بۆ نموونە، کانزاکانی کۆمەڵەی 14 (وەك تەنەکە و قورقوشم) گرانە چوار ئەلیکترۆن ون بکەن بۆ ئەوەی ڕیزبوونی گازی خانەدان پەیدا بکەن، بەڵام ئارەزوو دەکەن کە دوو ئەلیکترۆن لە خولگە دەرەکییەکانی *p* ون بکەن و دوو ئەلیکترۆنەکەی خولگەی *s* بپارێزن و کاتایۆنی 2+ پێك بهێنن.

### ناونانی ئایۆنە یەك گەردیلەییەکان

بەزۆری کاتایۆنە یەك گەردیلەییەکان، بە ناوی توخمەکانیانەوە دەناسرێن وەك دوو نموونەی لای ڕاست، بەڵام

**ناونانی ئانایۆنەکان**

$K^+$

**کاتایۆنی پۆتاسیوم**

$Mg^{2+}$

**کاتایۆنی مەگنیسیۆم**

ئانایۆنە یەك گەردیلەییەكان بەمجۆرە ناودەنرێن:برگەی – ید ( -ide ) دەخرێتە سەر كۆتایی ناوی توخمەكە و هەندێ جار كۆتایی ناوی توخمەكە لادەبرێت و برگەی ( – ید ) دەخرێتە سەرڕەگی ناوەكە، وەك لەم دوو نموونەیەدا دەردەكەوێت: خشتەی 1-1 ناو و هێمای كاتایۆنی و ئانایۆنە یەك گەردیلەییەكان ڕوون دەكاتەوە كە بەپێی بارگەكانیان ڕێزكراون، خشتەكە ناوی چەند ئایۆنێك دەگرێتەوە كە ڕەنووسی ڕۆمانییان تێدایە و، بە شێكە لە سیستەمی ستۆك (Stock system) بۆ ناوانی ئایۆن و توخمە كیمیاییەكان، دواتر لەم بەندەدا، درێژتر، سیستەمی ستۆك و هی تریشتان چاوپێ دەكەوێت كە بۆ ناوانی ئاوێتە كیمیاییەكان بەكاردێت.

**ناوانی ئانایۆنەكان**

| | |
|---|---|
| F | $F^-$ |
| فلۆر | ئانایۆنی فلۆرید |
| N | $N^{3-}$ |
| نیترۆجین | ئانایۆنی نیترید |

**خشتە 1-1 هەندێ ئایۆنی یەك گەردیلەیی**

**توخمە سەرەكییەكان**

| 1+ | 2+ | 3+ | |
|---|---|---|---|
| لیثیۆم $Li^+$ | | | |
| سۆدیۆم $Na^+$ | مەگنیسیۆم $Mg^{2+}$ | ئەلەمنیۆم $Al^{3+}$ | |
| پۆتاسیۆم $K^+$ | كالیسیۆم $Ca^{2+}$ | | |
| ڕۆبیدیۆم $Rb^+$ | سترۆنیۆم $Sr^{2+}$ | | |
| سیزیۆم $Cs^+$ | باریۆم $Ba^{2+}$ | | |
| **1–** | **2–** | **3–** | |
| فلۆرید $F^-$ | | | |
| كلۆرید $Cl^-$ | ئۆكسید $O^{2-}$ | نیترید $N^{3-}$ | |
| برۆمید $Br^-$ | گۆگردید $S^{2-}$ | | |
| یۆدید $I^-$ | | | |

**توخمەكانی خشتۆكەی *d*-**

| 1+ | 2+ | 3+ | 4+ |
|---|---|---|---|
| مس (I) $Cu^+$ | كادمیۆم $Cd^{2+}$ | كرۆم(III) $Cr^{3+}$ | ڤەنادیۆم (IV) $V^{4+}$ |
| زیو $Ag^+$ | كرۆم (II) $Cr^{2+}$ | ئاسن (III) $Fe^{3+}$ | |
| | كۆباڵت (II) $Co^{2+}$ | ڤەنادیۆم (III) $V^{3+}$ | |
| | مس (II) $Cu^{2+}$ | | |
| | ئاسن (II) $Fe^{2+}$ | | |
| | مەنگەنیز (II) $Mn^{2+}$ | | |
| | جیوە (II) $Hg^{2+}$ | | |
| | نیكڵ (II) $Ni^{2+}$ | | |
| | ڤەنادیۆم (II) $V^{2+}$ | | |
| | زینك $Zn^{2+}$ | | |

# ئاوێتە ئایۆنییە دوانییەکان

**بەو ئاوێتانەی لە دوو توخمی جیاواز پێك دێن دەڵێن ئاوێتە دوانییەکان binary compounds** ، لەم ئاوێتەیەدا، بارستە ژمارەی بارگە موجەبەکان لەگەڵ بارگە سالیبەکان یەکسان دەبێت، بۆ نموونە، مەگنیسیۆم لەگەڵ برۆم یەك دەگرن بۆ پێکهێنانی ئاوێتەی ئایۆنی برۆمیدی مەگنیسیۆم، مەگنیسیۆم، کە یەکێکە لە کانزاکانی کۆمەڵەی 2 ، کاتایۆنی $Mg^{2+}$ ،دەبینیت +2 لە $Mg^{2+}$ دا وەك سەرە ڕەنووس دەنووسرێت و برۆم کە هالۆجینە، ئانایۆنی $Br^{-}$ پێك دێنێت کە لەگەڵ کانزایەك یەك دەگرێت و لە هەر شێوگی دانەیەك برۆمیدی مەگنیسیۆمدا، پێویستە دوو ئانایۆنی برۆمید $Br^{-}$ هەبێت بۆ هاوسەنگکردنی بارگەی +2 ی کاتایۆنی مەگنیسیۆمەکە $Mg^{2+}$ ، بۆیە پێویستە لە شێوگی ئاوێتەکەدا، کاتایۆنێکی $Mg^{2+}$ و دووئانایۆنی $Br^{-}$ دەربکەوێت و هێمای کاتایۆنی لە پێشەوە دەنووسرێت، ئایۆنە یەکگرتووەکان: $Mg^{2+}$ ، $Br^{-}$ ، $Br^{-}$ ن و شێوگی کیمیایی ئاوێتەکە $MgBr_2$ ە ، دەبینیت 2 ی $Br_2$ ، وەك ژێرە ڕەنووسێك دەنووسرێت و بارگەی ئایۆنەکان کە لە شێوگەکە دا نانووسرێت لە هەموو نووسینێکی شێوگی ئاوێتەی ئایۆنییە دووانییەکاندا.

بۆ یاریدەدانی دیاریکردنی ژێرە ڕەنووس لە شێوگی ئاوێتە ئایۆنییەکاندا، دەتوانرێت بارگە موجەب و سالیبەکان ئالوگۆڕ بکرێن و ئەم کردەی ئالوگۆڕە، ڕێگەیەکە بۆ هاوسەنگکردنی نێوان ئایۆنەکان لە ئاوێتە ئایۆنییەکاندا، بۆ نموونە: شێوگی ئەو ئاوێتەیەی لە ئایۆنی ئەلەمنیۆم و ئایۆنی ئۆکسید پێك دێت بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری دەکرێت:

**1.** هێمای ئایۆنەکان لە تەنیشت یەکترەوە بنووسە و لە پێشدا کاتایۆنەکە بنووسە (لە چەپەوە دەست پێ بکە ).

$$Al^{3+}\ O^{2-}$$

**2.** بارگەکان لە نێوان ئایۆنەکاندا ئالوگۆڕ بکە، بەبەکارهێنانی بەهاپەتییەکانی بارگەی هەر ئایۆنێك وەك ژێرە ڕەنووسی ئایۆنەکەی تریان بەکاربهێنە:

$$Al_2^{+3}\ O_3^{-2}$$

**3.** سەرەنجی ژێر ڕەنووسەکان بدە و دابەشی بکە بەسەر گەورەترین کۆلکە هاوبەشدا بۆ دەستکەوتنی بچووکترین ڕێژە، کە بتوانرێ وەك ڕەنووسی تەواوی ئایۆنەکان بەکاربهێنرێت، ئەوسا دوای ئەوە شێوگەکە بنووسە.

دوای لێکدانی بارگە و ژێرە ڕەنووس، دەردەکەوێت کە ئەو بارگەیەی دوو کاتایۆنی $Al^{3+}$ ی تێدایە ($2 \times 3+ = 6+$) یەکسانەبەو بارگەیەی کەسێ ئانایۆنی $O^{2-}$ هەیانە ($3 \times 2- = 6-$) و گەورەترین کۆلکە هاوبەشی ژێر ڕەنووسەکان 1 ە، بەو پێیە شێوگە ڕاستەکە وەك خوارەوە دەنوسرێت: $Al_2\ O_3$

# ناونانی ئاوێتە ئایۆنییە دووانییەکان

**ناونانی nomenclature** ئاوێتە ئایۆنییە دوانییەکان، پشت بە کۆکردنەوەی ناوی ئایۆنە موجەب و سالیبەکانی ئاوێتەکە دەبەستێ، لە پێشدا ناوی ئانایۆنەکە

دەنووسرێت (لە ڕاستەوە) و، دوای ئەویش ناوی کاتایۆن و لە زۆربەی ئاویتە ئایۆنییە سادەکاندا ڕێژەی ئایۆنەکان لە ناوی ئاوێتەکەدا دەرناکەوێت، چونکە بە هۆی ڕێژە بارگەی ئایۆنەکانی ئاوێتەکەوە زانراوە و دا لە خوارەوە چونێتی ناونانی ئاوێتەیەکی ئایۆنی دەخەینەپێش چاو:

$Al_2O_3$

ناوی کاتایۆن — ناوی ئانایۆن

ئەلەمنیۆم — ئۆکسید

کەواتە ناوەکە ئوکسیدی ئەلەمنیۆم دەبێت.

**پرسی نموونەیی 1-1**

**شێوگی ئەو ئاوێتە ئایۆنییە دووانییانە بنووسە کە لە نێوان ئەم توخمانەدا پێك دێن:**

**أ زینك و یۆد ب . زینك و گۆگرد**

**شیکاری**

هێمای ئایۆنەکان لەتەنیشت یەکەوە بنووسە، لە پێشدا ناوی کاتایۆنەکە بنووسە (لەچەپەوە دەست پیّ بکە).

أ $Zn^{2+}\ I^{-}$

ب $Zn^{2+}\ S^{-2}$

بەهای پەتی بارگەکان ئاڵوگۆڕبکە، بۆ دیاری کردنی ژێرە ڕەنووس.

أ $Zn_1^{+2}\ I_2^{-}$

ب $Zn_2^{+2}\ S_2^{2-}$

لە ژێرەڕەنووسەکان وردببەرەوە و دابەشیان بکە بەسەر گەورەترین کۆڵکە هاوبەشدا، بۆ زانینی بچووکترین ڕێژەی ڕەنووسی تەواوی ئایۆنەکان، دواتر شێوگەکە بنووسە.

أ ژێرە ڕەنووسەکان، لە ڕووی ژمارەکارییەوە تەواون، چونکە بارگەی گشتی یەکسان دەدەن: $1 \times 2+ = 2+$ و $2 \times 1- = 2-$ گەورەترین کۆڵکەی هاوبەشی ژێر ڕەنووسەکان دەکاتە 1 .بچوکترین ڕێژەی ڕەنووسی تەواوی ئایۆنەکان لە ئاویتەکەدا 1:2 ە ژێرە ڕەنووسی 1 لە شێوگەکەدا نانووسرێت، بۆیە شێوگەکە $ZnI_2$ دەبێت.

ب ژێرڕەنووسەکان، لە ڕووی ژمارەکارییەوە تەواون، چونکە بارگەی گشتی یەکسان دەدەن: $2 \times 2+ = 4+$ و $2 \times 2- = 4-$ گەورەترین کۆڵکە هاوبەشی ژێرە ڕەنووسەکان دەکاتە 1 .بچووکترین ڕێژەی ڕەنووسی تەواوی ئایۆنەکان لە ئاوێتەکەدا 1:1 ە.

کەواتە شێوگە ڕاستەکە $ZnS$ دەبێت.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** شێوگی ئەو ئاویتە ئایۆنییە دووانییانە بنووسە، کە لەم توخمانەی خوارەوە پێك دێن:

أ. پۆتاسیۆم و یۆد — د. ئەلەمنیۆم وگۆگرد

ب. مەگنیسیۆم و کلۆر — هـ. ئەلەمنیۆم و نیترۆجین

ج . سۆدیۆم و گۆگرد

**2.** ئەم ئاویتە ئایۆنییە دووانییانە، لە شێوگەکانیانەوە ناوبنیّ:

أ. $AgCl$ — ج. $BaO$

ب. $SrF_2$ — د. $CaCl_2$

وەڵامەکان:

**1.** أ. $KI$ — د. $Al_2S_3$

ب. $MgCl_2$ — هـ. $AlN$

ج. $Na_2S$

**2.** أ.کلۆریدی زیو

ب.فلۆریدی سترۆنتیۆم

ج.ئۆکسیدی باریۆم

د.کلۆریدی کالیسیۆم

## سیستەمی ناونانی، ستۆك

هەندێ توخم، وەك ئاسن، دوو جۆر یان زۆرتر کاتایۆنی بارگە جیاواز پێك دێنن، بۆ جیاکردنەوەی ئەو ئایۆنە موجەبانەی ئەو توخمانە پێکی دێنن، سیستمی ناونانی ستۆك بەکاردەهێنرێت، چونکە ڕەنووسی ڕۆمانی بەکاردێت بۆ دیاریکردنی بارگەی کاتایۆن، ڕەنووسەکە، دەخرێتە نێوان دوو کەوانەوە ڕاستەوخۆ دوای ناوی کانزاکە دادەنرێت.

| $Fe^{3+}$ | $Fe^{2+}$ |
|---|---|
| ئاسن (III) | ئاسن (II) |

ناوی ئەو کانزایانە تەنیا یەك کاتایۆن پێك دێنن ڕەنووسی ڕۆمانیان ناوێت.

| $Al^{3+}$ | $Ba^{2+}$ | $Na^{+}$ |
|---|---|---|
| ئەلەمنیۆم | باریۆم | سۆدیۆم |

هەروەك بە زۆری هیچ توخمێك نییە لە ئایۆنێکی یەك گەردیلەیی زۆرتر پێك بهێنێت.
دەتوانرێت، ناونانی ئاوێتەیەکی ئایۆنی دووانی بە پێی سیستمی ستۆك، بەم شێوەی خوارەوە ڕوون بکرێتەوە.




بەوپێیە، ناوەکە دەبێتە: کلۆریدی مس (II)




**شێوە 1-1** کاتایۆنە جیاوازەکانی هەمان کانزا، ئاوێتەی جیاواز پێك دێنن، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ هەمان ئانایۆنیش یەك بگرن، ئەمانە بەراوردبکە:( أ ) ئۆکسیدی قورقوشم (IV) ($PbO_2$) و ئۆکسیدی قورقوشم (II)($PbO$).

پرسی نموونەیی 2-1

**شێوگ و ناوی ئەو ئاوێتەیە بنووسە کە لە دوو ئایۆنی $Cr^{3+}$ و $F^-$ پێك دێت:**

**شیکاری**

هێمای دوو ئایۆنەکە کە لە تەنیشت یەکترەوە بنووسە، لە پێشدا هێمای کاتایۆن لە چەپەوە بنووسە.

$Cr^{3+}\ F^-$

بەهای پەتی بارگەکان ئاڵوگۆڕ بکە، بۆ دیاری کردنی ژێرە ڕەنووسەکان:

$Cr_1^{+3}\ F_3^-$

ژێرە ڕەنووسەکان وردکاری بکە و شێوگ بنووسە ژێرە ڕەنووسەکان تەواون لە ڕووی ژمارکارییەوە، چونکە بارگەی $+3 = +3 \times 1$ و $-3 = -1 \times 3$ و گەورەترین کۆلکەی هاوبەشی ژێر ڕەنووسەکان 1 ە ، لەبەر ئەوە بچووکترین ڕێژە، وەك ژمارەیەکی تەواوی ئایۆنەکان، 1:3 ە، کەواتە شێوگەکە $CrF_3$ یەو، وەك دەردەکەوێت لە خشتەی 1-1 دا ، کرۆم لە ئایۆنێك زۆرتر پێك دێنێت $+3$ پێویستە ڕەنووسێکی ڕۆمانی بەدوادا بێت، بۆ دیاری کردنی بارگەی، بۆیە ناوی ئاوێتەکە دەبێت بە فلۆریدی کرۆم (III).

**ڕاهێنانی کارپێکەریەکان**

**1.** شێوگ و ناوی ئەو ئاوێتانە بنووسە کەلەم ئایۆنەی خوارەوە پێك دێن:

أ . $Cu^{2+}$ و $Br^-$

ب. $Fe^{2+}$ و $O^{2-}$

ج. $Fe^{3+}$ و $O^{2-}$

**2.** ناوی ئەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە:

أ . $CuO$

ب. $CoF_3$

**وەڵامەکان:**

**1.** أ. $CuBr_2$ برۆمیدی مس (II)

ب. $FeO$ ئۆکسیدی ئاسن (II)

ج. $Fe_2O_3$ ئۆکسیدی ئاسن (III)

**2.** أ.ئۆکسیدی مس (II)

ب.فلۆریدی کۆباڵت (III)

## ئەو ئاوێتانەی ئایۆنی فرە گەردیلەیان تێدایە

سەرەنجی خشتەی 2-1 بدە کە هەندێ ئایۆنی فرە گەردیلەی ناسراویان تێدایە، هەمووئەم ئایۆنانە، جگە لە ئایۆنی ئەمۆنیۆم، بارگە سالیبن و **زۆربەیان ئانایۆنی ئۆکسجین oxyanions** ، واتە **ئایۆنی فرە گەردیلەن کە ئۆکسجینیان تێدایە** و، لە زۆربباردا، دوو ئانایۆنی ئۆکسجێنراون لە هەمان دووتوخم، بۆ نموونە، نیترۆجین و ئۆکسجین، لە هەریەکەی دوو ئایۆنی ئۆکسجێنراوی $NO_3^-$ و $NO_2^-$ دا، یەك دەگرن و لە کاتی ناونانی ئەو ئاوێتانەدا کە ئەم جۆرە ئایۆنانەیان تێدایە، ئانایۆنە زۆرتر باوە کە یان، پاشگری – ات (-ate) ی دەدرێتێ بەڵام ئانایۆنە ئۆکسجین کەمترەکان بە برگەی (– یت ) (-ite) کۆتاییان دێت.

| $NO_2^-$ | $NO_3^-$ |
|---|---|
| نیتریت | نیترات |

هەندێ جار، دووتوخم، چەند ئانایۆنێکی ئۆکسجینی جیاواز کە لە دووان زۆرترن پێك دێنن، لەم بارەدا، ئانایۆنە ئۆکسجین کەمترەکە لە هی ئەو ئانایۆنەی بە – یت کۆتایی دێت، پێشگری هایپۆ- hypo ی دەدرێتێ ئانایۆنە گەردیلەی ئۆکسجین زۆرترەکان لەوەی بە – ات کۆتایی دێت، پێشگری پێر – per ی دەدرێتێ و ئەم ناونانە لەو چوار ئانایۆنەی ئۆکسجینراوەکە لە کلۆر و ئۆکسجین پێکهاتووە، دیاردەکەوێت:

| $ClO^-$ | $ClO_2^-$ | $ClO_3^-$ | $ClO_4^-$ |
|---|---|---|---|
| ژێر کلۆریت یان (هایپۆکلۆریت) | کلۆریت | کلۆرات | ژوور کلۆرات یان (پێرکلۆرات) |

ئەو ئاوێتانەی ئایۆنی فرەگەردیلەیان تێدایە، بەوڕێگایە ناودەنرێن کە ئاوێتە ئایۆنیە دووانییەکانی پێ ناودەنرێت، لە پێشدا ناوی ئانایۆنەکە دەوترێت و ناوی کاتایۆنەکەی بەدوادا دێت، بۆ نموونە، ئەو دوو ئاوێتەیەی زیو لەگەڵ ئانایۆنی نیترات پێکی دێنێت، بەرودوا: نیتراتی زیو $AgNO_3$ و، نیتریتی زیو $AgNO_2$. ئەگەر ئاوێتەیەك، ئایۆنێکی فرەگەردیلە زۆرتری تێدابوو، شێوگی ئایۆنەکەی بەتەواوی دەخریتە ناو دوو کەوانە وەك لەباری گۆگرداتی ئەلومنیۆمەکەدا $Al_2(SO_4)_3$ ، کە شێوگەکە ئەوە نیشان دەدات کە دانەیەك شێوگی گۆگرداتی ئەلەمنیۆم، دوو کاتایۆنی ئەلومنیۆم و سێ ئانایۆنی گۆگرداتی تێدایە.

**خشتە 2-1** هەندێ ئایۆنی فرەگەردیلە

| 1+ | | 2+ | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەمۆنیۆم | $NH_4^+$ | دوانەجیوە | $^*Hg_2^{2+}$ | | |
| **1–** | | **2–** | | **3–** | |
| سرکات | $CH_3COO^-$ | کاربۆنات | $CO_3^{2-}$ | فۆسفات | $PO_4^{3-}$ |
| برۆمات | $BrO_3^-$ | کرۆمات | $CrO_4^{2-}$ | زەرنیخات (ئارسینات) | $AsO_4^{3-}$ |
| کلۆرات | $ClO_3^-$ | دوانە کرۆمات | $Cr_2O_7^{-2}$ | | |
| کلۆریت | $ClO_2^-$ | فۆسفاتی هایدرۆجینی | $HPO_4^{2-}$ | | |
| سیانید | $CN^-$ | ئۆکزالات | $C_2O_4^{2-}$ | | |
| فۆسفاتی دوانەهایدرۆجین | $H_2PO_4^-$ | ژوورۆکسید | $O_2^{2-}$ | | |
| کاربۆناتی هایدرۆجینی (بیکاربۆنات) | $HCO_3^-$ | گۆگردات | $SO_4^{2-}$ | | |
| گۆگرداتی هایدرۆجینی | $HSO_4^-$ | گۆگردیت | $SO_3^{2-}$ | | |
| هایدرۆکسید | $OH^-$ | | | | |
| ژێر (هایپۆکلۆریت) | $ClO^-$ | | | | |
| نیترات | $NO_3^-$ | | | | |
| نیتریت | $NO_2^-$ | | | | |
| ژوور کلۆرات | $ClO_4^-$ | | | | |
| ژوور مەنگەنات | $MnO_4^-$ | | | | |

* کاتایۆنی جیوە (I) ، بە شێوەی دوو ئایۆنی $Hg^+$ هەیە، کە بە هاوبەشە بەندێك پێکەوە لکاون و بەمجۆرە $Hg_2^{+2}$ دەنووسرێت.

پرسی نموونەیی 3-1

**شێوگی گۆگرداتی ڤانادیۆم (IV) بنووسە.**

**شیکاری**

هێمای دوو ئایۆنەکە، بە تەنیشت یەکەوە بنووسە، لە پێشدا هێمای کاتایۆن لە چەپەوە بۆ ڕاست بنووسە.

$$V^{4+}\ SO_4^{2-}$$

لە نێوان دوو ئایۆنەکەدا، بە هاپەتییەکانی بارگەکان ئاڵوگۆڕبکە، بۆ ئەوەی ژێرە ڕەنووسەکانت دەست بکەوێت، ئایۆنە فرە گەردیلەکان بخەرە نێوان دوو کەوانە، ئەگەر پێویستی کرد.

$$V_2^{4+}(SO_4)_4^{2-}$$

سەیری ژێرە ڕەنووسەکان بکە و شێوگەکە بنووسە.

تێکڕای بارگە موجەبەکان دەکاتە: $+8 = +4 \times 2$ و تێکڕای بارگە سالیبەکان دەکاتە: $-8 = -2 \times 4$ ، بارگەکان یەکسانن و، گەورەترین کۆلکی هاوبەش لە ژێرە ڕەنووسەکاندا دەکاتە 2 ، لەبەر ئەوە بچووکترین ڕێژە وەك ژمارەیەکی تەواوی ئایۆنەکان لە ئاوێتەکەدا دەکاتە 1:2،کەواتە شێوگەکە بەم جۆرە دەبێت: $V(SO_4)_2$

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** شێوگی ئەو ئاوێتە ئایۆنییە دووانییانە بنووسە، کەلەم توخمانەی خوارەوە پێك دێن:

أ . کلۆریدی کالیسیۆم          د . نتریتی کالیسیۆم

ب . گۆگردیدی پۆتاسیۆم          هـ . پێر کلۆراتی پۆتاسیۆم

ج . گۆگرداتی مس (II)

**2.** ئەم ئاوێتانەی خوارەوە ناوبنێ:

أ . $Ag_2O$          ج . $FeCrO_4$

ب . $KClO_3$          د . $KClO$

**وەڵامەکان:**

**1.** أ. $CaCl_2$          د. $Ca(NO_2)_2$

ب. $K_2S$          هـ. $KClO_4$

ج. $CuSO_4$

**2.** أ. ئۆکسیدی زیو

ب. کلۆراتی پۆتاسیۆم

ج. کرۆماتی ئاسن (II)

د. هایپۆ ( ژێر) کلۆریتی پۆتاسیۆم.

## ناونانی ئاوێتە گەردییە دوانییەکان

ئاوێتە گەردییەکان، لەگەردیان یەکەی تاکی هاوبەشی پێکەوە بەستراوە پێك دێن، کیمیاگەران دوو شێواز(سیستمی) ناونان بەکاردەهێنن بۆ ناونانی گەردە دوانییەکان، بە شێوازە نوێترەکە دەڵێن شێوازی ناونانی ئاوێتەگەردییەکانی ستۆك، کە پێویست دەکات ئۆکسانە ژمارەکان بزانرێن، کە لە کەرتی 2-1 دا گفت و گۆی لەسەردەکرێت.
بەڵام شێوازی کۆنی ناونانی ئاوێتە گەردییەکان کە پشت بە پێشگری دیاری کراو دەبەستێت، ئاوێتەی گەردی $CCl_4$ بۆ نموونە، پێی دەڵێن چوارە کلۆریدی کاربۆن carbon tetrachloride ، پێشگری tetra- (چوارە) واتە چوار گەردیلەی کلۆر لە گەردێکی ئاوێتەکەدا هەیە وبەدوو ئۆکسیدەکەی کاربۆن CO و $CO_2$ بەرودوا دەڵێن: یەکۆکسیدی کاربۆن carbon monoxide و دوانۆکسیدی کاربۆن carbon dioxide پێشگری یەکە (mono) ، لەم ناوانەدا، واتە یەك گەردیلە ئۆکسجینی تێدایە و پێشگری دوانە (di) واتە دوو گەردیلە ئۆکسجین و... هەروەها، پێشگرەکان بۆ دیاریکردنی ژمارەی گەردیلەکان بەکاردێن، بەڵام هەندێ جار، بۆ دیاریکردنی ژمارەی کۆمەڵە گەردیلەکان لەگەردێکدا بەکاردەهینرێن، وەك لە خشتەی 1-3 دا دەیبینیت.

**خشتە 3-1 هەندێ گەردیلە**

| ژمارە | پێشگری توخمە سالیبێتی بەرزترەکان | پێشگری توخمە سالیبێتی کەمترەکان | پێشگرەلاتینییەکان |
| --- | --- | --- | --- |
| 1 | یەکەم | یەکە | mono |
| 2 | دووەم | دوانە | di |
| 3 | سێیەم | سیانە | tri |
| 4 | چوارەم | چوارە | tetra |
| 5 | پێنجەم | پێنجە | penta |
| 6 | شەشەم | شەشە | hexa |
| 7 | حەوتەم | حەوتە | hepta |
| 8 | هەشتەم | هەشتە | octa |
| 9 | نۆیەم | نۆیە | nona |
| 10 | دەیەم | دەیە | deca |

ڕێسای ناونانی ئاوێتە گەردیەدوانییەکان، بەپێی شێواز بە پێشگر ناونان، وەك خوارەوە کاری پێ دەکرێت:

**1.** لە پێشدا ناوی توخمە کارۆ سالبێتی کەمترە کە، لە چەپەوە دەنووسرێت، دوای ئەوە لای چەپیەوە پێشگرێکی گونجاوی خشتەی 3-1 دەنووسرێت، ئەگەر بەزۆرتر لەگەردیلەیەك لە گەردی ئاوێتەکەدا بەشداری بکات.

**2.** ناوی توخمی دووەمی کارۆسالیبێتی زۆرترە کە، لە ڕاستەوە دەنووسرێت، ئەویش بەکۆکردنەوەی پێشگرێکی گونجاو لەگەڵ توخمە کارۆ سالیبێتی زۆر ترەکەی خشتە 3-1 ، کە ژمارەی گەردیلەکانی ئەو توخمە پێشان بدات لەگەڵ ڕەگی ناوی توخمی دووەم و بە پاشگری – ید (ide-) کۆتایی دێت.

**3.** 0 یان a ی کۆتایی پێشگرەکە لادەبرێت، کاتێك وشەی دوای پێشگرەکە بە پیتێکی دەنگداری تر دەستی پێ کردبێت، بۆ نموونە، دەبێ بنووسرێت monoxide و pentoxide لەجیاتی ئەوەی بنووسرێت mono-oxide و penta-oxide .

ئەم نموونەیەی خوارەوە چۆنییەتی بەکارهێنانی پێشگر لە ناوناندا ڕوون دەکاتەوە.




دەیە ئۆکسیدی    چوارە فۆسفۆر

لە پێشدا توخمە کارۆ سالبێتی کەمترەکە، لای چەپەوە دەنووسرێت، دوای ئەو توخمە کارۆسالیبێتی زۆرترەکە، لای ڕاستەوە دەنووسرێت و بەشێوەیەکی گشتی، ڕیزکردنی ناکانزاکان، لە کەمترین کارۆسالیبێتییەوە دەبێت لە ناو شێوگی ئاوێتە دوو توخمییەکاندا وەك خوارەوە دەبێت:

کاربۆن، فۆسفۆر، نایترۆجین، هایدرۆجین، گۆگرد، یۆد، برۆم، کلۆر، ئۆکسجین، فلۆر

**خشتە 1-4 ئاوێتە دوو توخمییەکانی نیترۆجین و ئۆکسجین**

| شێوگی | ئاوێتە دوو توخمییەکانی نیترۆجین و ئۆکسجین |
|---|---|
| $N_2O$ | یەکۆکسیدی دوانە نیترۆجین |
| $NO$ | یەکۆکسیدی نیترۆجین |
| $NO_2$ | دوانۆکسیدی نیترۆجین |
| $N_2O_3$ | سیانۆکسیدی دوانە نیترۆجین |
| $N_2O_4$ | چوارۆکسیدی دوانە نیترۆجین |
| $N_2O_5$ | پێنجۆکسیدی دوانە نیترۆجین |

شێوازی پێشگر، لە خشتەدا، بە شێوەیەکی درێژتر ڕوون دەبێتەوە لە ناونانی شەش ئۆکسیدەکەی نیترۆجیندا.

**پرسی نموونەیی 1-4**

**أ ئاوێتەی $As_2O_5$ ناوبنێ**

**ب شێوگی دوانە فلۆریدی ئۆکسجین بنووسە.**

**شیکاری**

أ . هەر گەردێکی ئاوێتەکە، پێنج گەردیلە ئۆکسجین و دووگەردیلە زەرنیخی تێدایە، لەبە ئەوە «دوانە زەرنیخ» کۆتایی ناوەکە دەبێت. بەوەدا دەزانرێت کە پێنج گەردیلە ئۆکسجین لە گەردەکەدا هەیە، پێشگری پێنج دەخرێتە سەر وشەی «ئۆکسید»، بۆ ئەوەی ناوە تەواوەکە ببێتە: پێنجۆکسیدی دوانە زەرنیخ.

ب . یەکەم هێمای شێوگەکە، بۆ ئۆکسجین دەبێت «لەلای چەپەوە» بنووسرێت، چونکە کارۆ سالیبێتییەکەی لە هی فلۆر کەمترە پێشگری نییە، ئەمەیش واتە تەنیا یەك گەردیلە ئۆکسجینی تێدایە، بەڵام پێشگری دوانە، واتە دوو گەردیلە فلۆر لەگەردەکەدا هەیە، بەوپێیە، شێوگەکە $OF_2$ دەبێت.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** ئەم ئاوێتە گەردییە دوانییانەی خوارەوە ناوبنێ:

أ. $SO_3$

ب . $ICl_3$

ج . $PBr_5$

**2.** شێوگەی ئەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە:

أ .چوارەیۆدیدی کاربۆن

ب .سیانەکلۆریدی فسفۆر

ج .سیانۆکسیدی دوانە نیترۆجین

وەڵامەکان:

**1.** أ.سیانۆکسیدی گۆگرد
ب.سیانەکلۆریدی یۆد
ج. پێنجە برۆمیدی فۆسفۆر

**2.** أ. $CI_4$
ب. $PCl_3$
ج. $N_2O_3$

## ئاوێتە هاوبەشییە تۆڕییەکان

لەبەندی 6 ی پۆلی دەیەمدا، بۆت دەرکەوت کە هەندێ ئاوێتە هاوبەشیەکان، لەگەردی تاك پێك نایەت، بەڵکو هەر گەردیلەیەکی پەیوەستە بە گەردیلەکانی هاوسێیەوە و تۆڕێکی سێ دووریان لەگەڵ پێك دێنێت کە بە هاوبەشە بەند پێکەوە لکاون، لەم ئاویتانەدا، دانەی دیاریکراونییەو، ژێرە ڕەنووسەکانی شێوگی ئاوێتەیەکی هاوبەشی تۆری بچووکترین ڕێژەی ژمارەی تەواو گەردیلەی تێدایە. لێکچوونی ناونانی ئەم ئاوێتانە وەك ئاویتەی گەردی، ئەمانەی خوارەوە هەندێ نموونەی ئاشنان:

| $SiC$ | $SiO_2$ | $Si_3N_4$ |
|---|---|---|
| کاربیدی سیلیکۆن | دوانۆکسیدی سیلیکۆن | چوارە نیتریدی سیانە سیلیکۆن |

## ترش و خوێیەکان

ترش، جۆرێکی دیاری ئاوێتە هاوبەشییەکانە، بە درێژییەکی زۆرتر لە بەندی 3 ی پۆلی دوازدەیەمدا دەیخوێنین، زۆربەی ئەو ترشانەی لە تاقیگەدا بەکار دێن دەکرێن بە دوو بەشەوە: ترشە دوانییەکان و ترشە ئۆکسجینییەکان و ترشە دوانییەکان لە دوو توخم پێك دێن، کە هایدرۆجین یەکێکیانە و دووەمیان یەکێك لە هالۆجینەکان( فلۆر، کلۆر، برۆم و یۆد)، بەڵام ترشە ئۆکسجینییەکان، هایدرۆجین و ئۆکسجین و توخمێکی تریشی تێدایە ( کە بەزۆری ناکانزایەکە).

زۆربەی ئایۆنە فرە گەردیلەکان، لەونکردنی ئایۆنەکانی هایدرۆجین لە ترشە ئۆکسجینییەکان پێك دێن، ئەمانەی خوارەوە هەندێ نموونەن لەسەر پەیوەندی نێوان ترشە ئۆکسجینییەکان و ئانایۆنە ئۆکسجینییەکان:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ترشی گۆگردیك | $H_2SO_4$ | گۆگردات | $SO_4^{-2}$ |
| ترشی تیتریك | $HNO_3$ | نیترات | $NO_3^{-}$ |
| ترشی فۆسفۆریك | $H_3PO_4$ | فۆسفات | $PO_4^{-3}$ |

لە خشتەی 5-1 دا، هەندێ ترشی دوانی و هەندێ ترشی ئۆکسجینی باو خراوەتە پێش چاو:

**خشتە 5-1** هەندێ گەردیلە

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| $HF$ | ترشی هایدرۆفلۆریك | $HNO_2$ | ترشی نیترۆز | $HClO$ | ترشی هایپۆ کلۆرۆز |
| $HCl$ | ترشی هایدرۆکلۆریك | $HNO_3$ | ترشی نیتریك | $HClO_2$ | ترشی کلورۆز |
| $HBr$ | ترشی هایدرۆبرۆمیك | $H_2SO_3$ | ترشی گۆگردۆز | $HClO_3$ | ترشی کلۆریك |
| $HI$ | ترشی هایدرۆ یۆدیك | $H_2SO_4$ | ترشی گۆگردیك | $HClO_4$ | ترشی ژوور(پێر) کلۆریك |
| $H_3PO_4$ | ترشی فسفۆریك | $CH_3COOH$ | ترشی سرکە | $H_2CO_3$ | ترشی کاربۆنیك |

**شێوە 2-1** هەندێ ترشی باوی تاقیگە، پێویستە بە وریایی و بەپێی ڕێنماییەکان لەگەڵ ترشەکان ڕەفتاربکەین، چونکە ترشەکان دەشێت ببنە هۆی سووتاندنی پێست و لە ناوبردنی پۆشاک.



بەو ئاوێتە ئایۆنییەی لە کاتایۆن و ئانایۆن کە سەرچاوەکەی ترشە پێك دێت، دەڵێن **خوێ salt** . خوێی خۆراك NaCl ، ئانایۆنێکی تێدایە، سەرچاوەکەی ترشی هایدرۆکلۆریکە و خوێی گۆگرداتی کالیسیۆم $CaSO_4$ ، ئانایۆنێکی تێدایە، سەرچاوەکەی ترشی گۆگردیکە و هەندێ خوێ، ئانایۆنەکانیان گەردیلەیەك هایدرۆجین یان زۆرتری ترشەکەی تێدا دەمێنێت، ئەو ئانایۆنانە یان وشەی هایدرۆجینی دەخریتە دوای ناوەکەیانەوە یان پێشگری بای -bi دەخریتە پێش ناوی ئانایۆنەکەوە، باشترین نموونە لەسەر ئەو ئانایۆنە، ئەوەیە کە لە ترشی کاربۆنیکەوەدێت $H_2CO_3$ :

$HCO_3^-$
ئایۆنی کاربۆناتی هایدرۆجینی
یان ئایۆنی بیکاربۆنات

## پێداچوونەوەی کەرتی 1-1

**1.** گرنگی شێوگی کیمیایی چییە؟

**2.** شێوگی ئەو ئاوێتانە بنووسە کە لە نێوان ئەمانەدا پێکدێن:

أ. ئەلەمنیۆم و برۆم .
ب. سۆدیۆم و ئۆکسجین.
ج. $Sn^{2+}$ و $I^-$ .
د. $Fe^{3+}$ و $S^{-2}$ .
هـ. $Cu^{2+}$ و $NO_3^-$ .
و. $NH_4^+$ و $SO_4^{-2}$ .

**3.** ئەم ئاوێتانەی خوارەوە ناوبنێ بە بەکارهێنانی سیستمی ستۆك.

أ. NaI .
ب. $K_2S$ .
د. CuBr .
هـ. $FeCl_2$ .

**4.** شێوگی ئەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە.

أ. گۆگردیدی باریۆم.
ب. هایدرۆکسیدی سۆدیۆم.
ج. پەرمەنگەناتی پۆتاسیۆم.
د. گۆگرداتی ئاسن (II) .
هـ. سیانەئۆکسیدی دوانە فۆسفۆر.
و. دوانە کلۆریدی دوانە گۆگرد.
ز. ترشی کلۆریك

کەرتی 2-1

# ژمارەکانی ئۆکسان (ئۆکسانە ژمارەکان)

ئەو بارگانەی بەسەر ئەو ئایۆنانەوە هەن لە ئاوێتە ئایۆنییەکاندا، ڕیزبوونی ئەلەکترۆنی گەردیلەکانی ئەو ئاوێتەیە پیشان دەدەن. بۆ دیاریکردنی دابەشکردنی گشتی ئەلەکترۆنەکان لەنێوان گەردیلە پێکەوە بەستراوەکانی ئاوێتەیەکی گەردی، یان ئایۆنێکی فرە گەردیلەدا، **ئۆکسانە ژمارەکان oxidation numbers** ی ئەو گەردیلانە دەدۆزینەوە کە ئاوێتە یان ئایۆنەکە پێك دێنن و **پێیشی دەڵێن بارەکانی ئۆکسان oxidation states**. ئۆکسانە ژمارە بەپێچەوانەی بارگە ئایۆنییەکانەوە، واتایەکی وردی فیزیاییان نییە و لە هەندێ باردا تەنیا گریمانە ژمارەن، بەڵام لە ناونانی ئاوێتەکان و نوسینی شێوگ و هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکاندا بەسوودە.

## ئاماژەکانی جێبەجێکردن

- باسی ڕێسای بەکارهێنراوەکانی دۆزینەوەی ژمارەکانی ئۆکسان دەکات.
- ژمارەی ئۆکسانی هەموو توخمێك لە شێوگی ئاوێتەی کیمیاییدا دیاری دەکات .
- ئاوێتە گەردە دوانییەکان ناودەنێت، بەبەکارهێنانی ژمارەی ئۆکسان و سیستمی ستۆك.

## دۆزینەوەی ژمارەکانی ئۆکسان

ئەلیکترۆنە هاوبەشەکان بە هی گەردیلە کارۆسالیبێتی زۆرترەکە دادەنرێت لە هەموو بەندێکدا، ئەمە وەك ڕێسایەکی گشتی لە دۆزینەوەی ژمارەکانی ئۆکساندا، لەم ڕێنماییانەی خوارەوەدا ڕێسای دیاریکراوتر دەبینیت بۆ دۆزینەوەی ژمارەی ئۆکسان:

**1.** گەردیلەی توخمی خاوێن، ژمارەی ئۆکسانی سفری دەدرێتێ، بۆیە گەردیلەکانی سۆدیۆمی خاوێن (Na) و ئۆکسجینی خاوێن ($O_2$) و فۆسفۆری خاوێن ($P_4$) و گۆگردی خاوێن ($S_8$) ، ژمارەی ئۆکسانیان سفرە.

**2.** ژمارەی ئۆکسانی توخمە کارۆسالبێتی زۆرترەکە، لە ئاوێتەیەکی گەردی دوانیدا یەکسانە بەو بارگە سالیبەی کە هەڵی دەگرێت ئەگەر ئانایۆن بێت، بەڵام گەردیلە سالیبێتی کەمترەکە، ژمارەکەی دەکاتە ئەو بارگە موجەبەی کە گەردیلەکە هەڵی دەگرێت ئەگەر کاتایۆن بێت.

**3.** ژمارەی ئۆکسانی فلۆر، لە هەموو ئاوێتەکانیدا، دەکاتە $-1$ چونکە کارۆ سالیبێتیەکەی لە هی هەموو تووخمەکان زۆرترە.

**4.** ژمارەی ئۆکسانی ئۆکسجین دەکاتە $-2$ لە زۆربەی ئاوێتەکاندا، جگە لە ژوورۆکسیدەکان، وەك $H_2O_2$ ، کە $-1$ دەبێت.

**5.** ژمارەی ئۆکسانی هایدرۆجین لە هەموو ئاوێتەکانیدا کە توخمی کارۆسالیبێتی زۆرتری لە گەڵدابێت دەکاتە $+1$ ، بەڵام لە ئاوێتانەیدا کە لەگەڵ کانزاکان پێکی دەهێنێت (هایدرایدەکان)،دەکاتە $-1$ .

**6.** کۆی جەبری ژمارەی ئۆکسانەکانی هەموو گەردیلەکانی ئاوێتەیەکی هاوکێش دەکاتە سفر.

**7.** کۆی جەبری ژمارەی ئۆکسانەکانی هەموو گەردیلەکانی ئایۆنێکی فرە گەردیلە یەکسانە بە بارگەی ئایۆنەکە.

**8.** ڕێساکانی 1 تا 7 بەسەر ئەو گەردیلانە کاری پێ دەکرێت کە هاوبەشییانە پێکەوە بەندن، لەگەڵ ئەوەیشدا دەتوانرێت ژمارەی ئۆکسان لەگەردیلەی ئاوێتە.

ئایۆنییەکانیشدا دیاری بکرێت، ئایۆنە یەکییەکان ژمارەی ئۆکسانەکانیان دەکاتە بارگەکەی، بۆ نموونە ژمارەی ئۆکسانی ئایۆنەکانی $Cl^{-}$، $Ca^{2+}$، $Na^{+}$ بەرەودوا دەکاتە: $+1$، $+2$، $-1$ .

لەبەرئەوەی کۆی ژمارەی ئۆکسانی گەردیلەکانی ئاوێتەیەك پێویستە ملکەچی ڕێسای 6 یان 7 ی ڕێنماییەکانی پێشوبن، ئەوا دەتوانرێت ژمارەی ئۆکسانەکانیان بدۆزرێتەوە ئەگەر نەزانراوبن، وەك لەپرسی نموونەیی 5-1 دا دەبینین.

**پرسی نموونەیی 5-1**

**ژمارەی ئۆکسانی هەرگەردیلەیەك لەم ئاوێتانەی خوارەوەدا بدۆزەرەوە:**

أ $UF_6$

ب $H_2SO_4$

ج $ClO_3^-$

**شیکاری**

أ .ژمارەی ئۆکسانە زانراوەکان لەسەر توخمە لەگەڵدا گونجاوەکان بنووسە، لە ڕێنماییەکانەوە دەبینیت کە فلۆر هەمیشە ژمارەی ئۆکسانەکەی دەکاتە $-1$ .

$$\overset{-1}{UF_6}$$

ژمارەی ئۆکسانە زانراوەکە، لەگەڵ ژمارەی گەردیلە گونجاوەکە لێك بدە و کۆیەکەیان، لە ژێر توخمەکەدا بنووسە، 6 گەردیلە فلۆر هەیە، واتە: $6 \times -1 = -6$

$$\underset{-6}{\overset{-1}{UF_6}}$$

ئاوێتەی $FU_6$ ، گەردییە و بەپێی ڕێنماییەکان، پێویستە کۆی ژمارەی ئۆکسانەکان بکاتە سفر. لەبەر ئەوە کۆی ژمارەی ئۆکسانە موجەبەکان دەکاتە $+6$ .

$$\overset{-1}{UF_6}$$
$$+6 \quad -6$$

کۆی ژمارەی ئۆکسانە دۆزراوەکە، دابەش بکە بەسەر ژمارەی گەردیلە گونجاوەکەدا، کە یەك گەردیلە یۆرانیۆمە لەگەردەکەدا، بۆیە دەبێت ژمارەی ئۆکسانەکەی $+6$ بێت .

$$+6 \quad -1$$
$$UF_6$$
$$+6 \quad -6$$

ب .ژمارەی ئۆکسانی هایدرۆجین دەکاتە $+1$ و ئۆکسجین لە ئاویتە ئاساییەکانیدا وەك $H_2SO_4$ ، ژمارەی ئۆکسانەکەیان دەکاتە $-2$ ، ژمارەی ئۆکسانە زانراوەکان، لەسەر توخمە لەگەڵدا گونجاوەکەدابنێ، ئەوسا ژمارەی ئۆکسانەکان لەگەڵ ژمارەی گەردیلە گونجاوەکان لێك بدە و کۆیەکە لە ژێریدادابنێ:

$$+1 \quad -2$$
$$H_2SO_4$$
$$+2 \quad -8$$

دەبێت کۆی ژمارەی ئۆکسانەکان، بکاتە سفر لەبەر ئەوەی یەك گەردیلە گۆگرد لە گەردی $H_2SO_4$ داهەیە، پێویستە گەردیلەی گۆگرد ژمارەی ئۆکسانەکەی +6 بێت.

ج .بۆ دۆزینەوەی ژمارەی ئۆکسانی توخمەکان لە گەردی $ClO_3^-$ دا ، وەك أ و ب دەست پێ بکە و لەبیرت نەچێت کە کۆی ژمارەی ئۆکسانەکان، پێویستە بکاتە تێکرای بارگەی ئانایۆنەکە، واتە 1–  ،ژمارەی ئۆکسانی گەردیلەیەکی ئۆکسجین لە ئایۆنەکەدا دەکاتە 2– ، بۆیە کۆی ژمارەی ئۆکسانەکانی سێ گەردیلە ئۆکسجین دەکاتە 6– ، بۆ ئەوەی ئایۆنی کلۆرات بارگەکەی 1– بێت، پێویستە ژمارەی ئۆکسانی کلۆر بکاتە +5 .

$$\overset{+5\ \ -2}{ClO_3^-}$$
$$+5\ \ -6$$

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** ژمارەی ئۆکسانی هەرگەردیلە یەك لەم ئاوێتە و ئایۆنانەی خوارەوەدا بدۆزەرەوە:

أ . $CF_4$  د . $KH$

ب . $PCl_3$  هـ . $N_2O_5$

ج . $HNO_3$

**وەڵامەکان:**

**1.** أ. -1، +4  د. -1، +1

ب. -1، +3  هـ. -2، +5

ج. -2، +5، +1

## بەکارهێنانی ژمارەی ئۆکسان، بۆ نووسینی شێوگی ئاوێتەکان و ناوەکانیان

زۆر ناکانزا، لە ژمارەیەکی ئۆکسان زۆرتریان هەیە، وەك لەخشتە 6-1 دا دەردکەوێت و، لیستێکی درێژی ژمارەی ئۆکسان هەیە لە خشتەی پاشکۆی أ–4 لاپەرە 190 دا و، دەتوانرێت ئەم ژمارانە، هەندێ جار، بەهەمان ڕێگەی بەکارهێنانی بارگە ئایۆنییەکان بەکار بهێنرێت بۆ دیاریکردنی شێوگەکان. باوادابنێین بۆ نموونە، دەتەوێت شێوگی ئاوێتەیەکی دوانی بزانیت کە لە گۆگرد و ئۆکسجین پێك هاتبێت، بە پشت بەستن بە هەردوو باری ئۆکسانی باوی +4 و +6 ی گۆگرد، دوو ئاوێتەی ناسراوی $SO_2$ و $SO_3$ پێك دێنێت.

لەکەرتی 1-1  دا ، ڕەنووسە ڕۆمانییەکان بەکارهێنران بۆ دۆزینەوەی بارگە ئایۆنییەکانی سیستمی ستۆك، بۆ ناونانی ئاوێتە ئایۆنییەکان. ئەم سیستمە، پشت بە ژمارەی ئۆکسان دەبەستێت و دەتوانرێت لە جیاتی سیستمی پێشگر بۆ ناونانی ئاوێتە گەردییە دوانییەکان بەکاربهێنرێت، لە سیستمی پێشگردا، $SO_2$ و $SO_3$  بەرودوا پێیان دەڵێن دوانۆکسیدی گۆگرد و سیانۆکسیدی گۆگرد، بەڵام بەپێی سیستمی ستۆك ئۆکسیدی گۆگرد (IV) و ئۆکسیدی گۆگرد (VI) ن.

**خشتە 1-6** ژمارەی ئۆکسانی باوی هەندێ لەو ناکانزایانەی چەند بارێکی ئۆکسانی جیاوازیان هەیە *

| | | |
|---|---|---|
| کۆمەڵەی 14 | کاربۆن | +4، +2،-4 |
| کۆمەڵەی 15 | نیترۆجین | +5، +3 ، -3 |
| | فۆسفۆر | +5 ،+3 ،-3 |
| کۆمەڵەی 16 | گۆگرد | +6 ،+4 ،-2 |
| کۆمەڵەی 17 | کلۆر | +7 ،+5 ،+3 ،+1 ،-1 |
| | برۆم | +7 ،+5 ،+3 ،+1 ،-1 |
| | یۆد | +7 ،+5 ،+3 ،+1 ،-1 |

* سەرباری ئەو بەهایانە، گەردیلەی توخمەکان لە باری خاوێنیدا ژمارەی ئۆکسانی سفر یان دەدرێتێ.

وا لە خوارەوە هەندێ نموونەی تری باو دەخەینە بەرچاو کە بەپێی هەردوو سیستمەکە ناونراون

| | سیستمی پێشگر | سیستمی ستۆك |
|---|---|---|
| $PCl_3$ | سیانە کلۆریدی فسفۆر | کلۆریدی فسفۆر (III) |
| $PCl_5$ | پێنجە کلۆریدی فسفۆر | کلۆریدی فسفۆر (V) |
| $N_2O$ | یەکۆکسیدی دوانە نیترۆجین | ئۆکسیدی نیترۆجین (I) |
| NO | یەکۆکسیدی نیترۆجین | ئۆکسیدی نیترۆجین (II) |
| $PbO_2$ | دوانۆکسیدی قورقوشم | ئۆکسیدی قورقوشم (IV) |

## پێداچوونەوەی کەرتی 1-2

**1.** ژمارەی ئۆکسانی گەردیلەکانی ئەم ئاوێتە و ئایۆنانە، دیاری بکە:

أ. HF
ب. $CI_4$
ج. $Na_2O_2$
د. $H_2CO_3$
هـ. $NO_2$
و. $SO_4^{-2}$

**2.** هەریەکە لەم ئاوێتەگەردییە دوانییانە، بە گوێرەی سیستمی ستۆك. ناوبنێ.

أ. $CI_4$
ب. $SO_3$
ج. $As_2S_3$

# کیمیا و تابلۆ هونەرییەکان

لە کتێبی «کیمیا و هونەرە هێڵکاری و گونجۆکییەکان»ی جوناثان ئەرکسۆنەوە وەرگیراوە.





پلەی گەرمی و ڕێژە شێی ناوچەکانی دەوروبەری کارە هونەرییەکان، بە بەکارهێنانی ئامێری شێوگەرمیپێو *hygrothermograph* دەپێورێن.

پاراستنی کارە هونەرییەکان و بیرازکردنیان(چاککردنەوە) پشت بە ڕێکخستنی هۆکارەکانی ژینگەی دەوروبەری ئەو کارانە، دەبەستێت بە مۆزەخانەنوێیەکان باگونجێنراون، پلەی گەرمی لە نێوان 20°C و 22°C و شێی ڕێژەیی لە نێوان 50% و 65%، دا جێگیردەکرێن، ئەم جۆرە گونجاندنە مەرجە گونجاوەکانی پاراستنی زۆربەی کارە هونەرییەکان دەستەبەردەکات، بەڵام هەندێ جار پێویست دەبێت شێ بەرزیان نزمتر بکرێتەوە بە پێی جۆری پارچە هونەرییەکە، لێرەدا گرنگی پاراستنی کەلەپووری هونەری پێویستی دەکات کە پەنابیرێتە بەر بەکارهێنانی تەکنیکی کیمیای فیزیایی بۆ دیاریکردنی مەرجە نموونەییەکانی کارەکە.

ڕووناکیسازیی هەر کارێکی هونەری بەبەشێکی بەوردی ڕەفتار لەگەڵکردنی دادەنرێت لە دەوروبەرەکەیدا، چونکە ڕووناکی فلۆری و ڕووناکی خۆر زۆریان تیشکی ژووربنەوشەیی تێدایە و کاری هونەری خستنە بەر ئەو تیشکە، ڕەنگەکانی دەچوێنێتەوە و کاڵیان دەکاتەوە و کاغەز و جانفاز و بۆیە ئەندامییەکان ڕەنگەکانیان زۆرتر کاڵ دەبێتەوە کە بکەونە بەر ئەو تیشکە، بۆیە کیمیاگەرانی پۆلیمە رزانی، گەشەیان جۆرێکی تایبەت گونجۆکی (پلاستیکی) ئەکریلی کرد وەك پلێکسیگلاس UF-3 کەبەری ئەو تیشکەیان لێ دەگرێت لە لایەکی ترەوە، دابینکردنی شێی ڕێژەیی و پلەی گەرمی و ڕووناکی کارێکی ئاسانە لە مۆزەخانەگەورەکاندا، بەڵام ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی لە ناوبردنی شێوەی پارچە هونەرییەکە لە ناوەوە، هەمیشە بە ئاسانی دیاری ناکرێن، لەباری تابلۆ ڕۆنییەکاندا، بە هۆی لەسەر کۆ بونەوەی تۆزو پیسی، دەبنە هۆی گۆڕینی ڕەنگی توێژاڵە بۆیەکە ، یان کرژبوون و شێوانی قوماشی تابلۆکە، یان داری چوارچیوەکەی، کە دەپەکە والێ دەکەن، شێواو بکەوێتە بەرچاو، جاران خەڵکی بۆ پاکردنەوەی دەپی ڕۆنی، سمارتەیان بەکاردەهێنا و هەندێ جاریش پاکیان نەدەکردەوە کە ئەمەیان ژیرانەتربوو، بەڵام ئێستا، کیمیای نوێ زۆر ڕێگای دۆزیوەتەوە بۆ پاکردنەوەیەکی بێوەی و ماددەی بۆ پاکردنەوە سەرکەوتووی وەك ئەسیتۆن و کهول و توێنەرەوە ئەندامییەکانی تری بەکارهێنا،فەرمانبەری پاکردنەوە بێ سپێردراو، پاش پشکنین و هەڵسەنگاندنێکی ورد، چینە ڕووپۆشە پارێزەکۆنەکە(وارنیش) لادەبات و، دەتوانرێ کارە هونەرییەکە بە کۆمەککردنی قوماشەکەی بە پارچە قوماشێکی لە ڕاتنجی مێو پۆش دروستکراو دواتریش ڕووپۆشینی دەپەکە بە چینێکی دابڕی تۆکمە، پێویستییەکان هەموو ئەم قۆناغانەیش، لە تاقیگەکانی کیمیادا ئامادە دەکرێن.هەر وەك هۆکارەکانی کارە هونەرییەکان هەمیشە هەر ئەوەنییە لەپێشەوە باسمان کرد، دەشێ ئەو کارانە بەربینەوە و بشکێن یان بدرێن و بسووتێن و، هەر یەکە لەو بارانە و هەر کارەیش بە ڕێگەیەکی خۆی دەپارێزێت ونزیکەی لەهەموو بارەکاندا، مادە بەکارهێنراوەکان یان ڕێگەی چارەسەریان ئەنجامێکی ڕاستە و خۆی بە شداری کیمیاگەرانە و لە کۆتاییدائەگەر بەشدارییەکانی کیمیازانی نەبوایە، پاراستن و بیراز و پینە و پەرۆ کردنی کارە هونەرییەکان کۆنباوو سەرەتایی دەبوون.

### خوێندنەوەیەکی ئاراستەکراو

گونجۆکە ئەکریلییەکان، لە چ جۆرە گەردێك پێك دێن؟

### زۆرتر بخوێنەوە

لەیەکگرتنی ڕووناکی لەگەڵ کاغەزدا، کارلێکی کیمیایی ڕووناکی ڕوودەدات photochemical reaction، بەدوای شوێنەواری کارلێکە ڕووناکییەکاندا بچۆ، ڕوونی بکەرەوە بۆچی ڕەنگی کاغەزی ڕۆژنامە دەگۆڕێت و زەرد دەبێت کە ماوەیەکی زۆر بدرێتە بەر خۆر.

کەرتی 1-3

# بەکارهێنانی شێوگە کیمیاییەکان

## نیشانەکانی ڕاییکاری

- بارستەی شێوگی ئاوێتەی کیمیایی دەدۆزێتەوە.
- مۆڵ پێناسە دەکات بەپێی ژمارەی ئاڤۆگادرۆ.
- بارستەی مۆڵی ماددەیەکی دیاریکراو دەدۆزێتەوە.
- کۆلکەکانی گۆڕین بەکاردەهێنرێت لە ژمارکاری مۆڵ – گرام – گەردی ئاوێتەیەکی کیمیاییدا.
- ڕێژەی سەدی پێکهاتنی ئاوێتەیەك دەدۆزێتەوە.

شێوگی کیمیایی بەپێی ئەوەی کە باس کرا، ڕێنماییمان دەکات بۆ توخمەکان و ژمارەی ڕێژەیی گەردیلە یان ئایۆنە ڕێژەییە تایبەتییەکانی هەر توخمێك کەلە ئاوێتەکەدا هەبێت، و شێوگە کیمیاییەکان وا لە کیمیاگەران دەکەن بتوانن چەند بەهایەکی دیاری ئاوێتەکە بدۆزنەوە.

## بارستەی شێوگ

لەبەندی 3 ی پۆلی دەیەمەوە فێربووین کە گەردیلەکانی هایدرۆجین تێکرایەکی بارستەی گەردیلەییان هەیە دەکاتە 1.00794 amu و، هی گەردیلەکانی ئۆکسجین دەکاتە 15.9994 amu و وەك لە گەردیلە تاکەکاندا، گەرد و بەشەشێوگ و ئایۆنەکان، تێکرایەکی بارستەی گەردیلەیی دیاریان هەیە، بۆ نموونە، لە شێوگی کیمیایی ئاوەوە $H_2O$ دەزانین کە هەر گەردێك ئاو، لە دوو گەردیلە هایدرۆجین و یەك گەردیلە ئۆکسجین پێك دێت، بارستەی گەردی ئاو بە کۆکردنەوەی بارستەی سێ گەردیلەکەی گەردەکەوە دەدۆزێتەوە (لەژمارەکەیدا، ڕەنووسی تێکڕای بارستەی گەردیلەیی نزیك دەکرێتەوە بۆ دوو ڕەنووسی دەیی).

تێکرایی بارستەی گەردیلەیی H: 1.01 amu

تێکرایی بارستەی گەردیلەیی O: 16.00 amu

$$2\,\text{H گەردیلە} \times \frac{1.01\ \text{amu}}{\text{H گەردیلە}} = 2.02\ \text{amu}$$

$$1\,\text{O گەردیلە} \times \frac{16.00\ \text{amu}}{\text{O گەردیلە}} = 16.00\ \text{amu}$$

تێکرای بارستەی گەردی ئاو = 18.02 amu

بەبارستەی گەردی ئاو دەڵێن «بارستەی گەردی»، بەڵام بارستەی شێوگێك لە NaCl بۆ نموونە، بەبارستەی گەردی دانانرێت، چونکە NaCl ئاویتەیەکی ئایۆنییە، بارستەی هەر بەشێك لە شوێگێکی کیمیایی پێی دەڵێن بارستەی شێوگ، سائیتر ئەو بەشەگەرد، یان بەشەشێوگی تەواویان ئایۆن بێت و یەکسانە بەبارستەی شێوگ **formula mass** بۆ هەر گەرد یان بەشە شێوگ یان ئایۆنێك، کۆی تێکرای بارستەی گەردیلەیی هەموو گەردیلەکانی ئەوشێوگە ئەو ڕێگەیەی سەرەوە کە بارستەی شێوگی گەردی ئاومان پێ دۆزییەوە، دەتوانرێت لە دۆزینەوەی بارستەی هەر بەشێکی تردا بەکاربهێنرێت کە لە شێوگێکی کیمیاییدا خۆی دەنوێنێ و لە هەموو ئەو پرسانەدا کە دێن، بارستە گەردیلەییەکان کە لە خشتەی خولی وەرگیراون بۆ دوو ڕەنووس نزیك دەکرێتەوە

پرسی نموونەیی 6-1

## بارستەی شێوگی کلۆراتی پۆتاسیۆم $KClO_3$ بدۆزەوە

**شیکاری**

بارستەی بەشەشێوگی $KClO_3$ بدۆزەرەوە بەکۆکردنەوەی بارستەی گەردیلەیەکی پۆتاسیۆم، گەردیلەیەکی کلۆر و سێ گەردیلەی ئۆکسجین بارستە گەردیلەییەکان لە خشتەی خولیدا هەن و بارستەی گەردیلەیی نزیک دەخرێتەوە لە دوو ڕەنووسی دەیی.

$$1\ K\ \text{گەردیلە} \times \frac{39.10\ amu}{K\ \text{گەردیلە}} = 39.10\ amu$$

$$1\ Cl\ \text{گەردیلە} \times \frac{35.45\ amu}{Cl\ \text{گەردیلە}} = 35.45\ amu$$

$$3\ O\ \text{گەردیلە} \times \frac{16.00\ amu}{O\ \text{گەردیلە}} = 48.00\ amu$$

بارستەی شێوگی $KClO_3$ = 122.55 amu

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** بارستەی شێوگی ئەمانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:

أ. $H_2SO_4$

ب. $Ca(NO_3)_2$

ج. $PO_4^{-3}$

وەڵامەکان:

**1.** أ. 98.09 amu

ب. 164.10 amu

ج. 94.97 amu

## پەیوەندیی نێوان بارستە و ژمارەی گەردیلەکان

پێوەری بارستەی گەردیلەیی ڕێژەیی دەتوانیت لە زانینی ژمارەی گەردیلەکانی توخمێکی دیاری کراو لە نموونەیەکی بارستە دیاریکراوی ئەو توخمە بزانیت. وەسێ چەمکی گرنگی هەیە: مۆڵ و ژمارەی ئاڤۆگادرۆ بارستەی مۆڵی ، کە بنچینەی پەیوەندی نێوان بارستە (بەگرام) و ژمارەی گەردیلەکانی پێشان دەدات.

### مۆڵ

مۆڵ یەکەی پێوانەی بڕی ماددەیە بەپێی سیستمی جیهانی یەکەکان (SI) ، **مۆڵ mole** (کەکورتەکەی mol)ە، **بەمجۆرە پێناسە دەکرێت ئەو بڕە ماددەییەکە چەند تەنۆکەیەکی تێدایە، دەکاتە ژمارەی گەردیلەکانی 12 g لە کاربۆن – 12** مۆڵ یەکەیەکی ژمارەییە وەك دەستە، ئێمە ئاسایی 12 قەڵەم یان 24 قەڵەم ناکڕین، بەڵکو دەستەیەك یان دوو دەستە،بەهەمان شێوە، کیمیاگەر مۆڵێك کاربۆن یان دوو مۆڵ ئاسن Fe ، یان 2.567 mol کالیسیۆم Ca بەکاردێنێت لە بەشەکانی داهاتوودا، پەیوەندیی مۆڵ بە بارستەی گەردیلە و ئاوێتەکان بەرچاو دەکەوێت.

## ژمارەی ئاڤۆگادرۆ

لە ئەنجامی چەندەها تاقیکردنەوەی کردەیی هەمە جۆردا، توانرا ژمارەی تەنۆکەکانی مۆلێك دیاری بکرێت و، نوێترین بەهای ئەو ژمارەیە، گەیشتە $6.022\ 1367 \times 10^{23}$ ، ئەمە واتا 12 g لە کاربۆن -12 کەبڕی $6.022\ 1367 \times 10^{23}$ گەردیلە کاربۆن -12 تێدایە و، ژمارەی تەنۆکەکانی مۆلێك، ناسراوە بە ژمارەی ئاڤۆگادرۆ ( بەناوی زانای ئیتالیی ئەمیدۆ ئاڤۆگادرۆ A. Avogadro وە، کە هەر ئەویش پەیوەندی نێوان بارستە و ژمارەی گەردیلەکانی لێك دایەوە) ژمارەی ئاڤۆگادرۆ **Avogadro's number** ، ژمارەی ئەو تەنۆکانەیە کە لەمۆڵێکی مادەییەکی خاوێندا هەیە و ئەم ژمارەیە نزیك خرایەوە لە $6.022 \times 10^{23}$ .

## بارستەی مۆڵی

دەتوانین پێناسەی مۆڵ بەوە بکەین کە بڕی ئەو ماددەیەیە کە ژمارەیەکی ئاڤۆگادرۆ تەنۆکەیەکی تێدایە، ئایا دەتوانیت بارستەی نزیکەیی مۆڵێکی گەردیلەی هیلیۆم بدۆزیتەوە؟ تۆ دەزانیت کە بارستەی مۆڵێك کاربۆن -12 دەکاتە 12 g و بارستەی گەردیلەیی گەردیلەیەکی کاربۆن -12 دەکاتە 12 amu ) واتە یەکەی بارستەی گەردیلەیی ی . ب . گ) و بارستەی گەردیلەیی گەردیلەی هیلیۆم دەکاتە 4.00 amu واتە سێیەکی بارستەی گەردیلەی کاربۆن -12 ، ئەمە واتە بارستەی مۆڵێك هیلیۆم یەکسانە بە سێیەکی بارستەی مۆڵێك کاربۆن -12 ، کەواتە بارستەی مۆڵێك دەکاتە 4.00 g .

**بەبارستەی مۆڵێکی ماددەیەکی خاوێن دەڵێن بارستەی مۆڵی molar mass ی ئەو ماددەیە** و ئاسایی بەیەکەی g/mol دەبێورێت و بارستەی مۆڵی هەر توخمێك بە ژمارە یەکسانە بە amu بارستەی گەردیلەیی، بارستەی مۆڵی لیثیۆم Li ، بۆ نموونە، دەکاتە 6.94 g/mol ، کاتێك بارستەی مۆڵیی جیوە دەکاتە 200.59 g/mol جیوە، Hg کە هەمووی مۆڵێك گەردیلەی تێدایە و، شێوەی 1-3 ، بارستەی مۆڵی سێ توخمی باوپیشان دەدات.

## گۆڕینی بڕ بەمۆڵ، بۆ بارستە بەگرام

کیمیاگەران، بارستەی مۆڵی، لە ژمارکارییەکیمیاییەکاندا، وەك کۆڵکەی گۆڕین بەکاردێنن، ئەمەی خوارەوە، نموونەیەکە لەو بارەیەوە:

بارستەی مۆڵی توخمی هیلیۆم He دەکاتە 4.00 g He/mol He با، بارستە بەگرامی بڕی 2 mol He لەگەڵ بارستەی مۆڵی لێك دەدەین:

$$2.00\ \text{mol He} \times \frac{4.00\ \text{g He}}{\text{mol He}} = 8.00\ \text{g He}$$

شێوە 1-4 ، چۆنێتی بەکارهێنانی مۆڵە بارستە (بارستەی مۆڵی) و مۆڵەکان و ژمارەی ئاڤۆگادرۆ پیشان دەدات، بۆ پێکەوە بەستنی نێوان بارستەی توخم بەگرام و بڕەکەی بە مۆڵ و ژمارەی گەردیلەکانی.




( أ )




(ب)




(ج)

**شێوە 3-1** بارستەی مۆڵی نزیکەیی ( أ ) کاربۆن (گرافیت)،(ب) ئاسن (بزمار)،(ج) مس (تەل)




**شێوە 4-1** ئەم هێلکارییە، پێوەندی نێوان (بارستە بەگرام) ی توخمێکی دیاریکراو و نێوان بڕەکەی بە مۆڵ و ژمارەی گەردیلەکانی توخم لە نموونەیەکیدا.

## پرسی نموونەیی 7-1

**بارستەی بڕی 3.50 mol مس (Cu) بەگرام چەندە؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** 3.50 mol Cu

**نەزانراو:** بارستەی Cu بەگرام.

**2 نەخشە بکێشە**

بڕی Cu بەمۆڵ ← بارستەی Cu بەگرام. بەپێی زانیارییەکانی شێوە 4-1، ئەنجامی لێکدانی بڕی توخمێکی دیاریکراو بە مۆڵ لە هاوکۆلکەی گۆڕینی گونجاو، دەکاتە بارستەی توخمەکە بەگرام.

$$\text{mol Cu} \times \frac{\text{g Cu}}{\text{mol Cu}} = \text{g Cu}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بارستەی مۆڵی مس (Cu) ، لە خشتەی خولی دەردەهێنرێت، نزیك کرابێتەوە بۆ 63.55 g/mol .

$$3.50\ \cancel{\text{mol Cu}} \times \frac{63.55\ \text{g Cu}}{\cancel{\text{mol Cu}}} = 222\ \text{g Cu}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

لەبەرئەوەی بڕەکە بە مۆڵ مس (Cu) تاسێ ڕەنووسی واتایی دراوە، بۆیە پێویستە وەڵامەکە نزیك بخرێتەوە بۆ 3 ڕەنووسی واتایی.

### ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** (بارستە بەگرام)ی 2.25 mol ئاسن (Fe) چەندە؟

**2.** (بارستە بەگرام)ی 0.375 mol پۆتاسیۆم (K) چەندە؟

**وەڵامەکان:**

**1.** 126 g Fe

**2.** 14.7 g K

## پرسی نموونەیی 8-1

**لە تاقیکردنەوەیەکدا، کیمیا گەرێك 11.9 g ئەلەمنیۆم (Al)ی دەست کەوت، بڕی ئەلەمنیۆم بە مۆڵ لەم نموونەیەدا چەندە؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** 11.9 g Al

**نەزانراو:** بڕی Al بەمۆڵ

**2 نەخشە بکێشە**

بارستەی Al بەگرام ← بڕی Al بە مۆڵ

هەروەك شێوە 4-1 دەری دەخات، بۆ ئەوەی بڕت بە مۆڵ دەست بکەوێت، پێوستە بارستە بەگرام لەگەڵ هاوکۆڵکەی گۆڕینی گونجاو لێك بدرێت.

$$\cancel{g\ Al} \times \frac{mol\ Al}{\cancel{g\ Al}} = mol\ Al$$

**3 بدۆزەرەوە**

بارستەی مۆڵی ئەلەمنیۆم (Al) لە خشتەی خولییەوە وەردەگیرێت، نزیك کرابێتەوە بۆ 26.98 g/mol .

$$11.9\ \cancel{g\ Al} \times \frac{mol\ Al}{26.98\ \cancel{g\ Al}} = 0.441\ mol\ Al$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وەڵامەکە بەڕاست دادەنرێت، چونکە لە سێ ڕەنووسی واتایی پێکهاتووە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** چەند مۆڵ کالیسیۆم (Ca) ، لە 5.00 g کالیسیۆمدا هەیە؟

**2.** چەند مۆڵ زێڕ (Au) لە $3.60 \times 10^{-10}$ g زێڕدا هەیە؟

**وەڵامەکان:**

**1.** 0.125 mol Ca

**2.** $1.83 \times 10^{-12}$ mol Au

## گۆڕین بەهۆی ژمارەی ئاڤۆگادرۆوە

شێوە 4-1 دەری دەخات، چۆن ژمارەی ئاڤۆگادرۆ بەکاردەهێنرێت بۆ دۆزینەوەی ژمارەی گەردیلەکانی توخمێکی دیاریکراو بەهۆی بڕ بە مۆڵ، یان بۆ دۆزینەوەی بڕەمۆڵ بە هۆی ژمارەی گەردیلەکانەوە لەگەڵ ئەوەیشدا جۆری ئەم پرسانە لە ژمارکارییە کیمیاییەکاندا کەمترباون لە گۆڕینی بڕ بە مۆڵ بۆ بارستە بەگرام. یەکەی ئاڤۆگادرۆ لەم ژمارکارییانەدا، یەکەی گەردیلە یە لە مۆلێکدا.

**پرسی نموونەیی 1-9**

**بڕی زیو (Ag) بە مۆڵ، لە $3.01 \times 10^{23}$ گەردیلە زیودا چەندە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** ژمارەی گەردیلەکان $3.01 \times 10^{23}$ گەردیلە زیو.

**نەزانراو:** بڕی زیو Ag بە مۆڵ.

**2 نەخشە بکێشە**

ژمارەی گەردیلەکانی زیو Ag ← بڕی زیو Ag بەمۆڵ.

**3 بدۆزەرەوە**

شێوەی 4-1 پێشانمان دەدات ، کە دەتوانین ژمارەی گەردیلە بگۆڕین بۆ بڕ بە مۆڵ، بەوەی لێکی بدەین لەگەڵ کۆلکەی گۆڕینی گونجاو.

$$\text{Ag گەردیلە} \times \frac{\text{mol Ag}}{\text{Ag ژمارەی ئاڤۆگادرۆ گەردیلە}} = \text{mol Ag}$$

$$3.01 \times 10^{23}\ \text{Ag گەردیلە} \times \frac{\text{mol Ag}}{6.022 \times 10^{23}\ \text{Ag گەردیلە}} = 0.500\ \text{mol Ag}$$

**4 هەڵسەنگێنە** وەڵامەکە ڕاستە چونکە یەکەکان یەکتری کورت دەکەنەوە ( لەگەڵ یەکتری دەڕۆن) و، چونکە ژمارەی گەردیلەکان بە تەواوی دەکاتە نیوەی ژمارەی ئاڤۆگادرۆ.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. بڕی قورقوشم (Pb) بە مۆڵ، لە $1.50 \times 10^{12}$ گەردیلە قورقوشمدا چەندە؟
2. بڕی تەنەکە (Sn) بە مۆڵ، لە 2500 گەردیلە تەنەکەدا چەندە؟
3. ژمارەی گەردیلەکانی ئەلومنیۆم لە 2.75 mol ، ئەلومنیۆمدا (Al) چەندە؟

**وەڵامەکان:**

1. $2.49 \times 10^{-12}$ lom Pb
2. $4.2 \times 10^{-12}$ mol Sn
3. $1.66 \times 10^{24}$ گەردیلە Al

**پرسی نموونەیی 10-1**

**بارستەی $1.2 \times 10^{8}$ گەردیلە مس (Cu) ، بەگرام چەندە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە** **دراو:** $1.20 \times 10^{8}$ گەردیلە Cu .

**نەزانراو:** بارستەی Cu بە گرام.

**2 نەخشە بکێشە** ژمارەی گەردیلەکانی Cu ← بڕی Cu بەمۆڵ ← بارستەی Cu بەگرام.

شێوە 1-4 دەری دەخات کە پێویستە دوو هاوکۆلکەی گۆڕین بەکاربهێنین، یەکەمیان بۆ گۆڕینی ژمارەی گەردیلە دراوەکان بۆ مۆڵ، دووەمیان بۆ گۆڕینی مۆڵ بۆ بارستە بەگرام.

$$\text{Cu گەردیلە} \times \frac{\text{mol Cu}}{\text{Cu ژمارەی ئاڤۆگادرۆ گەردیلە}} \times \frac{\text{g Cu}}{\text{uC lom}} = \text{g Cu}$$

**3 بدۆزەرەوە** بارستەی مۆڵی بۆ مس وەرگیراوە لە خشتەی خولی و نزیک کرابیتەوە بۆ 63.55 g /mol

$$1.20 \times 10^{8}\ \text{Cu گەردیلە} \times \frac{\text{mol Cu}}{6.022 \times 10^{23}\ \text{Cu گەردیلە}} \times \frac{63.55\ \text{g Cu}}{\text{mol Cu}} = 1.27 \times 01^{-14}\ \text{g Cu}$$

**4 هەڵسەنگێنە** یەکەکان، بەڕێگایەکی ڕاست کورت کراونەتەوە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. بارستەی $7.5 \times 10^{15}$ گەردیلە نیکڵ (Ni) ، بە گرام چەندە؟
2. ژمارەی گەردیلەکانی گۆگرد (S) ، لە 4.00 g گۆگرددا چەندە؟
3. بارستەی ئەو زێڕەی (Au) ، بەگرام، کە هەمان ژمارە گەردیلە Al ی لە 9.0 g ئەلومنیۆم Al دا تێدایە، چەندە؟

**وەڵامەکان:**

1. $7.3 \times 10^{-7}$ g Ni
2. $7.52 \times 10^{22}$ گەردیلە
3. 66 g Au

## بارستە مۆڵییەکان

بارستەی مۆڵی ماددەیەکی دیاریکراو، یەکسانە بەبارستەی مۆڵێکی بەگرام، یان نزیکەی بارستەی $6.022 \times 10^{23}$ تەنۆکە، بارستەی مۆڵێکی کالیسیۆمی خاوێن Ca بۆ نموونە، دەکاتە 40.08 g/mol ، چونکە بارستەی مۆڵێك گەردیلەی کالیسیۆم یەکسانە بە 40.08 g بارستەی مۆڵی هەر ئاوێتەیەك، بە کۆکردنەوەی بارستەی ئەو توخمانەی کە لەمۆڵێکی گەرد یان شێوگییانەی ئاوێتەکانیان لێ پێك دێت دەست دەکەوێت، بۆ نموونە، مۆڵێك گەردی ئاو، لەدوو مۆڵ گەردیلەی هیدرۆجین و مۆڵێك گەردیلەی ئۆکسجین پێك دێت و، بارستەی مۆڵێك گەردیلەی هیدرۆجین دەکاتە 1.01 g و، بارستەی مۆڵێك گەردیلەی ئۆکسجین دەکاتە16.00 g ( نزیك خرابێتەوە بۆ دوو ڕەنووسی دەیی) ، بۆیە بارستەی مۆڵی ئاو، وەك خوارەوە دەدۆزیتەوە:

$$2 \text{ mol H} \times \frac{1.01 \text{ g H}}{\text{mol H}} = 2.02 \text{ g H}$$

$$1 \text{ mol O} \times \frac{16.00 \text{ g O}}{\text{mol O}} = 16.00 \text{ g O}$$

بارستەی مۆڵی ئاو = 18.02 g/mol

شێوە 1-5 مۆڵێك ئاوومۆڵێکی چەند ماددەیەکی جیاوازپێشان دەدات، ڕەنگە سەرنجت دابێ کە **بارستەی مۆڵی ئاوێتەیەکی دیاریکراو بە ژمارە یەکسانە بە بارستەی شێوگەکەی** ، بۆ نموونە، لە پرسی نموونەی 1-6 دا، بارستەی شێوگی $KClO_3$ دەکاتە 122.55 amu ، بۆیە و، لەبەرئەوەی بارستەی مۆڵی بە ژمارە یەکسانە بەبارستەی شێوگی، کەواتە بارستەی مۆڵی $KClO_3$ دەکاتە 122.55 g/mol .



**شێوە 1-5** هەر ئاوێتەیە، بارستەیەکی مۆڵی تایبەتی خۆی هەیە، لە شێوەکەدا مۆڵێکی هەر یەکەی نیترۆجین (لەمیزڵدان) و ئاو ( لە بۆرییەکی پلە کراو) گۆگردیدی کادمیۆم CdS ( ماددە زەردەکەی شووشەی کاتژمێرەکە) و، کلۆریدی سۆدیۆم NaCl ( ماددە سپییەکەی سەر شووشەیەکی کاتژمێری تر).

**پرسی نموونەیی 1-11**

بارستەی مۆڵی نیتراتی باریۆم $Ba(NO_3)_2$ چەندە؟

**شیکاری**

مۆڵێکی نیتراتی باریۆم، مۆڵێك ئایۆنی $Ba^{2+}$ وە دوو مۆڵ ئایۆنی $NO_3^-$ تێدایە، و دوو مۆڵ ئایۆنی $NO_3^-$ دوو مۆڵ گەردیلەی N ، و شەش مۆڵ گەردیلەی ئۆکسجین تێدایە، بەوپێیە، بارستەی مۆڵی $Ba(NO_3)_2$ وەك خوارەوە دەدۆزینەوە:

$$1 \text{ mol Ba} \times \frac{137.33 \text{ g Ba}}{\text{mol Ba}} = 137.33 \text{ g Ba}$$

$$2 \text{ mol N} \times \frac{14.01 \text{ g N}}{\text{mol N}} = 28.02 \text{ g N}$$

$$6 \text{ mol O} \times \frac{16.00 \text{ g O}}{\text{mol O}} = 96.00 \text{ g O}$$

بارستەی مۆڵی $Ba(NO_3)_2$ = 261.35 g/mol

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. ژمارەی مۆڵەکانی هەر توخمە لە مۆڵێکی ئەم ئاوێتانەدا چەندە؟
   أ. $Al_2S_3$
   ب. $Ba(OH)_2$
2. بارستەی مۆڵی ئاوێتەکانی پرسی 1 بدۆزەرەوە.

**وەڵامەکان:**

1. أ. 2 mol Al، 3 mol S
   ب. 1 mol Ba، 2 mol O، 2 mol H
2. أ. 150.17 g/mol
   ب. 171.35 g/mol




**شێوە 1-6** (أ) ئەو وێنە هێلکارییە، پێوەندی نێوان بارستە بە گرام و بڕ بەمۆڵ و ژمارەی گەردیان گەردیلەکان لە ئاوێتەکەدا (ب) پێوەندی لە و جۆرەیش،بۆ توخم لە ناو ئاوێتەدا هەیە .

## مۆڵە بارستە وەك كۆڵكەی گۆڕین

دەتوانرێت مۆڵە بارستەی ئاوێتەیەكی دیاریكراو، وەك كۆڵكەی گۆڕین بەكاربهێنرێت، بۆ پێكەوە بەستنی نێوان بڕی ماددەكە بە مۆڵ و، بارستەكەی بەگرام، بیرت نەچێت كە یەكەكانی مۆڵە بارستە g/mol ە و بۆ گۆڕینی بڕێكی زانراوی ئاوێتەیەكی دیاریكراو بەمۆڵ بۆ بارستە بەگرام بڕی بە مۆڵ لەگەڵ مۆڵە بارستە لێك دەدرێن.

$$\text{بارستە (g)} = \text{بارستەی مۆڵی (g/mol)} \times \text{بڕ (mol)}$$

لەشێوەی 1-6 دا كورتە گۆڕینی لەو جۆرەی توخم و ئاوێتەی هەمە جۆر هەیە.

### پرسی نموونەیی 1-12

بارستەی 2.50 mol گازی ئۆكسجین چەندگرامە؟

**شیكاری**

**1 شی بكەرەوە**

**دراو:** $2.50\ mol\ O_2$

**نەزانراو:** بارستە $O_2$ بە گرام.

**2 نەخشە بكێشە**

مۆڵ $O_2$ ← گرام $O_2$.

بۆ گۆڕینی بڕێكی $O_2$ بە مۆڵ بۆ بارستە بەگرام، بڕی دراو بەمۆڵ لەگەڵ بارستەی مۆڵی ئۆكسجین لێك بدە:

$$\text{بارستەی } O_2\ (g) = \text{بارستەی مۆڵی } O_2\ (g/mol) \times \text{بڕی } O_2\ (mol)$$

**3 بدۆزەرەوە**

لە پێشدا بارستەی مۆڵی $O_2$ بدۆزەرەوە

$$2\ mol\ O \times \frac{16.00\ g\ O}{mol\ O} = 32.00\ g \text{ ( بارستەی مۆڵێك ئۆكسجین } O_2 \text{ )}$$

$$2.50\ \text{mol}\ O_2 \times \frac{32.00\ \text{g}\ O_2}{\text{mol}\ O_2} = 80.0\ \text{g}\ O_2$$

**4 هەڵسەنگێنە** پاش پێداچونەوەی هەنگاوەکانی شیکاری، دەرکەوت ژمارکارییەکە تەواوە و بەشێوەیەکی ڕاست کورت کراوەتەوە و وەڵامەکان نزیکخراونەتەوە بۆ سێ ژمارەی واتایی.

بۆ گۆڕینی بارستە ئاوێتەیەکی ناسراو بە گرام بۆ بڕ بەمۆڵ، بارستە دابەش دەکرێت بەسەر بارستەی مۆڵیدا، یان لەگەڵ هەڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی لێك دەدرێن و یەکەکان بەئاسانی کورت دەکرێنەوە:

$$\text{بڕ}\ (\text{mol}) = \frac{1}{\text{بارستەی مۆڵی}\ (\text{g/mol})} \times \text{بارستە}\ (\text{g})$$

**پرسی نموونەیی 13-1**

**ئیبۆپرۆفین $C_{13}H_{18}O_2$ ، ماددەیەکی کارایە لە زۆربەی دەرمانە ئازار خاوکەرەوەکانداکە پێویستی بە ڕەچەتەی پزیشکی هەیە و بارستەی مۆڵییەکەی دەکاتە 206.29 g/mol .**

**أ. ئەگەر دەنکە (پەپکە) دەرمانەکان لە پاکەتێکی پلاستیکیدا 33 g ئیبۆپرۆفینیان تێدابوو، ئایا چەند مۆڵ ئیبوپرۆفین لە پاکەتەکە داهەیە؟**

**ب. ژمارەی گەردەکانی ئیبۆپرۆفین لە پاکەتەکەدا چەندە؟**

**ج. بارستەی گشتی کاربۆن، لە 33 گرام ئیبۆپرۆفیندا بە گرام چەندە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** 33 g، $C_{13}H_{18}O_2$ ، بارستەی مۆڵی 206.29 g/mol .

**نەزانراو:** أ. مۆڵەکانی $C_{13}H_{18}O_2$

**ب.**گەردەکانی $C_{13}H_{18}O_2$

ج.بارستەی گشتی کاربۆن

**2 نەخشە بکێشە**

أ. گرام ← مۆڵ

بۆ گۆڕینی بارستەی ئیبۆپرۆفین بەگرام، بۆ بڕ بە مۆڵ، لەگەڵ هاوکۆلکەی گۆڕین لێکیان بدە (یان لەگەڵ هەڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی):

$$\text{g}\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{\text{mol}\ C_{13}H_{18}O_2}{206.29\ \text{g}\ C_{13}H_{18}O_2} = \text{mol}\ C_{13}H_{18}O_2$$

ب. مۆڵ ← گەرد

بۆ دۆزینەوەی ژمارەی گەردەکانی ئیبۆپرۆفین، بڕی $C_{13}H_{18}O_2$ بەمۆڵ، لەگەڵ کۆلکەی گۆڕینی گونجاو (بە ژمارەی ئاڤۆگادرۆ) لێك بدە.

$$\text{mol}\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{6.022 \times 10^{23}\ \text{گەرد}}{\text{mol}} = C_{13}H_{18}O_2\ \text{گەرد}$$

ج. ژمارەی مۆڵەکانی $C_{13}H_{18}O_2$ ← ژمارەی مۆڵەکانی کاربۆن ← ... بارستەی C (g) .

بۆ دۆزینەوەی بارستایی C ی ئیبۆپرۆفین، پێویستمان بە دوو کۆلکەی گۆڕین هەیە، بڕی کاربۆن بە مۆڵ لە هەر مۆڵێك ئیبۆپرۆفیندا و بارستەی مۆڵی کاربۆن:

$$\text{mol}\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{13\ \text{mol C}}{\text{mol}\ C_{13}H_{18}O_2} \times \frac{12.01\ \text{g C}}{\text{mol C}} = \text{g C}$$

**3** **بدۆزەرەوە**

أ . $33\ g\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{1\ mol\ C_{13}H_{18}O_2}{206.29\ g\ C_{13}H_{18}O_2} = 0.16\ mol\ C_{13}H_{18}O_2$

ب . $0.16\ mol\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{6.022 \times 10^{23}\ \text{گەرد}}{mol} = 9.6 \times 10^{22}\ \text{گەرد}\ C_{13}H_{18}O_2$

ج . $0.16\ mol\ C_{13}H_{18}O_2 \times \frac{13\ mol\ C}{mol\ C_{13}H_{18}O_2} \times \frac{12.01\ g\ C}{mol\ C} = 25\ g\ C$

**4** **هەڵسەنگێنە** پاش پێداچوونەوەی هەر هەنگاوێکی شیکارییەکە، دەردەکەوێت کە کارەکە ڕاستەو، ڕەنووسی واتایی ڕاست بەکارهێنراوەو، یەکەکان وەك پێویست کورت کراونەتەوە.

**ڕاهێنانە کارییەکارییەکان**

**1.** ژمارەی مۆڵەکان لە 6.60 g ی $(NH_4)_2SO_4$ دا چەندە؟

**2.** ژمارەی گەردەکان لە 25.0 g ی، $H_2SO_4$ دا چەندە؟

**3.** بارستە بە گرام بۆ 6.25 mol لە نیتراتی مس (II) چەندە؟

وەڵامەکان:

**1.** 0.0499 mol

**2.** $1.54 \times 10^{23}$ گەرد

**3.** 1170 g

## ڕێژەی سەدی پێکهاتن

ئاسایی، زانینی ڕێژەی سەدی بارستەی توخمێکی دیاریکراو لە ئاویتەیەکی کیمیاییدا بەسوودە، ئەگەر ویستمان ئاوێتەی کلۆراتی پۆتاسیوم $KClO_3$ بەکاربهێنین، بۆ نموونە، وەك سەرچاوەیەکی ئۆکسجین، ئەوا گرنگە ڕێژەی سەدیی ئۆکسجین لەو ئاوێتەیەدا بزانین بە دابەشکردنی بارستەی توخمەکە لە نموونەکە بەسەر بارستەی گشتی نموونەکەدا، ئەوسایش ئەو بەهایە لەگەڵ سەد لێك دەدرێن.

$$\text{ڕێژەی سەدی توخمێك لە ئاوێتەیەکدا} = \frac{\text{بارستەی توخمەکە لە نموونەی ئاوێتەیەکدا}}{\text{بارستەی نموونەی ئاوێتەکە}} \times 100$$

ڕێژەی سەدی بارستەی هەر توخمێکی ئاوێتەکە، وەك خۆی دەمینێتەوە هەر چەندێك بارستەی نموونەکە بگۆڕدرێت، لە بەرئەوە، پەنا دەبرێتە بەر ڕێگای ئاسان بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێژەیە، ئەویش بە دیاریکردنی ژمارەی گرامەکانی ئەو توخمەی لە مۆلێکی ئاوێتەکەدا هەیە، ئەوجا بە دابەشکردنی ئەو بەهایە بەسەر بارستەی مۆڵیی ئاوێتەکەدا و لەگەڵ 100 لێکدانیدا.

$$\text{ڕێژەی سەدی توخمێك لە ئاوێتەیەکدا} = \frac{\text{بارستەی توخمەکە لە مۆڵێکی ئاوێتەیەکدا}}{\text{بارستەی مۆڵێکی ئاوێتەکە}} \times 100$$

**ڕێژەی سەدی بارستەی هەموو توخمەکانی ئاوێتەیەك، پێی دەڵێن ڕێژەی سەدی پێکهاتن percentage composition**

## پرسی نموونەیی 1-14

ڕێژەی سەدیی پێکهاتنی گۆگردیدی مس (I)، $Cu_2S$ بدۆزەرەوە.

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

دراو: شێوگی $Cu_2S$ و لە خشتەی خولییەوە بارستەی گەردیلەیی هەریەکەی گۆگرد و مس وەردەگرین.

نەزانراو: ڕێژەی سەدی پێکهاتنی $Cu_2S$ .

**2 نەخشە بکێشە**

شێوگ ← بارستەی مۆڵی ← ڕێژەی سەدی بارستەی توخم لە ئاوێتەکەیدا.

پێشەکی پێویستە بارستەی مۆڵی ئاوێتەکە بدۆزینەوە، ئەوجا بارستەی هەر توخمێك لە مۆڵێکی ئاوێتەکەدا، بەکاردێ بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی سەدی بارستەی ئەو توخمە لە ئاوێتەکەدا.

**3 بدۆزەرەوە**

$$2\ \text{mol Cu} \times \frac{63.55\ \text{g Cu}}{\text{mol Cu}} = 127.1\ \text{g Cu}$$

$$1\ \text{mol S} \times \frac{32.07\ \text{g S}}{\text{mol S}} = 32.07\ \text{g S}$$

بارستەیی مۆڵی $Cu_2S$ = 159.2 g

$$\frac{127.1\ \text{g Cu}}{159.2\ \text{g. } Cu_2S} \times 100 = 79.84\%\ \text{Cu}$$

$$\frac{32.07\ \text{g S}}{159.2\ \text{g. } Cu_2S} \times 100 = 20.14\%\ \text{S}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وردکارییەکە دروست دەبێت ئەگەر بۆمان دەرکەوت کە کۆیان دەکاتە 100% (بەهۆی نزیککستنەوە و، دەشێ کۆ 100% ی تەواو نەبێت) .

## پرسی نموونەیی 1-15

**کاتێك هەندێ خوێ لە ئاوە گیراوەیەکدا دەبلوورێت، گەردەکانی ئاو دەبەسترێت بە پێکهاتە بلوورییەکەیەوە و هایدرات پێك دێنێت. کاربۆناتی سۆدیۆم هایدرات پێك دێنێت، چونکە دە گەرد ئاو لە هەر یەکەیەکی شێوگی کاربۆناتی سۆدیۆمدا هەیە، ڕێژەی سەدی بارستەی ئاو لە ئاوەکاربۆناتی سۆدیۆمدا $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ ، کە بارستەی مۆلییەکەی دەکاتە 286.14 g/mol بدۆزەرەوە.**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

دراو: شێوگی کیمیایی $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ ، و بارستەی گەردیلەییەکان، لە خشتەی خولییەوە وەردەگرین.

بارستەی مۆڵی $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$

نەزانراو: ڕێژەی سەدی بارستەی ئاو

**2 نەخشە بکێشە**

شێوگی کیمیایی ← بارستەی ئاو لە مۆڵێك $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ ← ڕێژەی سەدی ئاو.

لە پێشدا بارستەی ئاو لە مۆڵێکی ئاوە کاربۆناتی سۆدیۆمدا دەدۆزیتەوە، دوای ئەوبەهایە، دابەش دەکرێت بەسەر بارستەی مۆڵێك $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ .

**3 بدۆزەرەوە** مۆلێك $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ ، دە مۆڵ ئاوی تیدایە و بارستەی مۆڵی ئاو $H_2O$ دەکاتە 18.02 g/mol، ئەوا دۆزینەوەی بارستەی 10 mol وەك خوارەوە دەدۆزینەوە:

$$10 \text{ mol } H_2O \times \frac{18.02 \text{ g } H_2O}{\text{mol } H_2O} = 180.2 \text{ g } H_2O$$

بارستەی$H_2O$ لە مۆڵێکی $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ دا دەکاتە 180.29 g

بارستەی مۆڵێکی$Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ دەکاتە 286.14 g/mol و لەبەرئەوەی مۆڵێك کاربۆناتی سۆدیۆمی ئاوی بارستەکەی دەکاتە 286.14 g ، دۆزینەوەی ڕێژەی سەدی بارستەی 10 molلە $H_2O$ لە مۆڵێکی $Na_2CO_3 \cdot 10H_2O$ دا.دەتوانرێت بەم شێوەیە بێت.

$$\text{ڕێژەی سەدی بارستەی } H_2O \text{ لە } = \frac{180.2 \text{ g } H_2O}{286.14 \text{ g } Na2CO3 \text{ . } 10 H_2O} \times 100 = 62.98\ \%\ H_2O$$

$Na_2CO_3 \text{ . } 10 H_2O$

**4 هەڵسەنگێنە** لێکۆڵینەوە، دەری دەخات کە ژمارکارییەکە ڕاستە و یەکەکان وەکو پێویست کورت کراونەتەوە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**.1** ڕێژەی سەدی پێکهاتنی $PbCl_2$ بدۆزەرەوە.

**.2** ڕێژەی سەدی بارستەی ئاو لە $ZnSO_4 \cdot 7H_2O$ دا بدۆزەرەوە.

**.3** هایدرۆکسیدی مەگنسیۆم 54.87% ئۆکسجینی تێدایە، ئایا چەند گرام ئۆکسجین لە 175 g ئاوێتەکە دا هەیە؟ ژمارەی مۆڵەکانی ئۆکسجین لە ئاوێتەکەدا چەندە؟

**وەڵامەکان:**

1 . 74.51% Pb ،25.49% Cl

.2 . 43.86% $H_2O$

.3 . 6.00 mol O ،96.0 g O

## پێداچوونەوەی کەرتی 3-1

**.1** ئەمانە پێناسە بکە:

أ. مۆڵ

ب. ژمارەی ئاڤۆگادرۆ

ج. بارستەی مۆڵ

**.2** بارستیە بە گرام لەمانە دیاری بکە:

أ. 2.00 mol لە N

ب. $3.01 \times 10^{23}$ گەردیلە Cl

**.3** : بڕ بە مۆڵ دیاری بکە

أ. 12.15 g لە Mg

ب. $1.50 \times 10^{23}$ گەردیلە F

**.4** ژمارەی گەردیلەکانی هەریەك لەمانە بدۆزەرەوە:

أ. 2.50 mol لە Zn

ب. 1.50 g لە C

**.5** بارستەی شێوگ و بارستەی مۆڵی کاربۆناتی ئەمۆنیۆم $(NH_4)_2CO_3$ بدۆزەرەوە.

**.6** چەند مۆڵ گەردیلەی هەر توخمە لە مۆڵێکی $(NH_4)_2CO_3$ داهەیە؟

**.7** بارستەی 3.25 mol $Fe_2(SO_4)_3$ بەگرام چەندە ؟

**.8** چەند گەردی ئەسپیرین $C_9H_8O_4$ لە دەنکێکی ئەسپریندا هەیە کە بارستەکەی 100.0 mg بێت؟

## کەرتی 1-4

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- شێوگی سەرەتایی پێناسە دەکات و لێکی دەداتەوە، چۆن بەسەر ئاویتە ئایۆنی و گەردییەکاندا کاری پێ دەکرێت.
- شێوگی سەرەتایی یان لە ڕێژەی سەدی پێکهاتن، یان لە زانینی بارستەوە دیاری دەکرێت.
- پێوەندی نێوان شێوگی سەرەتایی شێوگی گەردی ئاوێتەیەکی دیاریکراو لێك دەداتەوە.
- شێوگی گەردی لە شێوگی سەرەتاییەوە دیاری دەکات.

# دیاریکردنی شێوگە کیمیاییەکان

لەکاتی پێکهاتنی ماددەیەکی نوێ یان دۆزینەوەیدا، بڕە شیکاری بارستەی دەکرێت بۆ بە دیارخستنی ڕێژەی سەدی پێکهاتنی و لەم ڕێژەیەوە شێوگی سەرەتایی دیاری دەکرێت، شێوگی سەرەتایی **empirical formula** پێك دێت، لە **هێمای توخمە پێکهێنەکانی ئاوێتەیەکی دیاریکراو، لەگەڵ ژێر ڕەنووسەکان**، سادەترین ڕێژەی مۆڵی هەبوو لە نێوان ژمارەی گەردیلەکانی ئەوتوخمانە دادەردەخات بەڵام بەگوێرەی ئاوێتەی ئایۆنی، یەکەی شێوگی، ئاسایی شێوگی سەرەتایی ئاوێتەکەیە، لەکاتێکدا شێوگی سەرەتای ئاوێتەی گەردی ژمارەی، ڕاستەقینەی ئەو گەردیلانە پێشان نادات کە لە هەر گەردێکدا هەن، بۆ نموونە شێوگی سەرەتایی گازی دوانە بۆران diborane ، $BH_3$ یە، بەڵام شێوگە گەردییەکەی $B_2H_6$ ە ، لەم بارەدا ژمارەی گەردیلەکان لە شێوگی گەردیدا دوو ئەوەندەی ژمارەیانە لە شێوگی سەرەتاییدا.

## دۆزینەوەی شێوگە سەرەتاییەکان

بۆ دیاریکردنی شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك بە هۆی ڕێژەی سەدی پێکهاتنەوە، پێڕەوی ئەم هەنگاوانە دەکرێت:

**1.** وادابنێ 100 g ی ئاوێتەیەکت هەیە، بارستەی هەر توخمێك لە ئاوێتەکەدا دیاری بکەو، بە گۆڕینی (%) بۆ (g).

**2.** بارستەکان بگۆڕە بۆ ژمارەی مۆڵ، بەوەی لەگەڵ هاوکۆڵکەی گۆڕینی گونجاودا لێکیان بدەیت (یان دابەشیان بکەیت بەسەر بارستەی مۆڵی گونجاودا).

**3.** ژمارەی ئەو مۆڵانەی لە هەنگاوی 2 دا دەستت کەوتوون، دابەش بکە بەسەر کەمترین بەهای ژمارەی مۆڵەکانی گەردیلەی توخمەکانەوە لە ئاوێتەکەدا بەم جۆرە سادەترین ڕێژەی ژمارەیی مۆڵەکانی گەردیلەکانی توخمەکانت لە ئاویتەکە بەدەست دەهێنین (شێوگی سەرەتایی).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم هەنگاوانە، ئەم نموونەیەی خوارەوەمان هەیە: ڕێژەی سەدی پێکهاتنی دوانە بوران بەم جۆرەیە: 78.1% B و 21.9% H لەبەر ئەوە 100.0 g دوانە بۆران 78.1 g B و 21.9 g H ی تێدایە.

لە هەنگاوی دواتردا،پێکهاتنی بارستەیی دەگۆڕدرێت بۆ پێکهاتنی مۆڵی، بە دابەشکردنی بەسەر بارستەی مۆڵی گونجاودا:

$$78.1\ \cancel{g\,B} \times \frac{1\ \text{mol B}}{10.81\ \cancel{g\,B}} = 7.22\ \text{mol B}$$

$$21.9\ \cancel{g\,H} \times \frac{1\ \text{mol H}}{1.01\ \cancel{g\,H}} = 21.7\ \text{mol H}$$

ئەم بەهایانە، ڕێژەی مۆڵی بەم جۆرە دەدەن: 7.22 mol B بۆ 21.7 mol H ، بەڵام ئەم ڕێژەیە بچووکترین ژمارەی تەواو نییە، بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی داواکراو، هەر ژمارە مۆڵێك دابەش بکە بەسەر بچووکترین ژمارە ڕێژەیاندا:

$$\frac{7.22 \text{ mol B}}{7.22} : \frac{21.7 \text{ mol H}}{7.22} = 1 \text{ mol B} : 3.01 \text{ mol H}$$

بەهۆی نزیکخستنەوە و هەڵەی تاقیگەرییەوە، ڕێژەی مۆڵ لە ئاوێتەکەدا، هەندێ جار لە ژمارەی تەواو یان لە کەرتی زۆرنزیك لەژمارەی تەواو پێك دێت، لەم بارەدا، کەرتەکان، لە نزیکترین ژمارەی تەواو نزیك دەخرێتەوە و بەوەیش، شێوگی سەرەتایی ئاوێتەکە دەبێتە $BH_3$ .

هەندێ جار، پێکهاتنی بارستەیی دەدرێت لە جیاتی ڕێژەی سەدی پێکهاتن و بۆ دیاریکردنی شێوگی سەرەتایی لەم بارەدا،پێویستە پێکهاتەی بارستەی بگۆڕدرێت بۆ پێکهاتەی مۆڵی و دوای ئەوە بەهای بچووکترین ژمارەی تەواوی ڕێژەی مۆڵی گەردیلەکان دەدۆزینەوە، ئەم ڕێگایە لە پرسی نموونەیی 1-17 دا ڕوون دەبێتەوە.

**پرسی نموونەیی1-16**

**برە شیکاری دەری دەخات کە ئاوێتەیەك 32.38% سۆدیۆم و، 22.65% گۆگرد و، 44.99% ئۆکسجین پێك دێت، شێوگی سەرەتایی ئەو ئاوێتەیە چییە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە** **دراو:** ڕێژەی سەدی پێکهاتن: Na 32.38%، S 22.65%، O 44.99% بارستە گەردیلەییەکان لە خشتەی خولییەوە.

**نەزانراو:** شێوگی سەرەتایی.

**2 نەخشە بکێشە** ڕێژەی سەدی پێکهاتن ←پێکهاتەی بارستەیی ←پێکهاتن بەمۆڵ ←بچووکترین ژمارەی تەواو بۆ ڕێژەی مۆڵەکانی گەردیلەکان

**3 بدۆزەرەوە**

پێکهاتەی بارستەیی ( بارستەی هەر توخمە لە نموونەیەکی سەد گرامیدا) ( 100.0 g:) Na 32.38 g، 22.65 g S، 44.99 g O.

پێکهاتە بە مۆڵ

$$32.38 \text{ g Na} \times \frac{1 \text{ mol Na}}{22.99 \text{ g Na}} = 1.408 \text{ mol Na}$$

$$22.65 \text{ g S} \times \frac{1 \text{ mol S}}{32.07 \text{ g S}} = 0.7063 \text{ mol S}$$

$$44.99 \text{ g O} \times \frac{1 \text{ mol O}}{16.00 \text{ g O}} = 2.812 \text{ mol O}$$

بچووکترین ژمارەی تەواو بۆ ڕێژەی مۆڵی گەردیلەکان:

ئاوێتەکە، گەردیلەی تێدایە بە ڕێژەی : 1.408 mol Na:0.7063 mol S:2.812 mol O ، بۆ دەستکەوتنی بچوکترین ژمارەی تەواو ڕێژەیی مۆڵەکان، هەر بەهایە دابەش بکە بەسەر بچووکترین ژمارەی ڕێژەکەدا:

$$\frac{1.408 \text{ mol Na}}{0.7063} : \frac{0.7063 \text{ mol S}}{0.7063} : \frac{2.812 \text{ mol O}}{0.7063} = 1.993 \text{ mol Na} : 1 \text{ mol S} : 3.981 \text{ mol O}$$

بەنزیککردنەوەی هەرژمارەیەکی ڕیژەکە بۆ نزیکترین ژمارەی تەواو ئەم ژمارەیەمان دەست دەکەوێت:

2 mol Na : 1 mol S : 4 mol O کەواتە شێوگی سەرەتایی ئاوێتەکە: $Na_2SO_4$

**4 هەڵسەنگێنە** دۆزینەوەی ڕێژەی سەدی پێکهاتن کە لە سەر شێوگی سەرەتایی دروستکرا بێ، ئەم ڕێژەیە سەدییانەمان دەست دەکەوێت: Na 32.37%و، S 22.58%و ، O 45.05% بەهایانە تاڕادەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەو ڕێژەی سەدی پێکهاتە ڕێك دەکەوێت کە لە پرسەکەدا دراون.

**پرسی نموونەیی 1-17**

**شیکاریی نموونەی ئاوێتەیەك بارستەکەی 10.150 g بوو و، تەنیا فۆسفۆر و ئۆکسجینی تێدایە و تەنیا 4.433 g ی فۆسفۆرە ، شێوگی سەرەتایی ئەو ئاوێتەیە چییە ؟**

## شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

دراو: بارستەی نموونەکە = 10.150 g

بارستەی فۆسفۆر = 4.433 g ، بارستەی گەردیلەیی ئۆکسجین و فۆسفۆر لە خشتەی خولییەوە .

نەزانراو: شێوگی سەرەتایی.

**2 نەخشە بکێشە**

پێکهاتەی بارستە ← پێکهاتە بە مۆڵ ← بچووکترین ژمارەی تەواوی ڕێژەی مۆڵی گەردیلەکان.

**3 بدۆزەرەوە**

بارستەی ئۆکسجین، بەدەرکردنی بارستەی فۆسفۆر لە بارستەی نموونەکە دەدۆزینەوە:

$$10.150\ g - 4.433\ g = 5.717\ g$$

پێکهاتەی بارستە 5.717 g O، 4.433 g P

پیکهاتەی مۆڵی

$$4.433\ g\ P \times \frac{1\ mol\ P}{30.97\ g\ P} = 0.1431\ mol\ P$$

$$5.717\ g\ O \times \frac{1\ mol\ O}{16.00\ g\ O} = 0.3573\ mol\ O$$

بچوکترین ژمارەی تەواوی ڕێژەی مۆڵ:

$$\frac{0.1431\ mol\ P}{0.1431} : \frac{0.3573\ mol\ O}{0.1431} = 1\ mol\ :P\ 2.497\ mol\ O$$

ژمارەی مۆڵەکانی ئۆکسجین تەواو نییە، بەڵام ئەگەر هەر ژمارەیەکی ڕێژەکە لەگەڵ 2 لێك بدەین، ژمارەی مۆڵەکانی ئۆکسجین دەبێتە 4.994 mol کە لە 5 mol وە ، نزیکە و بەوەیش ڕێژەی گەردیلەکانی فۆسفۆر بۆ گەردیلەکانی ئۆکسجین دەبێتە 5:2 و شێوگی سەرەتایی ئاویتەکە دەبێتە $P_2O_5$ .

**4 هەڵسەنگێنە**

کردە ژمارکارییەکان ڕاستن و، ڕەنووسە واتاییەکان بە ڕێگایەکی ڕاست بەکارهێنراون و یەکەکان وەك پێویستە کورت کراونەتەوە و ئەو شێوگەی دەستمان کەوتووە، واتە $P_2O_5$ ، شێوگێکی گونجاوە چونکە ژمارەی ئۆکسانی فۆسفۆری کردوە بە +5 ، کە باری ئۆکسانێکی باوی فۆسفۆرە.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**.1** شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك کە لە 26.56% ی پۆتاسیۆمەو 35.41% ی کرۆمە و ئەوەی تری ئۆکسجین ،چییە؟.

**.2** شیکاری 20.0 g ی ئاوێتەیەك کە تەنیا لە کالیسیۆم و برۆم پێکهاتووە، 4.00 g کالیسیۆمی تێدایە، شێوگی سەرەتاییەکەی چییە؟

**وەڵامەکان:**

1 $K_2Cr_2O_7$ .

.2 $CaBr_2$ .

## دۆزینەوەی شێوگی گەردی، لە شێوگی سەرەتاییەوە

بیرت بێ کە شێوگی سەرەتایی، سادەترین ڕێژەگەردیلەی تێدایە، شێوگی گەردی، شیوگی کردەیی ئاوێتە گەردییەکەیە و دەشێ شێوگی سەرەتایی، شێوەیەکی گەردی ڕاست بێ و دەشێ وایش نەبێ،بۆ نموونە، شێوگی سەرەتایی دوانە بۆران $BH_3$ یە و هەر چەند چاکردنەوەیەکی $BH_3$ ، وەك $B_2H_6$، $B_3H_9$، $B_4H_{21}$ تاد ... هەمان ڕێژەی گەردیلەکانی B بۆ گەردیلەکانی H پێشان دەدات، دوو ئاویتەی گەردی ئیثین ethene $C_2H_4$ و پرۆپانی ئەڵقەیی cyclopropane $C_3H_6$ ، هەمان ڕێژەی چۆنیەکی نێوان گەردیلەکانی هایدرۆجین و کاربۆنیان هەیە (2H:1C) ، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دووماددەی تەواو جیاوازن، چۆن دەتوانین شێوگێکی ڕاستی ئاویتەیەکی گەردی لە شێوگە سەرەتاییەکەیەوە بدۆزینەوە؟ دەتوانرێت پێوەندی نێوان شێوگی سەرەتایی و شێوگی گەردیی ئاوێتەیەك، وەك خوارەوە بنووسرێت:

شێوگی گەردی = (شێوگی سەرەتایی) $n$

هێمای $n$ ، ڕەنووسێکی تەواوە، ژمارەی جارەکانی چەندبارەکردنی ژێرە ڕەنووسەکان لە شێوگی سەرەتاییدا بۆ دەستکەوتنی شێوگی گەردی دەنوێنێت (بەهای $n$ ، هەندێ جار یەکسانە بە 1) ،شێوگە بارستەییەکان هەمان پێوەندییان هەیە.

بارستەی شێوگی گەردی = (بارستەی شێوگی سەرەتایی) $n$ بۆ دیاریکردنی شێوگی گەردی ئاوێتەیەك، پێویستە بارستەی شێوگی ئاوێتەکە بزانرێت بۆ نموونە، پێوانە ئەزموونییەکان دەریان خستووە کە بارستەی شێوگی دوانە بۆران27.67 amu و، بارستەی شێوگی سەرەتایی $BH_3$ دەکاتە 13.84 amu، دابەشکردنی بارستەی شێوگە پێوراوەکە بەسەر بارستەی شێوگی سەرەتاییدا، بەهای $n$ ی دوانە بۆرانمان دەداتێ.

$$n = \frac{27.67\ \text{amu}}{13.84\ \text{amu}} = 2.000$$

بۆیە شیوگی گەردی دوانە بۆران دەکاتە$B_2H_6$

$$(BH_3)_2 = B_2H_6$$

لە بیرت نەچێ، بارستەی شێوگی گەردی ئاوێتەکە، بە ژمارە یەکسانە بە بارستەی مۆڵییەکەی، لەبەر ئەوە، شێوگی گەردی ئاوێتەیەکی دیاریکراویش هەر دەتوانرێت بەهۆی شێوگی سەرەتایی ئاوێتەکە و بارستەی مۆڵییەوە دیاری بکرێت.

**پرسی نموونەیی18-1**

**لە پرسی نموونەیی 17-1 دا، شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك کە لە فۆسفۆر و ئۆکسجین پێك هاتبێ $P_2O_5$ ، تاقیکردنەوە کردەییەکان دەریان خست کە بارستەی مۆڵی ئەو ئاوێتەیە دەکاتە 283.89 g/mol ، شێوگی گەردی ئاوێتەکە چییە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** شێوگی سەرەتایی

**نەزانراو:** شێوگی گەردی

**2 نەخشە بکێشە**

$n$ (شێوگی سەرەتایی) = شیوگی گەردی

$$n = \frac{\text{بارستەی شیوگی گەردی}}{\text{بارستەی شێوگی سەرەتایی}}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بارستەی شێوگی گەردی بە ژمارە یەکسانە بە بارستەی مۆڵی، بۆیە، بە گۆڕینی یەکەی g/mol ی بارستەی مۆڵی بۆ amu، بارستەی شێوگی گەردی ئاوێتەکەمان دەست دەکەوێت.

283.89 g/mol = بارستەی مۆڵی گەردی

283.89 amu = بارستەی شێوگی گەردی

بە کۆکردنەوەی بارستەی هەموو ئەو گەردیلانەی کە لە شێوگی سەرەتاییدا پێشان دراون، بارستەی شێوگی سەرەتاییمان دەست دەکەوێت.

30.97 g/mol amu = بارستەی گەردیلەی فۆسفۆر

16.00 amu = بارستەی گەردیلەی ئۆکسجین

$P_2O_5$ بارستەی شێوگی سەرەتایی = $2 \times 30.97$ amu + $5 \times 16.00$ amu = 141.94 amu

کاتێك بارستەی ئەو شێوگەی لە تاقیکردنەوەکە دەستمان کەوتووە، دابەش بکەین بەسەر بارستەی شێوگی سەرەتاییدا، بەهای $n$ مان دەست دەکەوێت، بارستەی شێوگەکە بە ژمارە یەکسانە بە بارستەی مۆڵی.

$$n = \frac{283.89 \text{ amu}}{141.94 \text{ amu}} = 2.0001$$

ئەوا شێوگی گەردی ئاوێتەکە $P_4O_{10}$ دەبێت.

$$2 \times (P_2O_5) = P_4O_{10}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

لەکاتی وردکاریی کردە ژمارکارییەکاندا، دەردەکەوێت کە ڕاستن.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. شێوگی گەردی ئاوێتەیەك دیاری بکە، کە شێوگە سەرەتاییەکەی CH بێ و بارستەی شێوگەکەی 78.110 amu .

2. نموونەی ئاوێتەیەك کە بارستەی شێوگەکەی 34.00 amu بوو، لە 0.44 g لە هایدرۆجین و 6.92 g لە ئۆکسجین پێکهاتنی، شێوگی گەردییەکەی چییە.

**وەڵامەکان:**

1 $C_6H_6$

2. $H_2O_2$

## پێداچوونەوەی کەرتی 4-1

1. شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك کە، %53.70 ی Fe و %46.30 ی S تێدابێ چییە؟

2. شیکاریی ئاوێتەیەك دەری خست کە 1.04 g لە K ، و 0.70 g لە Cr ، و 0.86 g لە O تێدایە، شێوگە سەرەتاییەکەی چییە؟

3. ئەگەر 4.04 g نیترۆجین N ، لەگەڵ 11.46 g ی ئۆکسجین O یەك بگرێت و ئاوێتەیەك پەیدابێت کە بارستەی شێوگەکەی 108.0 amu بێ ، شێوگی گەردی ئاوێتەکە چەندە؟

4. بارستەی مۆڵی ئاوێتەیەك 92 g/mol بوو، کە نموونەیەکی ئەو ئاوێتەیە شی کرایەوە، دەرکەوت 0.606 g نیترۆجین و 1.390 g ئۆکسجین ی تێدایە، شێوگی گەردی ئەو ئاوێتەیە چییە؟

## پێداچوونەوەی بەندی 1

## کورتەی بەندەکە

### 1-1

- ناوی ئایۆنی موجەبی یەک گەردیلەیی بە ئاسانی لەڕێی ناوی توخمی لە بارەوە دیاری دەکرێت ،ئایۆنی سالیبی یەك گەردیلە بەلابردنی بەشێکی کۆتایی ناوی توخمەکە و خستنە سەری برگەی–ید بۆ ڕەگەکە ناودەنرێت.
- دەتوانرێت بارگەی هەر ئایۆنێك لەئاوێتەیەکی ئایۆنیدا بۆ دیاریکردنی سادەترین شێوگی کیمیایی ئاویتەکە بەکاربهێنرێت.
- بە و ئاوێتانەی لە دوو توخمی جیاواز پێك دێن دەڵێن ئاوێتە دوانییەکان.
- ئاوێتە ئایۆنییە دوانییەکان، بە کۆ کردنەوەی ناوی ئایۆنە موجەب و سالیبەکان ناو دەنرێن، ئەو ئاویتانەی کە ئایۆنی فرە گەردیلەیان تێدایە، بەهەمان ڕێگە ناو دەنرێن.
- ناوەکانی سیستەمی ستۆك و ناوەکانی سیستەمی پێشگرەکان لە شوێنی یەکتر بەکاردێن لە زۆربەی ئاوێتە گەردیەکان.

**زاراوەکان**

ئایۆنە یەکگەردیلەکان (8) monatomic ions — ناونان (10) nomenclature — خوێ (19) salt

ئانایۆنە ئۆکسجێنراوەکان (13) oxyanions — ئاوێتە دوانییەکان (10) binary compounds

### 2-1

- ئۆکسانە ژمارەی گەردیلەکان، لە ئاوێتەکاندا، بە پێی کۆمەڵە ڕێسایەکی دیاریکراو، دیاری دەکرێت، ئۆکسانە ژمارە، لە ناونانی ئاوێتەکان و، لە نووسینی شێوگەکان و هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکاندا بە کاردێت.
- دیاریکردنی ناوی ئەو ئاوێتانەی کە توخمی وایان تێدایە کە لە بارێکی ئۆکسان زیاتریان هەیە، بەبەکارهێنانی سیستەمی ستۆك بۆ ناولێنان دەبێت.
- ناولێنانی ستۆك و ناولێنانی سیستمی پێشگرەکان لە شوێنی یەکتری بەکاردێن لە زۆربەی ئاوێتە گەردییەکان.
- دەتوانرێ ئۆکسانە ژمارەکانی هەموو توخمێك لە ئاوێتەدا، لە زۆربەی ئاوێتە گەردییەکاندا بەکاربهێنرێت بۆ دیاریکردنی سادەترین شێوگی کیمیایی ئاوێتە.
- لە کاتی زانینی ئۆکسانە ژمارەکاندا، دەتوانین ئاوێتەکان ناو بنێن بێئەوەی بزانین ئەو ئاوێتانە، ئایۆنین یان گەردی.

**زاراوەکان** ژمارەکانی ئۆکسان (20) oxidation numbers — بارەکانی ئۆکسان (20) oxidation states

### 3-1

- دەتوانرێ لە شێوگی کیمیایی ئاوێتەوە، بارستەی شێوگ و بارستەی مۆڵی و، ڕێژەی سەدی پێکهاتن بدۆزیتەوە.
- ڕێژەی سەدی پێکهاتن، ڕێژەی بارستەی هەر توخمێك لە ئاوێتەدا پیشان دەدات.
- ژمارەی ئاڤۆگادرۆ، دەکاتەنزیکەی $6.022 \times 10^{23}$ و دەکاتە ژمارەی ئەو گەردیلانەی کە لە 12 گرامی کاربۆن –12 داهەن، و هەر نموونەیەك کە ئەوەندەی ژمارەی ئاڤۆگادرۆ تەنۆکەی تێدابێت، وەك مۆڵێکی ئەو تەنۆکانە وایە.
- بارستەی مۆڵی هەر توخمێك، بارستەی مۆڵێك گەردیلەکانی ئەو توخمەیە.
- دەتوانرێ بارستەی مۆڵی وەك هاوکۆڵکەی گۆڕینی نێوان بارستە بەمۆڵ و بارستە بەگرامی ئاوێتەیان توخمێك بەکاربهێنرێت.

**زاراوەکان**

ژمارەی ئاڤۆگادرۆ (27) Avogadro's number — بارستەی مۆڵی (27) molar mass — ڕێژەی سەدی ی پێکهاتن (34) percentage composition

بارستەی شێوگی formula mass — مۆڵ (26) mole

### 4-1

- شێوگی سەرەتایی، سادەترین ڕێژەی ژمارەیی گەردیلەکان لە ئاوێتەیەکی دیاریکراودا دەردەخات.
- هەر گەردێکی ئاویتەیەکی گەردی، ژمارەیەکی تەواوی تێدایە، کە ژمارەی ئەو جارانە پێشان دەدات کە گەردیلەکان لە شێوگی سەرەتاییدا چەند بارە بووە، لە هەندێ باردا دەشێ ئەو ژمارەیە 1 بێت.
- شێوگی سەرەتاییەکان، ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمێکی یەکگرتووە لە سادەترین یەکەی ئاوێتەیەکی کیمیاییدا.
- دەتوانرێت شێوگی گەردی لە شێوگی سەرەتایی دەست بخرێت لە کاتی پێوانەکردنی بارستەی مۆڵیدا.

**زاراوەکان** شێوگی سەرەتایی (37) empirical formula

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

**1.** أ. مەبەست لە ئایۆنە یەك گەردیلەییەکان ڕوون بکەرەوە.
ب. سێ نموونە لەسەر ئایۆنە یەك گەردیلەکان بهێنەرەوە.

**2.** جیاوازی لە نێوان ئایۆنی نیترات و ئایۆنی نیتریتدا چییە؟

**3.** خشتەی خولی بەکاربهێنە و هێمای ئایۆنی زۆرتر پەیدابوو لە هەر یەك لەم توخمانەی خوارەوەدا بنووسە:
أ. K ج. S
ب. Ca د. Cl

**4.** شێوگ بنووسە و بارگە پێشان بدە لە هەر یەك لەم ئایۆنانەی خوارەوەدا:
أ. ئایۆنی سۆدیۆم د. ئایۆنی نیترید
ب. ئایۆنی ئەلومنیۆم هـ. ئایۆنی ئاسن (III)
ج. ئایۆنی کلۆرید

**5.** هەریەك لەم ئایۆنانە یەك گەردیلەیانەی خوارەوە وە ناوبنێ:
أ. $K^+$ د. $Cl^-$
ب. $Mg^{2+}$ هـ. $O^{2-}$
ج. $Al^{3+}$

**6.** شێوگی ئەو ئاوێتە ئایۆنیە دوانییەی لە نێوان هەر جووتە توخمێکی خوارەوەدا پەیدا دەبێت بنووسە ( بڕوانە پرسی نموونەی 1-1 ) .
أ. سۆدیۆم و یۆد د. باریۆم و فلۆر
ب. کالیسیۆم وگۆگرد هـ. لیثیۆم و ئۆکسجین
ج. زینك و کلۆر

**7.** هەر یەك لەم ئاوێتە ئایۆنییە دوانییانەی خوارەوە ناوبنێ،( بڕوانە پرسی نموونەی 2-1 ) :
أ. KCl ج. $Li_2O$
ب. $CaBr_2$ .

**8.** شێوگ و ناوی ئەو ئاوێتانەی لەم جووتە ئایۆنانەی خوارەوە پێك دێن بنووسە:
أ. $Cr^{2+}$ و $F^-$ ج. $Fe^{3+}$ و $O^{2-}$
ب. $Ni^{2+}$ و $O^{2-}$ .

**9.** ئەو ڕەوشەی ڕێزبوونی نووسینی توخمە بەشدارەکان دیاری دەکات چییە، لەکاتی ناونان و نووسینی شێوگی ئاوێتە گەردییە دوانییەکاندا؟

**10.** ئەو ئاوێتە گەردییە دوانییانەی خوارەوە بە پێی سیستمی پێشگرەکان ناوبنێ ( بڕوانە پرسی نموونەیی 1-4 ):
أ. $CO_2$ ج. $As_2O_5$
ب. $FeS_6$

**11.** شێوگی هەریەکە لەو ئاوێتە گەردییە دوانییانەی خوارەوە بنووسە ( بڕوانە پرسی نموونەیی 1-4 ) :
أ. چوارە برۆمیدی کاربۆن
ب. دوانەئۆکسیدی سیلیکۆن
ج. دەیەئۆکسیدی چوارە فۆسفۆر

**12.** ترشە دوانی و ترشە ئۆکسجینییەکان لێك جیابکەرەوە دوو نموونە بۆ هەر یەکەیان بهێنەوە.

**13.** أ. مەبەست لە خوێ ڕوون بکەرەوە.
ب. دوو نموونە بۆ خوێیەکان بهێنەوە.

**14.** هەر یەکە لەم ترشانەی خوارەوە ناوبنێ:
أ. HF ج. $H_2SO_4$
ب. $HNO_3$ د. $H_3PO_4$

**15.** شێوگی گەردی هەریەکە لەم ترشانەی خوارەوە بنووسە:
أ. ترشی گۆگردۆز د. ترشی پێرکلۆریك
ب. ترشی کلۆریك هـ. ترشی کاربۆنیك
ج. ترشی هایدرۆکلۆریك و. ترشی سرکە ( ئەسیتیك)

**16.** هەر یەك ئەم ئایۆنانەی خوارەوە بە پێی سیستمی ستۆك ناوبنێ :
أ. $Fe^{2+}$ ج. $Pb^{2+}$
ب. $Fe^{3+}$ .

**17.** هەر یەك لەم ئاوێتە گەردییە دوانییانەی پرسی 11 بە پێی سیستمی ستۆك ناوبنێ:

**18.** شێوگی هەریەك لەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە:
أ. یۆدیدی فۆسفۆر (III)
ب. کلۆریدی گۆگرد (II)
ج. گۆگردیدی کاربۆن (IV)
د. ئۆکسیدی نیترۆجین (V)

**19.** أ. ڕوونی بکەرەوە مەبەست لە ئۆکسانە ژمارە (ژمارەی ئۆکسان) چییە؟
ب. سوودی ئۆکسانە ژمارە چییە؟

**20.** أ. مۆڵ پێناسە بکە
ب. ژمارەی تەنۆکەکانی مۆڵێك چەندە؟
ج. بە ژمارەی تەنۆکەکانی مۆڵێك دەڵێن چی؟

**21.** أ. بارستەی مۆڵی توخمێکی دیاریکراو چییە؟
ب. بارستەی مۆڵییەکان تا دوو ڕەنووسی دەیی کاربۆن و نیۆن و ئاسن و یورانیۆم بنووسە.

**22.** ئەگەر وادابنێین کە نموونەیەکی توخمێکی دیاریکراوت هەیە
أ. بارستە ئەو توخمە، کە بەگرام پێوراوە چۆن دەگۆڕێت بۆ بڕبە مۆڵ.
ب. بارستەی ئەو توخمە، کە بەگرام پێوراوە چۆن دەگۆڕێت بۆ ژمارەی ئەو گەردیلانەی کە تێیدایە.

**23.** أ. بارستەی شێوگ پێناسەبکە.

ب. بە چ یەکەیەك بارستەی شێوگ دەردەبڕدرێت؟

**24.** مەبەست لە بارستەی مۆڵی ئاوێتە چییە؟

**25.** پێوەندی نێوان شێوگی سەرەتایی و شێوگی گەردی ئاوێتەیەکی دیاریکراو چییە؟

## چەند پرسیێك

### ناونان و شێوگە کیمیاییەکان

**26.** شێوگ و بارگەی هەر یەکە لەم ئایۆنانەی خوارەوە بنووسە:

أ. ئایۆنی ئەمۆنیۆم    د. ئایۆنی فۆسفات

ب. ئایۆنی سرکات (ئەسیتات)    هـ. ئایۆنی مس (I)

ج. ئایۆنی کاربۆنات    و. ئایۆنی جیوە (I)

**27.** هەر یەك لەم ئایۆنانەی خوارەوە ناو بنێ:

أ. $ClO_3^-$    د. $NO_3^-$

ب. $OH^-$    هـ. $HCO_3^-$

ج. $SO_4^{2-}$    و. $CrO_4^{2-}$

**28.** شێوگی هەریەك لەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە:

أ. فلۆریدی سۆدیۆم    هـ. برۆمیدی ئەلومنیۆم

ب. ئۆکسیدی کالیسیۆم    و. نیتریدی لیثیۆم

ج. گۆگردیدی پۆتاسیۆم    ز. ئۆکسیدی ئاسن (II)

د. کلۆریدی مەگنیسیۆم

### ئۆکسانە ژمارەکان و سیستمی ستۆك

**29.** هەریەك لەم ئاوێتە ئایۆنییانەی خوارەوە بە پێی سیستمی ستۆك ناوبنێ:

أ. NaC l    ج. CaS

ب. KF    د. $FePO_4$

**30.** ئۆکسانە ژمارەی هەر گەردیلەیەی ئەم ئاوێتانەی خوارەوە بدۆزەرەوە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-5 ):

أ. HI    ج. KH

ب. $PBr_3$    د. $H_3PO_4$

**31.** ئۆکسانە ژمارەی هەر گەردیلەیەی ئەم ئایۆنانەی خوارەوە بدۆزەرەوە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-5 ):

أ. $NO_3^-$    ج. $Cr_2O_7^{2-}$

ب. $ClO_4^-$    د. $CO_3^{2-}$

### پەیوەندی نێوان مۆڵ و ڕێژەی سەدی پێکهاتن

**32.** (بڕوانە دوو پرسی نموونەیی 1-7و1-10 )، بارستە، لەمانەی خوارەوەدا چەند گرامە:

أ. 1.00 mol لە Al

ب. 1.00 mol لە Ca

ج. $6.022 \times 10^{23}$ گەردیلە کاربۆن C

**33.** ژمارەی مۆڵەکانی هەریەکە لەمانەی خوارەوە چەندە ( بڕوانە دوو پرسی نموونەیی 1-8، 1-9 ):

أ. $6.022 \times 10^{23}$ گەردیلە Ne

ب. $3.25 \times 10^5$ g لە Pb

**34.** ژمارەی گەردیلەکانی هەریەك لەمانەی خوارەوە، چەندە؟

أ. 1.50 mol لە Na    ب. 6.755 mol لە Pb

**35.** بارستەی هەر یەکە لە مانەی خوارەوە دیاری بکە:

أ. $3.011 \times 10^{23}$ گەردیلە F

ب. $1.50 \times 10^{32}$ گەردیلە Mg

ج. $4.50 \times 10^{12}$ گەردیلە Cl

د. 1 گەردیلە Au

**36.** ژمارەی گەردیلەکانی هەریەك لەمانە خوارەوە دیاری بکە

أ. 5.40 g لە B    ج. 1.50 g لە K

ب. 8.02 g لە S

**37.** بارستەی شێوگی هەریەکەی ئاوێتە و ئایۆنەکانی خوارەوە دیاری بکە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-6 ):

أ. کلوکۆز $C_6H_{12}O_6$    ب. ئایۆنی کلۆرات $ClO_3^-$

**38.** ژمارەی مۆڵەکانی هەر جۆرە ئایۆنێکی گەردیلەیان فرە گەردیلە لە مۆڵێکی هەر یەکە لەم ئاوێتانەی خوارەوەدا دیاری بکە:

أ. $Na_2SO_4$    ج. $(NH_4)_2SO_3$

ب. $Ca(OH)_2$    د. $Ca_3(PO_4)_2$

**39.** ژمارەی مۆڵەکانی ئاوێتەی هەر یەکە لەم نموونانەی خوارەوەدا چەندە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-13 ):

أ. 05.4 g لە $H_2O$

ب. 6.174 g لە $Ba(OH)_2$

ج. 86.921 g لە $Fe_3(PO_4)_2$

**40.** ڕێژەی سەدیی پێکهاتنی هەر یەکە لەم ئاوێتانەی خوارەوە دیاری بکە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-14 ) :

أ. NaCl

ب. $AgNO_3$

ج. $Mg(OH)_2$

**41.** ڕێژەی بارستەی ئاو لە $CuSO_4 \cdot 5H_2O$ دا دیاری بکە (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-15) :

**42.** شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك بدۆزەرەوە کە 63.50 % Ag و 8.25 % N ئەوەی تریشی ئۆکسجین بێت (بڕوانە پرسی نموونەیی 1-16) :

**43.** شێوگی سەرەتایی ئاوێتەیەك دیاری بكە، كە C 52.11% و H 13.14% و O 34.75% بێت.

**44.** شێوگی گەردی گەردێك بدۆزەرەوە، كە شێوگە سەرەتاییەكەی $CH_2O$ بێ و بارستەی مۆلییەكەی 120.12 g/mol بێت.

**45.** ئاوێتەیەك، بارستەی شێوگەكەی 42.08 amu بێت، بینرا كە بارستەییانە لە C 85.64% و H 14.36% پێكهاتووە، شێوگی گەردییەكەی بدۆزەرەوە

## پێداچونەوەی هەمەجۆر

**46.** شیكاری كیمیایی ترشی ستریك (ترشی لیمۆ) دەری خست، كە C 37.51% و H 4.20% و O 58.29% بوو، شێوگی سەرەتاییەكەی چییە؟

**47.** بارستەی هەریەكە لەم نموونانە چەندگرامە؟

أ. 1.000 mol لە NaCl  ب. 2.000 mol لە $H_2O$

**48.** بارستەی شێوگ و بارستەی مۆڵی هەریەك لەم دوو ئاوێتەیەی خوارەوە چەندە؟

أ. $XeF_4$  ب. CuCN

**49.** هەر یەك لەم ترشانەی خوارەوە، ناو بنێ و ئۆكسانە ژمارەی گەردیلەكان لە هەر یەكەیاندا دیاری بكە:

أ. $HNO_2$  ج. $H_2CO_3$

ب. $H_2SO_3$  د. HI

**50.** ڕێژەی سەدی پێكهاتنی ئەم دوو ئاوێتەیە دیاری بكە:

أ. NaClO  ب. $C_2H_5COOH$

**51.** هەر یەك لەم ئاوێتە دوانییانەی خوارەوە ناو بنێ :

أ. $MgI_2$  ج. $CS_2$

ب. NaF  د. $N_2O_4$

**52.** نموونەی ئاوێتەیەك، بارستەكەی 175.0 g بوو، g 56.15 C و g 9.43 H و g 74.81 O و g 13.11 N و g 21.49 ی Na ی تێدابوو، شێوگی سەرەتایی ئەم ئاوێتەیە چییە؟

## بیركردنەوەی ڕەخنەسازانە

**53.** شیكردنەوەی زانیارییەكان: نموونەیەكی نیكلی خاوێن لە تاقیگە دانرا، لە بۆتەیەكی كێشراو و پاك ووشكدا، ئەوجا بۆتەكە گەرم كرا بە جۆرێك كە نیكلەكە لەگەڵ ئۆكسجینی هەوا كارلێك بكەن، یەكسەر لەگەڵ تەواوبونی كارلێكدا، بۆتەكە ساردكرایەوە و بارستەكەی دیاری كرا، بۆتەكە گەرم كرایەوە و ساردكرایەوە و بارستەكەی دیسان دیاری كرایەوە بۆ دڵنیابوون لە تەواوبوونی كارلێككە و ئەم زانیارییانەمان دەست كەوت:

بارستەی بۆتەكە = 30.02 g

بارستەی نیكل و بۆتەكە = 31.07 g

بارستەی ئۆكسیدی نیكل و بۆتەكە = 31.36 g

بەپێی ئەم زانیارییانە، هەریەكە لەم بارستانەی خوارەوە چەند گرام دەبن:

بارستەی نیكل

بارستەی ئۆكسیدی نیكل

بارستەی ئۆكسجین

بەپێی ژمارکارییەکانت، شێوگی سەرەتایی ئۆكسیدی نیكل چی یە؟

## توێژینەوەو نووسین

**54.** **ماددە كمیاییە دەستاو دەستكردووەكان**: ناوی كیمیایی زانستی بدۆزەرەوە و شێوگی كیمیایی هەر یەكە لەو ئاوێتە دەستا و دەستكردووەی خوارەوە بنووسە، ئەوجا بەدوای بەكارهێنان و كار پێكردنە ژیانییەكاندا بگەڕێ:

أ. سۆدەی نانكردن  د. بەردە قسڵ

ب. شیری مەگنیسیا  هـ. داخە سۆدا

ج. خوێی ئێپسۆم  و. كهولی تەختە.

## بریتییە هەڵسەنگاندن

**55.** **هەڵسەنگاندنی ڕاییكاری**: وماموستاكەت كارتێكت دەداتێ شێوگێك لەمانەی لێ نووسراوە: $CH_3COONa{\cdot}3H_2O$، $MgSO_4 . 7H_2O$ ، $C_2H_3O_2Li{\cdot}2H_2O$ ،$MgCl_2{\cdot}6H_2O$ نەخشەی تاقیكردنەوەیەك بكێشە بۆ دیاریكردنی ڕێژەی بارستەی ئاو لەو ئاوە خوێ (هایدرات) ە دا كە داویانیوتێ، دڵنیابە لە لێكدانەوەی ئەو قۆناغانەی پێڕەوی دەكەیت تاكو دڵنیاببیت كە خوێیەكە تەواو وشكە، ئەگەر مامۆستاكەت نەخشەكەتی پەسندكرد، خوێیەكە وەربگرە و تاقیكردنەوەكە جێبەجێ بكە،ڕێژەی سەدی ئەو ئاوەی لە خوێیەكەدا هەبووە بدۆزەرەوە و چەندە؟

**56.** هەر یەك لە ئەمۆنیا $NH_3$ و نیتراتی ئەمۆنیۆم $NH_4NO_3$ ، لەپەینەمەنییدا وەك سەرچاوەی نیترۆجین بەكاردێن، كامیان ڕێژەیەكی سەدی زۆرتر نیترۆجینیان تێدایە، لە ڕەوشە فیزیاییەكانی دوو ئاوێتەكە بكۆڵەرەوە و فێری ڕێگەی دروستكردن و بەكارهێنانی هەر یەكەیان ببەو، هۆی تایبەتمەندی كارپێكەریی هەر ئاوێتەیەكیان ڕاڤە بكە ( بەڕەچاوكردنی هۆكارەكانی تێچوونی كەرەسەی خاو، و ئاسانیی دروستكردن و تێچوونی باركردن و شتی تریش....).

## پرۆژەیەكی زانستی

**57.** بەشێوەی هەرەوەزكاری و، بە هاوئاهەنگی لەگەڵ مامۆستاكەت ئەم پرۆژە زانستییەی خوارەوە جێبەجێ بكە: «بەدواداچونی باشی ئاو لە چەند نموونەیەكی جیاوازی دەوروبەرەكەت»

بەندی 2

# هاوکێشە و کارلێکە کیمیاییەکان



پەیدابوونی ڕووناکی و گەرمی نیشانەی ڕوودانی کارلێکی کیمیاییە

کەرتی 2-1

# وەسفی کارلێکە کیمیاییەکان

## ئاماژەکانی جێبەجێکردن

- نیشانەی ڕێنماکانی ڕوودانی کارلێکی کیمیایی دەدۆزێتەوە.
- مەرجە پێویستەکانی نووسینی هاوکێشەیەکی کیمیایی دروست، دیاری دەکات.
- هاوکێشەی کارلێکی کیمیایی دیاریکراو بە شێوگ دەنووسرێت.
- هاوکیشەی کیمیایی (بەهەولی گەیشتنە ڕاستی )دەپیوێت.

کارلێکی کیمیایی، کردەیەکە، ماددەیەك یان زۆرتری تێدا دەگۆردرێت بۆ ماددەیەکی نوێ یان زۆرتر، بەمادده بەشدارەکانی کارلێکی کیمیایی دەڵێن کارلێککردووەکان بەڵام بەمادده پەیدابووەکان دەڵێن «بەرهەمهاتووەکان» و بەپێی یاسای پاراستنی بارستە، کۆی بارستەی ماددە کارلێککردەکان یەکسانە بە کۆی بارستەی ماددە بەرهەمهاتووەکان لە کارلێکردنێکی کیمیاییدا.

کارلێکی کیمیایی، بە **هاوکێشەی کیمیایی chemical equation** دور دەردەبردرێت و، **نواندنێکە بە هێما و شێوگی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان و برە ڕێژەییەکانیان لە کارلێکەکەدا.** بۆ نموونە، ئەم هاوکێشە کیمیاییەی کە دێت، دەری دەخات کە کارلێککردووی دوانە کرۆماتی ئەمۆنیۆم ئەم بەرهەمانە پێك دێنێت نیترۆجین، ئۆکسیدی کرۆم (III) ، ئاو

$$(NH_4)_2Cr_2O_7(s) \rightarrow N_2(g) + Cr_2O_3(s) + 4H_2O(g)$$

شێوە 2-1 ئەم کارلێکە گەرمی دەرە exothermic reaction پێشان دەدات.

## نیشانەکانی ڕوودانی کارلێکی کیمیایی

بۆ دڵنیا بوونی لە ڕوودانی هەر کارلێکێکی کیمیایی، پێویستە بەڵگەیەك هەبێت کە بیسەلمێنی ماددەیەك یان زۆرتر گۆڕدراون ئەمەیش پێویستی بە شیکاریی کیمیایی بەرهەمهاتووەکان هەیە، بەڵام گۆڕانی ئاسایی هەستپێکراو هەیە ڕەنگە نیشانەی ڕوودانی کارلێکی کیمیاییبن وەك ئەمانە:



**شێوە 2-1** کردەی شیبوونەوەی دوانە– کرۆماتی ئەمۆنیۆم بەخێرایی تەواو دەبێت و وزە دەردەپەڕێت بەشێوەی ڕووناکی و گەرمی.

1. **پەیدابوونی ڕووناکی و گەرمی** : هەر گۆڕانێك لە ماددەدا، وزەی گەرمی وزەی ڕووناکی دەردەپەڕێنیت، بەڵگەیەکی بە هێزی ڕوودانی کارلێکی کیمیایی دیاریکراوە، بۆ نموونە، لێکهەڵوەشانی دوانە کرۆماتی ئەمۆنیۆم، پەیدابوونی ڕووناکی و گەرمییەکی زۆری لەگەڵدا دەبێت، وەك لە شێوەی 2-1 دا دەبینین. کارلێکی کیمیایی نێوان گازی سروشتی و ئۆکسجین، کە لە داگیرساندنی گازی بۆ چێشت لێنان تەرخانکراو لە ماڵەکاندا، ڕوودەدات، نموونەیەکی تر، هەندێ کارلێك یان گەرمی دەردەپەڕێنێ یان ڕووناکی، هەر یەکە بە جیا، مەرج نییە نیشانەی ڕوودانی کارلێکێکی کیمیایی بێت، چونکە زۆر گۆڕانی فیزیایی ڕووناکی یان گەرمی دەردەپەڕێنێت.
2. **بەرهەمهێنانی گاز**: پەیدابوونی بڵقی گاز لە کاتی یەکگرتنی دوو ماددەی دیاریکراودا، بەزۆری نیشانەی ڕوودانی کارلێکی کیمیاییە، بۆ نموونە کارلێکردنێکی توند ڕوودەدات کاتێك سۆدەی نانکردن و سرکە تێکەڵ دەکرێن و بڵقی گازی دوانۆکسیدی کاربۆن پەیدادەبێت، وەك شێوە 2-2 ( أ ) ڕوونی دەکاتەوە.
3. **پەیدابوونی نیشتوو** : زۆر کارلێکی کیمیایی هەیە کە لە نێوان گیراوەی ماددە لە ئاودا تواوەکاندا ڕوودەدەن، ئەو ڕەقەی لە کاتی تێکەڵکردنی دوو گیراوەدا پەیدا دەبێت، بەڵگەی ڕوودانی کارلێکی کیمیاییە **ئەو ڕەقەی لە کارلێکی کیمیایی پەیدا دەبێت لە کاتی تێکەڵکردنی دوو گیراوە لە گیراوەیەکی دیاریکراودا، لە گیراوەکە جیا دەبێتەوە و پێی دەڵێن نیشتوو precipitate.** شێوە 2-2 (ب) کارلێکێك ڕوون دەکاتەوە کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی نیشتوو.

**شێوە 2-2** ( أ ) بەوەدا دەزانرێت سرکە لەگەڵ سۆدەی نانکردندا کارلێك دەکەن، بڵقی گازی دوانۆکسیدی کاربۆن پەیدا دەبێت (ب) کاتێك ئاوە گیراوەی گۆگردیدی ئەمۆنیۆم و نیتراتی کادمیۆم کارلێك دەکەن، نیشتوویەکی زەردی گۆگردیدی کادمیۆم پێك دێت.


( أ )


( ب )

**4. گۆڕانی ڕەنگ:** بەزۆری هەر گۆڕانێکی ڕەنگ نیشانەی ڕوودانی کارلێکی کیمیاییە.

## مەرجەکانی نووسینی هاوکێشەی کیمیایی

دەتوانرێت هەر هاوکێشە کیمیایی بە شێوەیەکی ڕاست نووسراو، هەر گۆڕانێکی کیمیایی ڕووداو و کورت بکاتەوە و ئەم مەرجانەی خوارەوە یارمەتیت دەدات کە هاوکێشەی کیمیایی بەڕاستی بنووسرێت و بخوێنرێتەوە:

1. **پێویستە هاوکێشە، ڕاستیی زانراو پێشان بدات** : هەموو ماددە کارلێك کردوو و بەرهەمهاتووەکان ڕوون و ناسراوبن، لەڕێی شیکردنەوەی کیمیاییەوە لە تاقیگەدا، یان لەو سەرچاوانەوەك ئەنجامی تاقیکردنەوەکان پێشان دەدات.

2. **پێویستە هاوکێشە، شێوگە ڕاستەکانی کارلێککردوو و بەرهەمهاتووەکانی تێدابێت**، زانینی بارە باوەکانی ئۆکسانی توخمەکان و زانینی چۆنێتی نووسینی شێوگەکان، یارمەتی زانینی شێوگە کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان دەدات، لە بیرت بێ توخمە ناسراوەکانی خشتەی 2-1 بە شێوەی گەردی دوو گەردیلەیی هەن، وەك $H_2$ و $O_2$، هەریەك لەو توخمانە، لە ڕێی شێوگی گەردییەکەیەوە بەشداری دەکات، توخمی تریش هەیە لە باری سەرەتاییدان ( توخمی )، کە بەزۆری و سادەیی بە هێمای گەردیلەکانییان دەنووسرێن، بۆ نموونە، ئاسن بە Fe و کاربۆن بە C و، هیچ ژێرە ژمارەیان لەگەڵ نانووسرێت چونکە توخمەکانی پێکهاتەی گەردی دیاریکراو پێك ناهێنن، بەڵام دووباری نائاسایی هەیە کەلەم ڕێسایە لا دەدەن، ئەوانیش گۆگرد فۆسفۆرن کە بە شێوەی $S_8$ و $P_4$ دەنووسرێن.

3. **پێویستە یاسای پاراستنی بارستە بێتە دی**، گەردیلەکان دروست ناکرێن و لە ناو ناچن لە کارلێکە کیمیاییە ئاساییەکاندا، بۆیە پێویستە ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمێك لە هەر دوو لای هاوکێشە کیمیاییەکاندا ڕاست و تەواو بێت بۆ ئەوەی ژمارەی گەردیلەکانی توخمەکان لە هەردوو لای هاوکێشەکە یەکسان بێت، دەبێت هاوکۆلکەی گونجاو بخرێتە سەریان لە هەر کوێیەکدا پێویست بوو. مەبەست لە هاوکۆلکە **coefficient** ، ڕەنووسێکی بچووك و تەواوە لە بەر دەمی شێوگەکەدا (واتە لە پێشەوە) دادەنرێت لە هاوکێشەی کیمیاییدا، و هاوکۆلکەی شێوگ، ژمارەی مۆڵە ڕێژەییەکانی ماددەکە دیاری دەکات ئەگەر ئەم هاوکۆلکەیە نەنوسرا مانای وایە دەکاتە 1 ، هاوکۆلکەی 4 لەو هاوکێشەیەی کە لاپەرە 47 دا نووسراوە نیشانەی ئەوەیە کە چوار مۆڵ ئاو پەیدادەبێت و مۆڵێك لە هەریەك لە نیترۆجین و ئۆکسیدی کرۆمی (III) ی .

خشتە 1-2 ئەو توخمانەی بەشێوەی گەردی دوو گەردیلەیی هەن.

| ناوی توخم | هێما | شێوگی گەردی | باری دۆخی فیزیایی لە پلەی گەرمی ژووردا |
|---|---|---|---|
| هایدرۆجین | H | $H_2$ | گاز |
| نایترۆجین | N | $N_2$ | گاز |
| ئۆکسجین | O | $O_2$ | گاز |
| فلۆر | F | $F_2$ | گاز |
| کلۆر | Cl | $Cl_2$ | گاز |
| برۆم | Br | $Br_2$ | شل |
| یۆد | I | $I_2$ | ڕەق |

## هاوکێشەی بە شێوگ (شێوگە هاوکێشە)

یەکەم هەنگاو لە نووسینی هاوکێشەی کیمیاییدا، دیاری کردنی ئەو ڕاستیە زانستییانەن کە دەریان دەبڕن ، هەندێ جار بەسوودە ئەگەر هاوکێشەکان بە وشە بنووسرێن **word equation** **مەبەست لەوەش ئەو هاوکێشەیەکە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکانی بە وشە دەربڕدرابن، وشە هاوکێشە، تەنیا یەك واتای وەسفی هەیە، چونکە بڕی کارلێککردوە بەکارهێنراوەکان و ئەو بەرهەمهاتوانەیش کە دەست دەکەون نادەن، بۆ نموونە، کارلێککردنی میثان (پێکهاتنی سەرەکیی گازی سروشتی) لەگەڵ ئۆکسجین، کاتێك میثان لە هەوادا** دەسووتێ، لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرێت و دوانۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو پێك دێت لەم کارلێکەدا میثان ئۆکسجین کارکردوو دەنوێنن و دوانۆکسیدی کاربۆن و ئاو بەرهەم دەنوێنی.

هەنگاوی دوای ئەو لە نووسینی هاوکێشەی کیمیایی ڕاستدا، نووسینی هێما و شێوگی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکانە، میثان ئاوێتەیەکی گەردییە، لە گەردیلەیەك کاربۆن و چوار گەردیلە هایدرۆجین پێك دێت و شێوگی کیمیاییەکەی $CH_4$ ە و، لەبەر ئەوەی ئۆکسجین لە سروشتدا بە شێوەی گەردی دوو گەردیلە $O_2$ هەیە و شێوگە ڕاستیەکانی دوانۆکسیدی کاربۆن و ئاو و یەك بەدوای یەك بەم جۆرەن: $CO_2$ و $H_2O$ **هاوکێشە بەشێوگ** (شێوگە هاوکێشە) **formula equation** **خوێ دەنوێنێت و بە شێوگی کارلێکی کیمیایی، و هێمایەکانی و کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکانی** و بەوپێیە شێوگە هاوکێشەی کارلێکی میثان وئۆکسجین وەك خوارەوە دەنووسرێت:

$$CH_4(g) + O_2(g) \rightarrow CO_2(g) + H_2O(g)$$ (هاوکێشە هاوسەنگ نی یە)

$(g)$ ی پاش هەر شێوگێك نیشانەی ئەوەیە کە ئەو ماددەیە لە دۆخی گازیدایە (gas) ، شێوگە هاوکێشە وەکو وشە هاوکێشە، واتای چۆنەکی و وەسفی هەیە و، زانیاری دەربارەی بڕە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان نادەن

شێوگە هاوکێشە، دوو لە سێ مەرجی پێویستی نووسینی هاوکێشەی کیمیایی ڕاستی تێدایە، و ڕاستی دەنوێنێ و هێما و شێوگی. ڕاستی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان دەردەخات.

بۆ کۆتایی پێهێنانی کردەی نووسینی هاوکێشەیەکی ڕاست، پێویستە یاسای پاراستنی بارستە ڕەچاوبکرێت بە چاکسازی بڕی مادده کارلێککردوو بەرهەمها تووه ڕێژەییەکان  کە لە هاوکیشەکەدا هەن بۆ ئەوەی ژمارەی گەردیلەکان و جۆرەکانیان لە هەردوولای هاوکێشەکە چونیەك بن و بەم کردەیە دەڵێن هاوسەنگکردنی هاوکێشە، کە بەخستنە ناوی هاوکۆلکەی گونجاو تەواو دەبێت، کە هاوسەنگکردنە کە تەواو دەبێت. شێوگە هاوکیشە، هاوکێشەیەکی کیمیایی بە شێوەیەکی ڕاست نووسراوە دیسان سەرنجی شیوگە هاوکێشەی کارلێکی میثان و ئۆکسجین بدە:

$$CH_4(g) + 2O_2(g) \rightarrow CO_2(g) + 2H_2O(g)$$ (هاوکێشەی هاوسەنگ)

شێوە 2-3 گوزارشت لەو کارلێکە دەکات.




**شێوە 2-3** ( أ ) میثان لەگەڵ ئۆکسجینی هەوا لە گڕی بەنزیندا یەك دەگرن و، دوانۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو پێك دێنن. (ب) کارلێکەکە بە نموونەی گەردی، یان هاوکێشەی هاوسەنگ خۆی دەنوێنێ و هەردووکیان دەری دەخەن کە ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمێك لە کارلێککردووەکاندا یەکسانە بە ژمارەی هەمان توخم لە بەرهەمهاتووەکاندا.

## ئەو هیمایانەی تر، کە لە هاوکێشە کیمیاییەکاندا بەکاردێن

خشتەی 2-2 ، هێما زۆرتر بەکارهێنراوەکان لە هاوکێشە کیمیاییەکاندا، دیاری دەکات، هەندێ جار، بەرهەمی گاز بە تیرێکی سەرەوژوور هێمادەکرێت، ↑ لە جیاتی هێمای ($g$) ، وەك لە خشتەکەدا پێشان دراو، هەندێ جاریش تیرێکی سەرە و خوار ↓ بەکاردێت بۆ پێشاندانی پەیدابوونی نیشتوویەك لە کاتی ڕوودانی کارلێکێکی کیمیایی لە گیراوەیەکدا.

ئەو مەرجانەی کە کارلێکێکی پێ ڕوودەدات، بەزۆری بەدانانی زانیارییەتایبەتەکان، لەسەر یان لەژێر تیری کارلێکدا ڕوون دەکرێتەوە وشەی گەرمی، بە پیتی یۆنانی گەورە، دەلتا ($\Delta$) هێما دەکرێت، بۆ ئەوەی پێشانی بدەین کە پێویستە کارلێککردووکان گەرم بکرێن و، هەندێ جاریش ئەو پلە گەرمییەی کارلێکەکەی تێدا ڕوودەدات لەسەر تیرەکە دەنووسرێت، لە هەندێ کارلێکدا، گرنگە ئەو پەستانە دیاری بکرێت کە کارلێکەکەی تێدا ڕوودەدات، یان ڕوون بکرێتەوە کە پەستان، لە پەستانی کەشی ئاسایی زۆرترە، دەتوانرێت، هەندێ کارلێك خێرا بکرێت و، لە پلەی گەرمی نزمتردا ڕوو‌بدات بەبوونی هاندەرێك، هاندەریش *catalyst* ماددەیەکە خێرایی کارلێکێکی کیمیایی دیاریکراو دەگۆڕێت، دەیشتوانرێت بگێڕدرێتەوە ( دەست بخرێتەوە ) بێئەوەی بگۆڕدرێت و، بۆ ئەوەی ببینین کە هاندەر بەکارهێنراوە، شێوگەکەی یان ناوەکەی لەسەر تیری کارلێك دەنووسین.

**خشتە 2-2** ئەو هێمایانەی لە هاوکێشە کیمیاییەکاندا بەکاردێن.

| هێما | ڕاڤە |
|---|---|
| $\rightarrow$ | (پەیدا دەبێت) و، ئەنجامی کارلێکەکە پێشان دەدات. |
| $\leftrightarrows$ | لە شوێنی یەك تیر بەکاردێت کارلێکی پێچەوانەیی پێشان دەدات. |
| $(s)$ | کارلێککردوو یان بەرهەم لە دۆخی ڕەقداو. وەهەروەها نیشتووش پێشان دەدات |
| $\downarrow$ | شوێنی $(s)$ دەگرێتەوە، بەڵام تەنیا بۆ نیشتوو بەکاردێت. |
| $(l)$ | کارلێککردوو یان بەرهەمهاتوو لە دۆخی شلی یە. |
| $(aq)$ | ئاوە گیراوەی کارلێکردوو یان بەرهەمهاتوو. |
| $(g)$ | کارلێککردو یان بەرهەمهاتووی گاز. |
| $\uparrow$ | شوێنی گاز دەگرێتەوە $(g)$ ، بەڵام تەنیا بۆ بەرهەمە گازییەکان بەکاردێت نەك کارلێکردوو. |
| $\xrightarrow{\Delta}$ یان $\xrightarrow{\text{گەرمی}}$ | کارلێککردووەکان گەرم کراون ( کارلێکێك پێویستی بە گەرمی هەیە) |
| $\xrightarrow{2\ atm}$ | ئەو پەستانەی کارلێکەکەی تێدا ڕوودەدات. |
| $\xrightarrow{\text{پەستان}}$ | ئەو پەستانەی کارلێکەکەی تێدا ڕوودەدات و لە پەستانی ئاسایی تێ دەپەڕێت |
| $\xrightarrow{0^oC}$ | ئەو پلە گەرمییەی کارلێکی تێدا ڕوودەدات، لێرەدا $0^oC$ یە. |
| $\xrightarrow{MnO_2}$ | شێوگی هاندەر و، لەم بارەدا دوانۆکسیدی مەنگەنیز بەکاردەهێنرێت بۆ خێراکردنی کارلێکەکە. |

لە زۆر کارلێکدا، کە بەرهەمهاتووەکان پەیدابوون، دەست دەکەن بە کارلێککردن لەگەڵ یەکتردا و سەر لە نوێ کارلێکردووەکان پێك دەهێنینەوە واتە دەشێ کارلێکی پێچەوانەیش ڕووبدات، **کارلێکی پێچەوانەیی reversible reaction کارلێکێکی کیمیاییەکە ماددە بەرهەمهاتووەکان دەتوانن ماددە کارلێککردووە سەرەتاییەکان پێك بهێننەوە**، پێچەوانەیێتی کارلێکێکی دیاریکراو، بە نووسینی دوو تیری ئاراستە پێچەوانەی هەردوو بەری هاوکێشەکە دەردەبڕدرێت، بۆ نموونە، کارلێکی پێچەوانەیی نێوان ئاسن و هەڵمی ئاو وەك خوارەوە دەنووسرێت.

$$3Fe(s) + 4H_2O(g) \leftrightarrows Fe_3O_4(s) + 4H_2(g)$$

بە زانینی هەموو هێما و شێوگە بەکارهێنراوەکان، دەتوانرێ هەر هاوکێشەیەکی کیمیایی بە ڕستەیەك دەربڕدرێت، بۆ نموونە، هاوکێشەی ئەو کارلێکەی خوارەوە:

$$2HgO(s) \xrightarrow{\Delta} 2Hg(l) + O_2(g)$$

دەتوانرێت بەم ڕستەیە گوزارشتی لێ بکرێت: « لەکاتی گەرمکردنی ئۆکسیدی جیوە (II) ی ڕەق، جیوەی شل و گازی ئۆکسجینمان دەست دەکەوێت »

لەلایەکی ترەوە، دەتوانرێت هاوکێشەیەکی کیمیایی بنووسرێت لە ڕستەیەکەوە کە وەسفی کارلێکێکی کیمیایی دەکات، بۆ نموونە ئەم ڕستەیەی خوارەوە:
«گازی ئیثین و هایدرۆجین، لە ژێر پەستانێکی دیاریکراودا، یەکدەگرن و بە بوونی پلاتین وەك هاندەرێك و گازی ئیثان پێك دێنن» ئەم ڕستەیە دەگۆڕدرێت بۆ ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە.

$$C_2H_4(g) + H_2(g) \xrightarrow[Pt]{پەستان} C_2H_6(g)$$

هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ، بە زۆری هێماکانی دۆخی فیزیایی $(s ,l ,g ,aq)$ کە لە خشتەی 2-2 دا باس کراون دەگرنە خۆیان.

**پرسی نموونەیی 1-2**

**شێوگە هاوکێشەی ئەو کارلێکە کیمیاییە بنووسە، کە لەکاتی تواندنەوەی ئۆکسیدی کالیسیۆم (قسڵ) ی ڕەق لە ئاودا ڕوودەدات بۆ پێکهێنانی هایدرۆکسیدی کالیسیۆم، ئەوجا هێماکانی دۆخی فیزیایی لەو هاوکێشەیەدا بکاربهێنە.**

**شیکاری**

لێرەدا ماددە کارلێکردووەکان، ئۆکسیدی کالیسیۆم و ئاو و ماددەی بەرهەمهاتوو، هایدرۆکسیدی کالیسیۆمە و هاوکێشەکە بەم شێوگانە دەردەبڕێت:

$$CaO + H_2O \rightarrow Ca(OH)_2$$ (هاوسەنگ)

بە خستنە سەری هێماکانی دۆخی فیزیایی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان، هاوکێشەکە وەك خوارەوەی لێ دێت:

$$CaO(s) + H_2O(l) \rightarrow Ca(OH)_2(aq)$$ (هاوسەنگ)

**پرسی نموونەیی 2-2**

**ئەم هاوکێشە کیمیاییەی خوارەوە بەڕستەیەك یان زۆرتر دەرببڕە:**

$$\mathbf{PbCl_2(aq) + Na_2CrO_4(aq) \rightarrow PbCrO_4(s) + 2NaCl(aq)}$$

**شیکاری**

هەموو کارلێککردوویەك ئاوێتەیەکی ئایۆنییە، کارلێکردووەکان هەردووکیان لە ئاوەگیراوەیەکدان،لەم کارلێکە، بەرهەمێکی نیشتوو ئەوی تریان لە ئاودا تواوە پێك دێت، بەوەیش هاوکێشەکە بەمەی کە دێت گوزارشتی لێ دەکرێت (دەردەبڕدرێت): « ئاوە گیراوەی کلۆریدی قورقوشم (II) و کرۆماتی سۆدیۆم لە ئاودا تواوە، کارلێك دەکەن، لە کارلێککردنیاندا، نیشتووی کرۆماتی قورقوشم (II) و کلۆریدی سۆدیۆمی لە ئاودا تواوە، لە ئاوە گیراوەکەدا پێك دێت».

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** شێوگە هاوکێشە،لەگەڵ خستنەسەری باری فیزیایی بنووسە:

أ. مەگنیسیۆمی ڕەق لەگەڵ گیراوەی ترشی گۆگردیك کارلێك دەکەن، بۆ پێکهێنانی گازی هایدرۆجین و گیراوەی گۆگرداتی مەگنیسیۆم.

ب. گیراوەی برۆمیدی پۆتاسیۆم و نیتراتی زیو کارلێك دەکەن و گیراوەی نیتراتی پۆتاسیۆم نیشتووی برۆمیدی زیو پێك دێت.

وەڵامەکان:

**1.** أ. $Mg(s) + H_2SO_4(aq) \rightarrow MgSO_4(aq) + H_2(g)$

ب. $KBr(aq) + AgNO_3(aq) \rightarrow KNO_3(aq) + AgBr(s)$

**2.** ئەم هاوكیشە كیمیاییانەی خوارەوە بگۆڕە بۆ ڕستە:

أ. $CS_2(l) + 3O_2(g) \rightarrow CO_2(g) + 2SO_2(g)$

ب. $NaCl(aq) + AgNO_3(aq) \rightarrow NaNO_3(aq) + AgCl(s)$

وەڵامەكان:

**1.** أ.شلی دوانە گۆگردیدی كاربۆن لەگەڵ گازی ئۆكسجین كارلێكیان كرد بۆ پێكهێنانی گازی دوانۆكسیدی كاربۆن و گازی دوانۆكسیدی گۆگرد.

ب. ئاوە گیراوەی كلۆریدی سۆدیۆم و ئاوە گیراوەی نیتراتی زیو كارلێك دەكەن و گیراوەی نیتراتی سۆدیۆم و نیشتووی كلۆریدی زیو پێك دێنن.

## واتای هاوكێشەی كیمیایی

هاوكێشە كیمیاییەكان، سوودێكی زۆریان هەیە لە بواری بڕە كیمیادا، با لە هەندێك لەم بڕە زانیارییانە ورد ببینەوە، كە لە هاوكێشەی كیمیایی دەست دەكەون:

**1.** **هاوكۆلكەكانی كارلێكی كیمیایی، بڕە ڕێژەییەكانی هەریەك لە كارلێككردوو وە بەرهەمهاتووەكانمان پێشان دەدەن**، هاوكێشەی كیمیایی، بە زۆری بچووكترین ژمارەی ئەو گەردیلە یان گەرد یان ئایۆنانە مان پێشان دەدەن، كە یاسای پاراستنی بارستە دەهێننەدی لە كارلێكردنێكی دیاریكراودا.

با بۆنموونە هاوكیشەی پەیدابوونی كلۆریدی هایدرۆجین لە كلۆر و هایدرۆجین وەربگرین:

$$H_2(g) + Cl_2(g) \rightarrow 2HCl(g)$$

هاوكیشەكە پێشانی دەدات كە گەردێك هایدرۆجین لەگەڵ گەردێك كلۆر كارلێك دەكەن بۆ پێكهێنانی دوو گەرد كلۆریدی هایدرۆجین و بەوەیش هاوكێشەكە ڕێژە گەردییەكانی كارلێككردوو بەرهەمهاتووەكان دەدات: بەم شێوەیە

گەردێك $H_2$ :گەردێك $Cl_2$ :دوو گەرد $HCl$

ئەم ڕێژانە، ئەو بڕە ڕێژەییانە دەردەخەن، كە بچووكترین ڕێژەی كارلێككردوو بەرهەمهاتووەكانە و، بۆ ئەوەی بڕی ڕێژەیی گەورەترمان دەست بكەوێت، هەموو هاوكۆلكەكان لەگەڵ هەمان ژمارە لێك دەدەین، و بەمجۆرە دەڵێین 20 گەرد هایدرۆجین و 20 گەرد كلۆر كارلێك دەكەن بۆ پێكهێنانی 40 گەرد كلۆریدی هایدرۆجین، هەروەها دەتوانین بە بڕی مۆڵ گوزارشت لە كارلێكەكە بكەین و بڵێین: 1 mol گەردی هایدرۆجین لەگەڵ 1 mol گەردی كلۆر كارلێك دەكەن و 2 mol گەردی كلۆریدی هایدرۆجین پێك دێنن.

**2.** دەتوانرێت، **بارستەی ڕێژەیی كارلێكردوو بەرهەمهاتووەكانی هەر كارلێكێك، دیاری بكەین بە پێی هاوكۆلكەكانی كارلێك** بڕوانە (شێوەی 1-4 ) ی لاپەڕە 28 كە ڕوونی دەكاتەوە دەتوانین ژمارەی مۆڵەكان بگۆڕین بۆ بارستە بە گرام، بە لێكدانی مۆڵەكان لە بارستەی مۆڵی گونجاو ، 1 mol هایدرۆجین، وەك زانراوە، لەگەڵ 1 mol مۆڵ كلۆر، كارلێك دەكەن و2 mol كلۆریدی هایدرۆجین، پێك دێنن و دەتوانرێت بارستەی ڕێژەیی كارلێككردوو بەرهەمهاتووەكان وەك خوارەوە بدۆزیتەوە:

$$1\ \text{mol}\ H_2 \times \frac{2.02\ \text{g}\ H_2}{\text{mol}\ H_2} = 2.02\ \text{g}\ H_2$$

$$1\ \cancel{mol\ Cl_2} \times \frac{70.90\ g\ Cl_2}{\cancel{mol\ Cl_2}} = 70.90\ g\ Cl_2$$

$$2\ \cancel{mol\ HCl} \times \frac{36.46\ gHCl}{\cancel{mol\ HCl}} = 72.92\ g\ HCl$$

هاوکێشەی کیمیایی دەری دەخات کە 2.02 g هایدرۆجین لەگەڵ 70.90 g کلۆر کارلێك دەکەن و 72.92 g کلۆریدی هایدرۆجین پێك دێنن.

**3. بۆ کارلێکی پێچەوانە، لە هاوکێشەی کیمیاییدا، هەمان بڕی ڕێژەیی ئەو مادانەن، کە لە کارلێکی ڕاستەوانەدا هەن،** چونکە هاوکێشەی کیمیایی لە هاوکێشەی جەبری دەچێت و، نیشانەی یەکسانی بە هەردوولادا دەخوێندرێتەوە، لە کاتی خوێندنەوەی هاوکێشەی پەیدابوونی کلۆریدی هایدرۆجیندا، کە لە شێوەی 2-4 دا ڕوون کراوەتەوە لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەبینیت دوو گەرد کلۆریدی هایدروجین لێك هەڵدەوەشێن بۆ پێکهێنانی گەردێك هایدرۆجین و گەردێك کلۆر هەر بەو شێوەیەش، (72.92 g) 2mol کلۆریدی هایدرۆجین، 1mol(2.02g) هایدرۆجین 1 mol (70.90 g) کلۆر پێك دێنێت.

هاوکێشە کیمیاییەکان هیچ زانیارییەك دەربارەی خێرایی کارلێکەکان یان چۆنییەتی پەیوەندیی نێوان گەردیلە و ئایۆنەکان نادات لە کاتی کارلێکەکەدا.

**شێوە 4-2** دەتوانرێت کارلێکی هایدرۆجین لەگەڵ کلۆر بۆ پێکهێنانی کلۆریدی هایدرۆجین، بەچەند ڕێگەیەك پێشان بدرێت.




## کێشانی (هاوسەنگکردنی) هاوکێشە کیمیاییەکان

زۆربەی ئەو هاوکێشانەی لەم بەندەدا باس کراون، دەتوانرێت بە سەرنجی ڕاستەوخۆ هاوکێش بکرێن (بکێشرێن)، ئەم ڕێگەی کارەی خوارەوە ڕوونی دەکاتەوە چۆن دەتوانرێت هاوکێشەکان بە سەرنجدان و بەکارهێنانی ڕێگەی «هەنگاو بە هەنگاو» بکێشرێن و، هاوکێشەی شیبوونەوەی ئاو (شێوە 2-5) وەك نموونە بەکاردەهێنین.

**1. ناوی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان دیاری بکە و هاوکیشە کیمیاییەکە بنووسە.**

**2. هاوکێشەکە بنووسە پاش گۆڕینەوەی شێوگە ڕاستەکان بە ناوی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان**، ئەگەر بزانیت شێوگی ئاو $H_2O$ ، هایدرۆجین و ئۆکسجین دوو گازن.

و بە شێوەی گەردی دوو گەردیلەیی هەن و شێوگەکانیان بەرودوا (یەك لە دوای یەك ، $H_2$ و $O_2$) ە :

$$H_2O(l) \rightarrow H_2(g) + O_2(g) \quad \text{(ناهاوسەنگ)}$$

**3. هاوکێشەی بەشێوگ هاوسەنگ بکە بە پێی یاسای پاراستنی بارستە** ئەم قۆناغەی دوایی ، بە پشت بەستن بە ڕێگەی هەوڵدان بۆ گەیشتنە ڕاستی تەواو دەبێت، بەوپێیە، هاوکۆڵکەکانی دەگۆڕدرێن، ژمارەی گەردیلەکان لە هەردوو لای هاوکێشەکە دەژمێردرێن، کە ژمارەی هەر جۆرە گەردیلەیەك لە هەردوو لای هاوکێشەکە یەکسان دەبێت هاوکێشەکە هاوسەنگ (کێشراو) دەبێت، دەشێ ڕێگەی «هەوڵدان بۆ گەیشتنە ڕاستی» لە هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکاندا بەبەکارهێنانی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە، ئاسانتربێت:

- جۆرەها گەردیلە هاوسەنگ بکە، هەرجارە جۆرێك گەردیلە هاوسەنگ بکە.
- بە هاوسەنگکردنی گەردیلەکانی ئەو توخمە یەکگرتووانە دەست پێ بکە، کە تەنیا یەکجار لە هەر لایەکی هاوکێشەکە دەردەکەون.
- ئایۆنی فرە گەردیلەکانی هەردوو لای هاوکیشەکە، هاوسەنگ بکە، وەك یەکەیەکی سەربەخۆ دایان بنێ.
- گەردیلەکانی هایدرۆجین هاوسەنگ بکە، ئەوجا گەردیلەکانی ئۆکسجین دوای ئەوەی هاوسەنگکردنی گەردیلەکانی هەموو توخمەکانی تر تەواو دەکەیت.

نموونەکەی پێشوو، دەری دەخات، کە دوو گەردیلە ئۆکسجین هەیە لەلای ڕاست و گەردیلە یەك لە لای چەپ، بۆیە دەبێت ژمارەی گەردەکانی $H_2O$ زیاد بکەین، ئەویش بە دانانی هاوکۆڵکەی 2 لە پێش $H_2O$ وە بۆ دەستکەوتنی دوو گەردیلەی ئۆکسجینی پێویست لە لای چەپ:

$$2H_2O(l) \rightarrow H_2(g) + O_2(g) \quad \text{(بەشە هاوسەنگ)}$$

بەڵام دانانی هاوکۆڵکەی 2 لە پێش $H_2O$ هاوسەنگی گەردیلەکانی هایدرۆجینی لای ڕاستی تیك دا، بۆیە پێویست دەکات هاوکۆڵکەی 2 لە پێش $H_2$وە دابنێین لای ڕاستی هاوکێشەکە بۆ یەکسانبوونی ژمارەی گەردیلەکانی هایدرۆجین لە هەردوو لای هاوکێشەکە.

$$2H_2O(l) \rightarrow 2H_2(g) + O_2(g)$$

**4. ژمارەی گەردیلەکان بدۆزەرەوە بۆ دڵنیابوون لە هاوسەنگی هاوکێشەکە،** دڵنیاببە کە ژمارەی گەردیلەکانی هەرتوخمێك لە هەردوو لای تیری هاوکێشەکە یەکسانە

$$2H_2O(l) \rightarrow 2H_2(g) + O_2(g)$$
$$(4H + 2O) \quad = \quad (4H) + (2O)$$

ڕەنگە هەندێ جار هاوکۆڵکەکان بچووکترین ڕێژەی تەواوی ژمارەی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان نەبن، لەو بارەدا پێویستە هاوکۆلکەکان دابەش بکەین بەسەر ڕەنووسێکدا کە بچووکترین کۆلکەی هاوبەشی نێوانیان بێت، بۆ دەستکەوتنی بچوکترین کۆڵکەی ڕاستی (تەواوی) گونجاو.

هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکان بەسەیرکردنی ئاسانتردەبێت، هەرچەندێك بەئەزموونتر بیت، بەڵام فێربە چۆن خۆت لە هەڵەی باوی ئەو کردەیە بپارێزیت، لەوانە:

(1) نووسینی شێوگی کیمیایی ناتەواوی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان .

(2) هەوڵدانی هاوسەنگکردنی هاوکێشە، بە گۆڕینی ژێرە ڕەنووسەکان لە جیاتی هاوکۆڵکەکان.



**شێوە 5-2** لەکاتی تێپەڕاندنی تەزوویەکی کارەبا، بە ئاودا، دوای ئەوەی وا لە ئاوەکە دەکەین هەندێك گەیەنەربێت، گەردەکانی ئاو لێك هەڵدەوەشێن و هایدرۆجین دەدات (لە بۆری ڕاست) وئۆکسجین (لە بۆری چەپ) و بڵقەکانی گازی بەرزەوەبوو نیشانەی ڕوودانی کارلێکە، سەرنج بدە قەبارەی هایدرۆجینی پەیدابوو، دوو ئەوەندەی قەبارەی ئۆکسجینی پەیدا بوو دەبێت.

له بیرت نەچێت ژێرە ڕەنووسەکان، ناتوانرێت بخرێتە سەریان، یان لابرێن یان بگۆردرێن، **هەرگیز دواقۆناغی هاوسەنگکردنی هاوکێشەکەت لە بیرنەچێت، کە ژماردنی گەردیلەکانە لە هەردوو لای هاوکێشەکە، بۆ دڵنیابوون لە هاوسەنگییان.**

### پرسی نموونەیی 2-3

**لە کارلێکی زینک لەگەڵ گیراوەی ترشی هایدرۆ کلۆریك، گیراوەی کلۆریدی زینك و گازی هایدرۆجین پەیدادەبێت، ئەم کارلێکە، لە شێوە 2-6 دا بەرچاو دەکەوێت، هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگی ئەم کارلێکە بنووسە.**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

ناوی کارلێککردوو بەرهەم هاتووەکان بنووسە.

کارلێککردووەکان ئەمانەن: ترشی هایدرۆکلۆریك و زینك

بەرهەمهاتووەکان ئەمانەن: هایدرۆجین و کلۆریدی زینك

**2 نەخشە بکێشە**

هاوکێشەکە بە شێوگ بنووسە.

$$Zn(s) + HCl(aq) \rightarrow ZnCl_2(aq) + H_2(g)$$ ناهاوسەنگ

**3 بدۆزەرەوە**



هاوکۆلکەکانی چاکسازی بکە ( ڕاست بکەرەوە)،بەهاوسەنگکردنی کلۆر دەست پێ دەکەین، چونکە لەگەڵ توخمێکی تر هەموو جارێك یەك دەگرێت، لە هەردوو لای هاوکێشەکە، ڕێنماییەکانی پێشوت بیر بکەوێتەوە (لاپەرە 55 ) کە هایدرۆجین و ئۆکسجین هاوسەنگ نابن تا هەموو توخمەکانی تری کارلێکەکە هاوسەنگ نەکرێن، بۆ هاوسەنگ کردنی کلۆر ، هاوکۆلکەی 2 دەخەینە پێش HCl ەوە و دووگەردەکەی کلۆریدی هایدرۆجین، دوو گەردیلەی هایدرۆجینە ویستراوەکەی لای ڕاستی کارلێکەکەیشمان دەداتێ، دوایی سەرنج بدە، یەك گەردیلە زینك لە هەرلایەکی هاوکێشەکە هەیە، بۆیە پێویستیت بە خستنەسەری هیچ هاوکۆلکەیەکی تر نابێت.

$$Zn(s) + 2HCl(aq) \rightarrow ZnCl_2(aq) + H_2(g)$$

**4 هەڵسەنگێنە**

گەردیلەکان بژمێرە بۆ دڵنیابوون لە هاوسەنگبوون

$$Zn(s) + 2HCl(aq) \rightarrow ZnCl_2(aq) + H_2(g)$$

$$(1Zn) + (2H + 2Cl) = (1Zn + 2Cl) + (2H)$$

کەواتە هاوکێشە هاوسەنگە.

**شێوە 2-6** زینکی ڕەق لەگەڵ ترشی هایدرۆکلۆریك کارلێك دەکات بۆ بەرهەمهێنانی کلۆریدی زینك و گازی هایدرۆجین.

### ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** ئەم هاوکێشە کیمیاییانە بەشێوگ بنووسە، ئەوسا هاوسەنگیان بکە، بۆ هەریەکەی ئەم کارلێکانەی خوارەوە:

أ. مەگنیسیۆم و ترشی هایدرۆکلۆریك، کارلێك دەکەن، کلۆریدی مەگنیسیۆم و هایدرۆجین پێك دێنن.

ب. گیراوەی ترشی نیتریك لەگەڵ هایدرۆکسیدی مەگنیسیۆم کارلێك دەکەن بۆ پێکهێنانی نیتراتی مەگنیسیۆم و ئاو.

وەڵامەکان:

**1.** أ. بەشێوگ:

$$Mg + HCl \rightarrow MgCl_2 + H_2$$

$$Mg\ (s) + 2HCl\ (aq) \rightarrow MgCl_2\ (aq) + H_2(g)$$ (هاوسەنگ)

ب. بەشێوگ:

$$HNO_3(aq) + Mg(OH)_2(s) \rightarrow Mg(NO_3)_2(aq) + H_2O(l)$$

$$2HNO_3(aq) + Mg(OH)_2(s) \rightarrow Mg(NO_3)_2(aq) + 2H_2O(l)$$ (هاوسەنگ)

پرسی نموونەیی 4-2

**کاربیدی ئەلومنیۆمی ڕەق $Al_4C_3$ ، لەگەڵ ئاو کارلێك دەکات، گازی میثان و هایدرۆکسیدی ئەلۆمنیۆمی ڕەق پێك دێنێ، هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگی ئەم کارلێکە بنووسە.**

**شیکاری**

کارلێککردووەکان، کاربیدی ئەلومنیۆم و ئاون و، بەرهەمەکان میثان و هایدرۆکسیدی ئەلومنیۆمن، هاوکێشەکە بە شێوگ وەك خوارەوە دەنووسرێت:

$$Al_4C_3(s) + H_2O(l) \rightarrow CH_4(g) + Al(OH)_3(s) \quad \text{(ناهاوسەنگ)}$$

دەست بکە بە هاوسەنگکردنی شێوگە هاوکێشەکە، بەدیاریکردنی ژمارەی گەردیلەکانی ئەلومنیۆم یان گەردیلەکانی کاربۆن. (بیرت نەچێت دواتر گەردیلەکانی هایدرۆجین و ئۆکسجین هاوسەنگ دەکرێن). لای چەپی هاوکێشەکە چوار گەردیلەی Al هەیە بۆ هاوسەنگکردنی گەردیلەکانی Al، هاوکۆلکەی 4 لە پێش $Al(OH)_3$ یەوە دابنێ.

$$Al_4C_3(s) + H_2O(l) \rightarrow CH_4(g) + 4Al(OH)_3(s) \quad \text{(بەشەهاوسەنگ)}$$

ئێستا گەردیلەکانی C هاوسەنگ بکە، لەگەڵ بوونی 3 گەردیلە C لەلای چەپ، پێویستە هاوکۆلکەی 3 لە پێش $CH_4$ وە دابنێین

$$Al_4C_3(s) + H_2O(l) \rightarrow 3CH_4(g) + 4Al(OH)_3(s) \quad \text{(بەشەهاوسەنگ)}$$

گەردیلەکانی ئۆکسجین هاوسەنگ بکە،چونکە ئۆکسجین، بە پێچەوانەی هایدرۆجینەوە، تەنیا یەك جار لە هەر لایەکی هاوکێشەکە دەردەکەوێت. یەك گەردیلە O هەیە لەلای چەپ و 12 گەردیلە O لە شێوگی $Al(OH)_3$ لەگەڵ4 لێکدراو لەلای ڕاست هەیە، بۆیە دانانی هاوکۆلکەی 12 لە پێش $H_2O$ وە، گەردیلەکانی O هاوسەنگ دەکات.

$$Al_4C_3(s) + 12H_2O(l) \rightarrow 3CH_4(g) + 4Al(OH)_3(s)$$

بۆ گەردیلەکانی هایدرۆجین، لە لای چەپی هاوکێشەکە، 24 گەردیلە H هەیە و لای ڕاست، 12 گەردیلە H لە 3 گەردە میثانەکەدا و 12 گەردیلە H یش لە شێوگی هایدرۆکسیدی ئەلومنیۆمەکەدا هەیە، واتە گەردیلەکانی H لە هەردوو لای هاوکێشەکە یەکسانن:

$$Al_4C_3(s) + 12H_2O(l) \rightarrow 3CH_4(g) + 4Al(OH)_3(s)$$

$$(4Al + 3C) + (24H + 12O) = (3C + 12H) + (4Al + 12H + 12O)$$

بەوەیش هاوکێشەکە هاوسەنگە

پرسی نموونەیی 5-2

**گۆگرداتی ئەلومنیۆم و هایدرۆکسیدی کالیسیۆم، لە پاککردنەوەی ئاودا بەکاردێن، ئەگەر ئەو دوو ماددەیە کرانە ئاوەوە، دەتوێنەوە و کارلێك دەکەن و دووبەرهەمی نەتواوە پێك دێنن کە ( هایدرۆکسیدی ئەلومنیۆم و گۆگرداتی کالیسیۆم ، ئەو دوو بەرهەمە لەگەڵ خەوشە ڕەقە گیرساوەکاندا دەنیشن. هاوکێشەیەکی کیمیایی هاوسەنگ بۆ ئەو کارلێکە بنووسە.**

Mg

**شیکاری**

هەردوو کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان لەم کارلێکە دا ئاوێتەی ئایۆنین، ئەوەی لەبەندی 1 دا فێری بوویت بیهێنەوە بیری خۆت دەربارەی دیاریکردنی شێوگی ئاوێتە ئایۆنییەکان، لەو بارگەی ئایۆنانەوە، کە هەر ئاوێتەیەکیانی، لێ پێك دێت، دەبینیت کە هاوکێشە کیمیاییە داواکراوەکان:

بەمجۆرەی خوارەوە دەنووسرێت:

$$Al_2(SO_4)_3 + Ca(OH)_2 \rightarrow Al(OH)_3 + CaSO_4$$ (ناهاوسەنگ)

لەبەر ئەوەی لە هەر لایەکی هاوکێشەکەدا، گەردیلەیەك کالیسیۆم هەیە، گەردیلەی کالیسیۆمەکە هاوسەنگە و، لەبەر ئەوەی دوو گەردیلە Al لای چەپ و یەك گەردیلە Al لای ڕاستی هاوکێشەکە هەیە ، دانانی هاوکۆلکەی 2 لە پێش $Al(OH)_3$ یەوە، گەردیلەکانی Al هاوکێشە دەکات لە هەردوو لای هاوکێشەکە.

$$Al_2(SO_4)_3 + Ca(OH)_2 \rightarrow 2Al(OH)_3 + CaSO_4$$ (بەشە هاوسەنگ)

دواتر ژمارەی ئایۆنەکانی $SO_4^{-2}$ دەدۆزینەوە، دەبینین سێ ئایۆنی $SO_4^{-2}$ لای چەپی هاوکێشەکە و یەك ئایۆنی لای ڕاستی هاوکێشەکە هەیە، ئەگەر هاوکۆلکەی3 لە پێش $CaSO_4$ ەوە دابنێین، ژمارەی ئایۆنەکانی $SO_4^{-2}$ لە هەردوو لای هاوکێشە، یەکسان دەبن:

$$Al_2(SO_4)_3 + Ca(OH)_2 \rightarrow 2Al(OH)_3 + 3CaSO_4$$ (بەشەهاوسەنگ)

سێ گەردیلەی Ca ، لای ڕاست هاوکێشەکە و گەردیلەیەك Ca لای چەپ هەیە ئەگەر هاوکۆلکەی 3 بخەینە پێش $Ca(OH)_2$ ، جارێکی تر ژمارەیەکی یەکسان گەردیلەی Ca لە هەر لایەکی هاوکیشەکە دەبێت، دوا هەنگاو دەبێتە هۆی بوونی شەش ئایۆنی $HO^-$ لە هەر لایەکی هاوکێشەکە:

$$Al_2(SO_4)_3(aq) + 3Ca(OH)_2(aq) \rightarrow 2Al(OH)_3(s) + 3CaSO_4(s)$$

$$(2Al^{+3} + 3SO_4^{-2}) + 3(Ca^{+2} + 2OH^-) = 2(Al^{+3} + 3OH^-) + 3(Ca^{+2} + SO_4^{-2})$$

بەم جۆرە هاوکێشەکە هاوسەنگ دەبێت.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ بۆ هەریەکەی ئەم کارلێکانەی خوارەوە بنووسە:

أ. سۆدیۆمی ڕەق لەگەڵ گازی کلۆر یەك دەگرن بۆ بەرهەمهێنانی کلۆریدی سۆدیۆمی ڕەق.

ب. لەکاتی کارلێکی مسی ڕەق لەگەڵ گیراوەی نیتراتی زیو، گیراوەی نیتراتی مس(II) وزیوی ڕەق پێك دێت.

ج. لە کاتی کارلێکی ئۆکسیدی ئاسن (III)، ی ڕەق لە فرنێکی زۆر گەرمدا، لەگەڵ گازی یەکۆکسیدی کاربۆن ئاسنی ڕەق و گازی دوانۆکسیدی کاربۆن پێك دێت.

**وەڵامەکان:**

**1.** أ. $2Na(s) + Cl_2(g) \rightarrow 2NaCl(s)$

ب. $Cu(s) + 2AgNO_3(aq) \rightarrow Cu(NO_3)_2(aq) + 2Ag(s)$

ج. $Fe_2O_3(s) + 3CO(g) \rightarrow 2Fe(s) + 3CO_2(g)$

## پێداچوونەوەی کەرتی 1-2

**1.** جیاوازی لە نێوان شێوگە هاوکێشە و هاوکێشەی کیمیاییدا چییە؟

**2.** شێوگە هاوکێشەی ئەو کارلێکە بنووسە کە ئاوە گیراوەی ترشی گۆگردیك و هایدرۆکسیدی سۆدیۆم یەك دەگرن بۆ پێکهێنانی گۆگرداتی سۆدیۆم و ئاو.

**3.** ئەم هاوکێشە کیمیاییانەی خوارەوە بگۆرە بۆ ڕستە:

أ. $2K(s) + 2H_2O(l) \rightarrow 2KOH(aq) + H_2(g)$

ب. $2Fe(s) + 3Cl_2(g) \rightarrow 2FeCl_3(s)$



# مەتەڵی کیمیایی

لەسەرە ڕۆییەکیمیاییەکانی شارلك هۆڵمز: سەگی ڕاوی هەنری ئارمیتاج کە دانەرەکەی Henry Armitage (تۆماس ج .وادیل و تۆماس ( ڕیبۆڵت ) لە گۆڤاری فێرکردنی کیمیاوە



«پێشتر دەمناسی» پیاوە پیرەکە داتەپی و ڕووخا «ژەهراوی بوو، وانەبوو ؟....» ... بەڵام هۆڵمز نەی دەبیست دەفری سەگەکەی لە ئەرزەکە هەڵگرتەوە کە ئێستا هیچی تێدانەماوە، زۆرتوند پارچەنانە بەرماوەکانی بۆن دەکرد، کە لە بۆنکردنی سەگی ڕاوەکەی دەکرد... پاش سەعاتێك، لەسەر کورسییەك دانیشتبوم لە شەقامی بێکەر 221B و هۆڵمزیش لە تاقیگەکەی بوو خەریك بوو گوێم لێی بێ کە لەبەر خۆیەوە دەدوا وەك ئاسایی لای پشتەوە تەقەو ڕەقەی کە لوپەلی تاقیگە دەبیسترا... لە پڕ هۆڵمز بانگی کردم «واتسۆن وەرە بۆ ئێرە، ئیشم پێتە» ... زۆر لەسەر خۆ هاوکێشەیەکی لەسەر پارچە کاغەزێك نووسی و دایمێ ... « ئەگەر دەتوانی ئەم هاوکێشەیەی هاوسەنگ بکە ، واتسۆن دەتوانی ئەم مەتەڵە هەڵ بێنێت؟ هەتا لە توانامدابوو سەیری لاپەڕەکەم کرد و ئەم هاوکێشەیەی خوارەوەم بینی کە بەئاشکرا شیوگی کارلێککردوویەکی کەم بوو.

$$C_6H_5NH_2 + 3KOH + \longrightarrow C_6H_5CN + 3KCl + 3H_2O$$

هۆڵمز بە هەنگاوێکی ڕێك و پێك دەهاتوو دەچوو هەردوو دەستی خستبووە پشتەوە دەیوت:«گەردێك ئەنیلین aniline و سێ گەرد هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم و گەردێك لە ژەهرە، نەزانراوەکە لەگەڵ یەکتر کارلێك دەکەن و گەردێك فەنیل ئایزۆسیانید و سێ گەرد کلۆریدی پۆتاسیۆم و سێ گەرد ئاو پێك دێت و، دەتوانرێت پێناسی کارلێککردوە نەزانراوەکە دیاری بکرێت بەوەی هاوکێشەکە بەپێی هەموو گەردیلە تێدا بەشدارەکان هاوسەنگ بکرێت، تاکو بتوانرێت بەرهەم وەربگیرێت فەنیل ئایزۆ سیانید phenylisocyanide لە ڕێی ئەم کارلێکەوە لە کارلێککردوو، کیمیاییە ناتەواوەکە ئەو ژەهرەیە بە ئەنقەست خرابووە ناو خۆراکی سەگی ڕاوەکەوە. دڵنیام کردەوە و پێم وت: «دەشێ لە بەشێکی ڕێگەکەدا پێڕەویت بکەم» و بەبێ هیچ گومانێك تۆ ماددەیەکی نامۆت لە خۆراکی سەگەکەدا دۆزییەوە بە هۆی بۆنە تیژ و دیارەکەیەوە. هۆڵمز وەڵامی دایەوە «ڕاست دەکەیت واتسۆن»، وەك هەر کیمیا گەرێك من بەتەواوی دەزانم ژەهر زوو دەهەڵمێت ... بینیمان ئاوێتەکە لە پلەی گەرمی ژووردا شلەو، لە ئاودا ناتوێتەوە چڕییەکەی لە 1.00 g/mL زۆرترە شیرینییە ناخۆشەکەیش زۆر بەسوود بوو کارە گریمانێکم دانا و تاقیکردنەوەیەکی کیمیایی ناسراوم بۆ ئەو شلە ژەهرینە کرد، هاوکێشەکەت هاوسەنگ کرد؟، هاوکێشەکە ئەوە دەسەلمێنێت دەتوانم ئەوکارەبکەم... هۆڵمز، ئەم جۆرە کیمیایە باش دەزانم.. بابزانم.. کارلێککردووە، ناتەواوەکە پێویستە کلۆری تێدا بێت..سێ دانە بۆ ئەوەی Cl ی بەرهەمەکە هاوسەنگ بێت». «زۆرباشە واتسۆن، دەست پێ بکە» ڕەنگە ئێستا ئاڵۆزتر بێت، بەڵام باش سەیربکە، گەردیلەیەك C ی زیاد هەیە لەبەرهەمەکاندا، ئاخۆ ئاوێتەکە $CCl_3$ نەبێت؟ « کاربۆن چوار بەندی هەیە واتسۆن نەك سیان»هۆڵمز بە گرژییەکەوە وتی..«دۆزیمەوە!، هاوکێشەکە هاوسەنگ دەکات کەواتە کلۆرۆ فۆرمە، هۆڵمز!، بە دڵنیایی، یەکگرتوو بنەما چەسپێنە»

**خوێندنەوەیەك بۆ تێگەیشتن**

ئایا دەتوانیت واتای وشەی هەڵفریوو لە چیرۆکەکە دەربهێنیت؟ لە دامێنەوە پێناسەی زاراوەکە بنووسە، ئەوسا پێناسەکەت بەراوردبکە بە پێناسەیەك لە فەرهەنگێکی زانستی وەرگیرا بێت

## کەرتی 2-2

### ئاماژەکانی جێبەجێکردن

- کارلێکەکانی یەکگرتن و شیبوونەوە و یەکە گۆڕینەوە و دوانە گۆڕینەوە پێناسە دەکات.
- کارلێکەکان دەپۆلێنێت بۆ کارلێکەکانی یەکگرتن، شیبوونەوە، یەکە گۆڕینەوە، دوانە گۆڕینەوە و سووتان.
- کارلێکەکانی یەکگرتن و شیبوونەوە دەپۆلێنێت بۆ جۆرە جیاوازەکانی.
- کارلێکەکانی گۆڕینەوە دەپۆلێنێت بۆ جۆرە جیاوازەکانی
- ئەنجامی کارلێکە سادەکان پێشبینی دەکات لە زانینی مادده کارلێککردووەکانەوە.

# جۆرەکانی کارلێکە کیمیاییەکان

هەزاران کارلێکی کیمیایی ناسراو، لە سیستمە ژیانییەکان و کردە پیشەسازییەکان و تاقیگە کیمیاییەکاندا ڕوودەدەن و بەزۆری پێویستە ئەو بەرهەمانە پێشبینی بکرێن کە لەو کارلێکانەدا پەیدا دەبن، بیرکەوتنەوەی هاوکێشەکان بەو ژمارە زۆرەی کارلێك، کارێکی سەخت وشەکەتکەرە، بۆیە باشتر و واقیعی تر وایە، ئەو کارلێکانە بە پێی چۆنییەتی ڕوودانیان بپۆلێنرێن، ئەوجا زانیارییە گشتییەکان دەربارەی جۆرەکانی ئەو کارلێکانە لە پێشبینی بەرهەمەکانیاندا بەکاربهێنرێت. کارلێکە کیمیاییەکانی ئەم کەرتە دەکرێن بە پێنج جۆری بنچینەییەوە کە ئەمانەن:کارلێکەکانی یەکگرتن، لێك هەڵوەشان، یەکە گۆڕینەوە، دوانە گۆڕینەوە و سووتان.

## کارلێکەکانی یەکگرتن

**لە کارلێکی یەکگرتن synthesis reaction (کارلێکی پێکهاتن composite reaction)** دوو مادده یان زۆرتر یەك دەگرن بۆ پێکهێنانی ئاوێتەیەکی نوێ، ئەم جۆرە کارلێکانە،بەم هاوکێشە گشتییەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

$$X + A \rightarrow AX$$

A و X دەشێ توخم یان ئاوێتە بن و AX ئاوێتەیە ئەم نموونانەی کە دێن چەند جۆرێك کارلێکی یەکگرتن ڕوون دەکەنەوە.

### کارلێکی توخمەکان لەگەڵ ئۆکسجین و گۆگرد

نموونەی کارلێکە سادەکانی یەکگرتنی هەرتوخمێك لەگەڵ ئۆکسجین بۆ پێکهێنانی ئۆکسیدی ئەو توخمە، نزیکەی هەموو کانزاکان، لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرن و ئۆکسید پەیدادەکەن، کە شریتێکی باریکی مەگنیسیۆم دەسووتێنرێت، بەگڕێکی سپی بریسکەدار دەسووتێ و کە بە تەواوی شریتەکە دەسووتێ، خۆڵەمێشێکی ورد و سپی لێ دەمێنێتەوە کە ئۆکسیدی مەگنیسیۆمە و ئەم کارلێکە کیمیاییەی شێوە 2-7 بەم هاوکێشەیە پێشان دەدرێت.

$$2Mg(s) + O_2(g) \rightarrow 2MgO(s)$$

توخمەکانی تری کۆمەڵەی 2 ی خشتەی خولی، بەهەمان ڕێگە کارلێك دەکەن و ئۆکسیدەکانیان پێك دێن، کە شێوگی گشتییان MO یە هێمای M ، کانزاکە پێشان دەدات، کانزاکانی کۆمەڵەی 1 ، ئۆکسید پێك دێنن، کە شێوگی گشتییان $M_2O$ یەوەك $Li_2O$ یان $Na_2O$ یان $K_2O$ هەروەها توخمەکانی کۆمەڵەی 1 و 2 لەگەڵ گۆگرد بەهەمان شێوە کارلێك دەکەن و گۆگردید پێك دێنن $M_2S$ و MS یەك لە دوای یەك، ئەمانەی خوارەوە نموونەی ئەو جۆرە کارلێکی یەکگرتنانەن:

$$16Na(s) + S_8(s) \rightarrow 8Na_2S(s)$$

$$8Ca(s) + S_8(s) \rightarrow 8CaS(s)$$


( أ )


(ب)

**شێوە 2-7** شریتی مەگنیسیۆم Mg، ەکەی شێوەی ( أ )، لە شێوە (ب) دا، یەك دەگرێت لەگەڵ ئۆکسجین $O_2$ بۆ پێکهێنانی ئۆکسیدی مەگنیسیۆم MgO .



هەندێ کانزای وەك ئاسن، لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرێت و دوو ئۆکسیدی جیاواز پێك دێنێت:

$$2Fe(s) + O_2(g) \rightarrow 2FeO(s)$$
$$4Fe(s) + 3O_2(g) \rightarrow 2Fe_2O_3(s)$$

لە بەرهەمی کارلێکی یەکەمەوە دەردەکەوێت.
کە باری ئۆکسانی ئاسن لە FeO دا +2ە، بەڵام لە بەرهەمی کارلێکی دووەمدا $Fe_2O_3$ باری ئۆکسانی ئاسن +3 یە و، شێوە 2-8 هەریەکە لە و دوو ئۆکسیدە ڕوون دەکاتەوە.
ناکانزایش دەتوانن کارلێکی یەکگرتن بکەن لەگەڵ ئۆکسجیندا و ئۆکسیدی ناکانزاکان پێك بهێنین، بۆ نموونە گۆگرد، لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکەن و دوانۆکسیدی گۆگرد پێك دێنن، هەروەها کاربۆن لە هەوادا دەسووتێ و دوانۆکسیدی کاربۆن پێك دێن:

$$S_8(s) + 8O_2(g) \rightarrow 8SO_2(g)$$
$$C(s) + O_2(g) \rightarrow CO_2(g)$$

لەباری بوونی بڕێکی کەم ئۆکسجیندا، یەکۆکسیدی کاربۆن پێك دێت وەك لەم هاوکێشەیەی خوارەوەدا دەبینی:

$$2C(s) + O_2(g) \rightarrow 2CO(g)$$

هایدرۆجینیش لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکەن و ئاو پێك دێنن:

$$2H_2(g) + O_2(g) \rightarrow 2H_2O(g)$$

## کارلێکی کانزا لەگەڵ هالۆجینەکاندا

زۆربەی کانزاکان لەگەڵ توخمەکانی کۆمەڵە 17 دا (واتە هالۆجینەکان) کارلێك دەکەن و ئاوێتەی هاوبەشی و ئایۆنی پێك دێنن، بۆ نموونە، کانزاکانی کۆمەڵەی 1 لەگەڵ هالۆجینەکان کارلێك دەکەن و ئاوێتەی و ئایۆنی MX پێك دێن کە M کانزاکە و X هالۆجینەکان پێشان دەدەن، نموونە بۆ ئەو کارلێکانەی یەکگرتن، کارلێکەکانی سۆدیۆم لەگەڵ کلۆر و پۆتاسیۆم لەگەڵ یۆد دەگرێتەوە:

$$2Na(s) + Cl_2(g) \rightarrow 2NaCl(s)$$
$$2K(s) + I_2(g) \rightarrow 2KI(s)$$

بەڵام کانزاکانی کۆمەڵە 2 ، لەگەڵ هالۆجینەکان کارلێك دەکەن و ئاویتەی ئایۆنی پێك دێنن کە شێوگەکەیان $MX_2$ :

$$Mg\ (s) + F_2(g) \rightarrow MgF_2(s)$$
$$Sr(s) + Br_2(l) \rightarrow SrBr_2(s)$$

هالۆجینەکان لەگەڵ زۆربەی کانزاکاندا یەك دەگرن، فلۆر نزیکەی لەگەڵ هەموو کانزاکاندا یەك دەگرێت، چونکە زۆر چالاکە، بۆ نموونە لەگەڵ سۆدیۆم کارلێك دەکەن و فلۆریدی سۆدیۆم پێك دێنن و لەگەڵ یۆرانیۆمیش فلۆریدی یۆرانیۆم(VI)پێك دێنێت.

$$2Na(s) + F_2(g) \rightarrow 2NaF(s)$$
$$U(s) + 3F_2(g) \rightarrow UF_6(g)$$



( أ )



(ب)

**شێوە 8-2** ئاسن Fe لەگەڵ ئۆکسجین $O_2$ یەك دەگرن و دوو ئۆکسیدی جیاواز پێك دێنن: ( أ ) ئۆکسیدی ئاسن (II)، FeO و (ب) ئۆکسیدی ئاسن (III)، $Fe_2O_3$ .

فلۆریدی سۆدیۆم بە بڕێکی زۆر کەم دەکرێتە ئاوی خواردنەوەو کە و ئایۆنەکانی فلۆریدی دەداتێ دەبێتە هۆی پاراستنی ددان لە کلۆربوون، بەڵام یورانیۆمی سروشتی، وەك هەنگاوی یەکەم دەگۆردریت بۆ فلۆریدی یۆرانیۆم (VI) ، $UF_6$، وەك هەنگاوی یەکەم لە بەرهەمهێنانی یۆرانیۆمی بەکارهێنراو لە پەیداکردنی وزەی ناوکیدا.

### کارلێکەکانی یەکگرتن لەگەڵ ئۆکسیدەکاندا

کانزا چالاکەکان، توند کارلێك دەکەن، ئۆکسیدی کانزا چالاکەکان، لەگەڵ ئاو کارلێك دەکەن و هایدرۆکسیدی کانزاکان پێك دێنن، بۆ نموونە ئۆکسیدی کالیسیۆم ، لەگەڵ ئاو کارلێك دەکات و هایدرۆکسیدی کالیسیۆم پێك دێنێت، کە یەکێکە لەو ئاوێتانەی وەك دژە ترشێتی گەدە بەکاردێت.

$$CaO(s) + H_2O(l) \rightarrow Ca(OH)_2(s)$$




**شێوە 2-9** هایدرۆکسیدی کالیسیۆم کە تفتە، دەشێ بەکارهێنرێت بۆ هاوکێشکردنی ترشی هایدرۆ کلۆریکی گەدە.

زۆر ئۆکسیدی ناکانزا هەن ( کە دەکەونە سەرووی لای ڕاستی خشتەی خولییەوە) کە لەگەڵ ئاو کارلێك دەکەن و ترشە ئۆکسجینییەکان پێك دێن، دوانۆکسیدی گۆگرد، $SO_2$ بۆ نموونە لەگەڵ ئاو کارلێك دەکەن و ترشی گۆگردۆز پێك دێنن:

$$SO_2(g) + H_2O(l) \rightarrow H_2SO_3(aq)$$

ترشی گۆگردۆزیش خۆی ، لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکات و ترشی گۆگردیك پێك دێنن، کە یەکێکە لەگرنگترین پێکهێنەکانی ترشە باران.

$$2H_2SO_3(aq) + O_2(g) \rightarrow 2H_2SO_4(aq)$$

ڕەنگە هەندێ ئۆکسیدی کانزا و ناکانزاکان لەگەڵ یەکتر کارلێك بکەن و یەك بگرن و خوێ پێك بهینن، بۆ نموونە، گۆگردیتی کالیسیۆم لە کارلێکی ئۆکسیدی کالیسیۆم لەگەڵ دوانۆکسیدی گۆگرد پێك دێت:

$$CaO(s) + SO_2(g) \rightarrow CaSO_3(s)$$

## کارلێکەکانی شیبوونەوە (لێکهەڵوەشان)

**لە کارلێکی شیبوونەوەدا decomposition reaction ، ئاوێتەیەك دەکەوێتە بەرکارلێکێك، دوو ماددە یان زۆرتری پێکهاتن سادە تری لێ پەیدا دەبێت و کارلێکەکانی شیبوونەوە** پێچەوانەی کارلێکەکانی یەکگرتنەوەن و بەم هاوکێشەیە دەردەبڕێت:

$$AX \rightarrow A + X$$

کە AX ئاوێتەیەکە، A و X دوو توخم یان دوو ئاوێتەن. زۆر کارلێکی شیبوونەوە، بۆ ڕوودانی پێویستی بە وزەی کارەبا یان گەرمی هەیە و وا لە مەودوا هەندێ نموونەی کارلێکەکانی شیبوونەوە دەخەینە بەرچاو:

## شیبوونەوەی ئاوێتە دوانییەکان (دوانەتوخم)

سادەترین کارلێکی شیبوونەوە، شیبوونەوەی ئاوێتەیەکی دیاریکراوە بۆ توخمەکانی، وەك لێکهەڵوەشانی ئاو بە تێپەڕاندنی تەزوویەکی کارەبا بۆ دوو توخمەکەی، هایدرۆجین و ئۆکسجین :

$$2H_2O(l) \xrightarrow{\text{کارەبا}} 2H_2(g) + O_2(g)$$

**بە لێکهەڵوەشانی ماددەیەکی دیاریکراو بە تەزووی کارەبا دەڵێن: بەکارەبا شیبوونەوە electrolysis** بەڵام ئۆکسیدی کانزا کەمچالاکترەکان، کە دەکەوێتە خوار ناوەڕاستی خشتەی خولییەوە، بەگەرمکردن لێك هەڵدەوەشێت بۆ توخمەکانی. جۆزیف بریستلی، ساڵی 1774 ئۆکسجینی دۆزیەوە بە هۆی بەگەرمی لێکهەڵوەشانی ئۆکسیدی جیوە (II) و، بە وەیش جیوە و ئۆکسجینمان دەست دەکەوێت.

$$2HgO(s) \xrightarrow{\Delta} 2Hg(l) + O_2(g)$$

شێوەی 2-10 ، ئەم کارلێکە ڕوون دەکاتەوە.



**شێوەی 2-10** کە ئۆکسیدی جیوە II (ماددە پرتەقاڵییەکەی لە بنی بۆری تاقیکردنەوەکە دایە، لێك هەڵدەوەشێت بۆ ئۆکسجین و کانزای جیوە کە بەشێوەی دڵۆپی ورد دەبینرێت لەسەر دیواری ناوەوەی بۆری تاقیکردنەوەکە کۆ دەبێتەوە.

## شیبوونەوەی کاربۆناتی کانزاکان

کاتێك کاربۆناتی کانزایەکی دیاریکراو گەرم دەکرێت، ئەوا هەڵدەوەشێ بۆ ئۆکسیدی کانزا –کە و گازی دوانۆکسیدی کاربۆن، بە لێکهەڵوەشانی کاربۆناتی کالیسیۆم بەگەرمی، ئۆکسیدی کالیسیۆم و دوانۆکسیدی کاربۆن پێك دێت:

$$CaCO_3(s) \xrightarrow{\Delta} CaO(s) + CO_2(g)$$

## شیبوونەوەی هایدرۆکسیدی کانزاکان

هەموو هایدرۆکسیدی کانزاکان (جگە لە کانزاکانی کۆمەڵەی یەکەم)، بەگەرمکردن لێك هەڵدەوەشێت بۆ ئۆکسیدی کانزا و ئاو، بەو جۆرە هایدرۆکسیدی کالیسیۆم لێك هەڵدەوەشێت بۆ ئۆکسیدی کالیسیۆم و ئاو:

$$Ca(OH)_2(s) \xrightarrow{\Delta} CaO(s) + H_2O(g)$$

## شیبوونەوەی کلۆراتی کانزاکان

بەهەمان ڕێگە، کلۆراتی کانزا، بەگەرمی لێك هەڵدەوەشێت بۆ کلۆریدی کانزاکە و ئۆکسجین، بەوپێیە کلۆراتی پۆتاسیۆم $KClO_3$ بەبوونی هاندەری $MnO_2(s)$ ، لێك هەڵدەوەشێت بۆ کلۆریدی پۆتاسیۆم و ئۆکسجین:

$$2KClO_3(s) \xrightarrow[MnO_2(s)]{\Delta} 2KCl(s) + 3O_2(g)$$

## شیبوونەوەی ترشەکان

هەندێ ترش لیك هەڵدەوەشێت بۆ ئۆکسیدی نا کانزا و ئاو، ترشی کاربۆنێك ناجێگرە، بۆیە یەکسەر لێك هەڵدەوەشێت، لە پلەی گەرمی ژووردا بۆ دوانۆکسیدی کاربۆن و ئاو:

$$H_2CO_3(aq) \rightarrow CO_2(g) + H_2O(l)$$

## کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە

لە کارلێکی تاکە گۆڕینەوەدا **single replacement reaction** کە بەکارلێکی لا دانیش **displacement reaction** ناسراوە، لە ئاوێتەیەکی دیاریکراودا، توخمێك دەگۆڕدرێتەوە بە توخمێکی تری پێك چوو، و ڕەنگە زۆر لەو کارلێکانە لە ئاوگیراوەکەدا ڕوودات. بڕی وزەی بەشدار لەم جۆرە کارلێکەدا، کەمترە لە و وزەیەی لە کارلێکەکانی یەکگرتن و شیبوونەوەدا بەشداری دەکات. دەتوانرێ کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە، بەم هاوکێشە گشتییانەی خوارەوە و پێشان بدرێن:

$$A + BX \rightarrow AX + B$$

یان

$$Y + BX \rightarrow BY + X$$

کە A و B و X و Y توخمن AX و BX و BY ئاوێتەن.

### گۆڕینەوەی کانزایەك لە ئاوێتەیەکدا بەکانزایەکی تر

ئەلومنیۆم لە قورقوشم بە چالاکتر دادەنرێت، ئەگەر ئەلومنیۆمی ڕەق خرایە ناوگیراوەی نیتراتی قورقوشم (II)وە $Pb(NO_3)_2(aq)$ ، کارلێکێك ڕوودەدات کە ئەلومنیۆم شوێنی قورقوشم دەگرێتەوە و قورقوشمی ڕەق و گیراوەی نیتراتی ئەلومنیۆم پێك دێت.

$$2Al(s) + 3Pb(NO_3)_2(aq) \rightarrow 3Pb(s) + 2Al(NO_3)_3(aq)$$

### گۆڕینەوەی کانزایەك بە هایدرۆجینی ئاو

کانزا چالاکترەکان وەك توخمەکانی کۆمەڵەی 1 ،زۆر خێرا لەگەڵ ئاو کارلێك دەکات و هایدرۆکسیدی کانزاکە و هایدرۆجین پێك دێت، بۆ نموونە سۆدیۆم، لەگەڵ ئاوکارلێك دەکات و هایدرۆکسیدی سۆدیۆم و گازی هایدرۆجین پێك دێنێت:

$$2Na(s) + 2H_2O(l) \rightarrow 2NaOH(aq) + H_2(g)$$

بەڵام کانزاکەمتر چالاکەکان، وەك ئاسن بۆ نموونە، لەگەڵ هەڵمی ئاو کارلێك دەکات و ئۆکسیدی کانزا و گازی هایدرۆجین پێك دێت:

$$3Fe(s) + 4H_2O(g) \rightarrow Fe_3O_4(s) + 4H_2(g)$$

### گۆڕینەوەی کانزا، بە هایدرۆجینی ترش

کانزا زۆرتر چالاکەکان، لەگەڵ هەندێ گیراوەی ترش کارلێك دەکات، وەك ترشی هایدرۆکلۆریك و ترشی گۆگردیکی ڕوون، شوێنی هایدرۆجینی ترشەکە دەگرێتەوە وخوێی کانزاکە و گازی هایدرۆجین پێك دێت، کاتێك مەگنیسیۆمی ڕەق لەگەڵ ترشی هایدرۆکلۆریك کارلێك دەکات، وەك لە شێوە 2-11 دا، گازی هایدرۆجین و گیراوەی کلۆریدی مەگنیسیۆم پێك دێت:

$$Mg(s) + 2HCl(aq) \rightarrow H_2(g) + MgCl_2(aq)$$

**شێوە11-2** لەم کارلێکە تاکە گۆڕینەوەیدا، کانزای مەگنیسیۆم شوێنی ئەو هایدرۆجینەی گرتەوە کە لە ترشی هایدرۆکلۆریکەکەدا هەیە.

## گۆڕینەوەی هالۆجینەکان

لە جۆرێکی تری کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوەدا، یەکێك لە هالۆجینەکان شوێنی هالۆجینێکی تر دەگرێتەوە لە ئاوێتەیەکی دیاریکراودا، فلۆر کە لە هەموو هالۆجینەکان چالاکترە، دەتوانێت شوێنی هەر هالۆجینێکی تر بگرێتەوە لەو ئاوێتانەدا کە هالۆجینیان تێدایە، چالاکی هالۆجین کەم دەکات هەرچەند بەرەو خواری کۆمەڵەی 17 بچین، دەتوانێت شوێنی هەر توخمێکی تری ژێر خۆی بگرێتەوە، بۆ نموونە، لە کاتێکدا کلۆر شوێنی برۆم دەگرێتەوە لە برۆمیدی پۆتاسیۆمدا، بەڵام ناتوانی شوێنی فلۆر بگرێتەوە لە فلۆریدی پۆتاسیۆم، کارلێکی کلۆر لەگەڵ برۆمیدی پۆتاسیۆم بەرهەم برۆم و کلۆریدی پۆتاسیۆم دەبێت، بەڵام کارلێکی فلۆر لەگەڵ کلۆریدی سۆدیۆم، فلۆریدی سۆدیۆم و گازی کلۆر بەرهەم دێنێت.

$$Cl_2(g) + 2KBr(aq) \rightarrow 2KCl(aq) + Br_2(l)$$

$$F_2(g) + 2NaCl(aq) \rightarrow 2NaF(aq) + Cl_2(g)$$

$Br_2(l) + KCl(aq) \rightarrow$ کارلێك ناکەن

## کارلێکەکانی دوانە گۆڕینەوە (جووت)

**لەکارلێکەکانی دوانە گۆڕینەوەدا double replacement reactions ، ئایۆنەکانی دوو ئاوێتە لە نێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێن لە ئاوە گیراوەیەکدا، بۆ پێکهێنانی دوو ئاوێتەی نوێ کە بەزۆری** یەکێك لەو دوو ئاوێتەیەی نیشنوو دەبێت یان گازێکی نەتواوە کە بۆ دەرەوەی گیراوەکە بەرز دەبێتەوە، یان ئاوێتەیەکی گەردی کە بەزۆری ئاو دەبێت و وە ئاوێتەی دووەم زۆربەی توانستی توانەوەی هەیە و بە تواوەیی لە گیراوەکە دا دەمێنێتەوە و کارلێکەکانی دوانە گۆڕینەوە بەم هاوکیشە گشتییە دەردەبڕێت:

$$AX + BY \rightarrow AY + BX$$

کە A و X و B و Y ئایۆنەکانی کارلێککردووەکانەو، AY و BX دوو ئاوێتەی ئایۆنی یان گەردین.



**شێوە 12-2** کارلێکی دوانە گۆڕینەوە لە نێوان گیراوەی نیتراتی قورقوشم (II)، $Pb(NO_3)_2(aq)$ و، گیراوەی یۆدیدی پۆتاسیۆم $KI(aq)$ ، نیشتووی یۆدیدی قورقوشم (II)،$PbI_2(s)$، گیراوەی نیتراتی پۆتاسیۆم پێك دێنێت $KNO_3(aq)$ .

### پەیدابوونی نیشتوو

نیشتوو، لە یەکگرتنی کاتایۆنەکان (ئایۆنی موجەب) ی کارلێککردوویەکی دیاریکراو، لەگەڵ ئانایۆنەکان (ئایۆنی سالیب) ی کارلێککردوویەکی تر بۆ پێکهێنانی ئاوێتەیەکی کەمتواوە یان نەتواوە، بۆ نموونە ئەگەر ئاوەگیراوەیەکی یۆدیدی پۆتاسیومان کردە ئاوەگیراوەیەکی نیتراتی قورقوشم (II) نیشتوویەکی زەردی یۆدیدی قورقوشم (II) مان دەست دەکەوێت، وەك شێوە 2-12 ڕوونی دەکاتەوە:

$$2KI(aq) + Pb(NO_3)_2(aq) \rightarrow PbI_2(s) + 2KNO_3(aq)$$

ئەم نیشتووە لە ئەنجامی زۆر بەهێز یەکتر ڕاکێشانی نێوان کاتایۆنەکان $Pb^{+2}$ و ئانایۆنەکانی $I^-$ پەیدادەبێت و، بەرهەمەکەی تر خوێی نیتراتی پۆتاسیۆم $KNO_3$ یە، کە لە ئاودا دەتوێتەوە و ئایۆنەکانی پۆتاسیۆم و نیترات لە ئاوە گیراوەکەدا بەشێوەی ئایۆن دەمیننەوە.

## پەیدابوونی گاز

لە هەندێ کارلێکی دووانە گۆڕینەوەدا، ڕەنگە یەکێك لە بەرهەمەکان گازێکی نەتواوە بێت، بەرز دەبێتەوە بۆ دەرەوەی تیکەڵەکە بە شێوەی بڵقی گاز، لە کاتی کارلێکی گۆگردیدی ئاسن (II) دا لەگەڵ ترشی هایدرۆکلۆریك، گازی گۆگردیدی هایدرۆجین و کلۆریدی ئاسن (II) پێك دێت.

$$FeS(s) + 2HCl(aq) \rightarrow H_2S(g) + FeCl_2(aq)$$

## پەیدابوونی ئاو

لە هەندێ کارلێکی دوانە گۆڕینەوەدا، ڕەنگە یەکێك لە بەرهەمەکان ئاوێتەیەکی گەردی جێگیر بێت، وەك ئاو بۆ نموونە، لە کاتی کارلێکی ترشی هایدرۆکلۆریك، لەگەڵ ئاوەگیراوەیەکی هایدرۆکسیدی سۆدیۆمدا، کلۆریدی سۆدیۆم و ئاو پێك دێت:

$$HCl(aq) + NaOH(aq) \rightarrow NaCl(aq) + H_2O(l)$$

## کارلێکەکانی سووتان

**لە کارلێکی سووتاندا combustion reaction ، ماددەیەکی دیاریکراو لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرن و بڕێکی زۆر وزە دەردەپەڕێت، بە شێوەی ڕووناکی و گەرمی،** شێوە 2-13 سووتانی هایدرۆجین دەردەخات، کە ئەو کارلێکەیە هەڵمی ئاو بەرهەم دێنێت:

$$2H_2(g) + O_2(g) \rightarrow 2H_2O(g)$$

نموونە لەسەر کارلێکەکانی سووتان زۆرە، وەك سووتانی گازی سروشتی و پرۆپان گازۆلین و دار، بۆ نموونە، لە گرگرتنی پرۆپان $C_3H_8$ ، دوانۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو:

$$C_3H_8(g) + 5O_2(g) \rightarrow 3CO_2(g) + 4H_2O(g)$$



(ب)                                        (أ)

**شێوە 2-13** ( أ )مۆمە داگیرساوەکە، گەرمی دەدات بەو هایدرۆجین و ئۆکسجینەی لە مێزڵدانەکەدان، کارلێکی سووتانی تەقاوە ڕوودەدات وەك لە (ب) دا دەرکەوتووە.



چالاکی کردەیی

خێرا

# بەکارهێنانی نموونە، لە هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکاندا

چاویلکەی پارێزەر لە چاوبکە و بەرگۆشە بپۆشە





**ماددەکان**

- نموونەی پلاستیکییەکان (تۆپ و چیلکە)ی ڕەنگا و ڕەنگ (بەلایەنی کەمەوە چوار ڕەنگ).

**پرس**

چۆن دەتوانیت نموونەی گەردییەکان و نموونەکانی یەکەی شێوگی ئایۆنی بەکاربهێنیت بۆ هاوسەنگکردنی هاوکێشە کیمیاییەکان و، پولاندنی کارلێکە کیمیاییەکان؟

**ڕێگا**

ئەمانەی خوارەوە بپشکنە، هاوکێشە ناتەواوەکانی کۆمەڵەکانی 1-5 ، ئەوجا ئەم نموونە پلاستیکیە ڕەنگاو ڕەنگەکان بەکاربێنە بۆ پێشاندانی گەردیلەی توخمە جیاوازەکان و پێکهێنانی نموونە بۆ پێگەیاندنی گەردیلەی دیاریکراو بە هۆی چیلکەوە ئەم نموونانە بەکاربێنە بۆ : (1) هاوسەنگکردنی دوو هاوکێشەکە أ دواتریش ب لە هەر کۆمەڵەیەکدا. (2) دیاریکردنی بەرهەم هاتووەکانی کارلێك ج لەهەر کۆمەڵەیەکدا، (3) تەواوکاری و هاوسەنگکردنی هەر هاوکێشەیە ج، پۆلاندن هەر کۆمەڵە، کارلێکێك، بە پێی جۆرەکەی.

**کۆمەڵەی 1**

أ. $H_2 + Cl_2 \rightarrow HCl$

ب. $Mg + O_2 \rightarrow MgO$

ج. $BaO + H_2O \rightarrow$ ______

**کۆمەڵەی 2**

أ. $H_2CO_3 \rightarrow CO_2 + H_2O$

ب. $KClO_3 \rightarrow KCl + O_2$

ج. $H_2O \xrightarrow{\text{کارەبا}}$ ______

**کۆمەڵەی 3**

أ. $Ca + H_2O \rightarrow Ca(OH)_2 + H_2$

ب. $KI + Br_2 \rightarrow KBr + I_2$

ج. $Zn + HCl \rightarrow$ ______

**کۆمەڵەی 4**

أ. $AgNO_3 + NaCl \rightarrow AgCl + NaNO_3$

ب. $FeS + HCl \rightarrow FeCl_2 + H_2S$

ج. $H_2SO_4 + KOH \rightarrow$ ______

**کۆمەڵەی 5**

أ. $CH_4 + O_2 \rightarrow CO_2 + H_2O$

ب. $CO + O_2 \rightarrow CO_2$

ج. $C_3H_8 + O_2 \rightarrow$ ______

## پێداچوونەوەی کەرتی 2-2

**1.** پێنج جۆر کارلێکی کیمیایی بژمێرە.

**2.** لەبەر ڕۆناکی خوێندنی کارلێکە کیمیاییەکانتدا، هەریەکەی ئەم کارلێکانەی خوارەوە بپۆلێنە:

أ. $N_2(g) + 3H_2(g) \rightarrow 2NH_3(g)$

ب. $2Li(s) + 2H_2O(l) \rightarrow 2LiOH(aq) + H_2(g)$

ج. $2NaNO_3(s) \rightarrow 2NaNO_2(s) + O_2(g)$

د. $2C_6H_{14}(l) + 19O_2(g) \rightarrow 12CO_2(g) + 14H_2O(l)$

هـ. $NH_4Cl(s) \rightarrow NH_3(g) + HCl(g$

و. $BaO(s) + H_2O(l) \rightarrow Ba(OH)_2(aq)$

ز. $AgNO_3(aq) + NaCl(aq) \rightarrow AgCl(s) + NaNO_3(aq)$

**3.** لە هەریەکەی ئەم کارلێکانەی کە دێت پێناسەی کارلێککردوویان بەرهەمهاتووە ناتەواوەکان دیاری بکەو، هاوکێشە پەیدابووەکە هاوسەنگ بکە، سەرەنج بدە هەر بۆشاییەك ماددەیەك یان زۆرتری پێویستە:

أ. یەکگرتن: $\rightarrow Li_2O$ ______

ب. لێکهەڵوەشان: $Mg(ClO_3)_2 \rightarrow$ ______

ج. تاکە گۆڕینەوە: $Na + H_2O \rightarrow$ ______

د. دوانەگۆڕینەوە: $HNO_3 + Ca(OH)_2 \rightarrow$ ______

هـ. سووتان: $C_5H_{12} + O_2 \rightarrow$ ______

**4.** بەرهەمهاتووە پێشبینیکراوەکانی هەریەکەی ئەم کارلێکانەی خوارەوە بنووسە و ئەوجا هاوکێشە پەیدابووەکە هاوسەنگ بکە و جۆری هەر کارلێکە دیاری بکە:

أ. $Br_2 + KI \rightarrow$ ______

ب. $Zn + HCl \rightarrow$ ______

ج. $Ca + Cl_2 \rightarrow$ ______

د. $NaClO_3 \xrightarrow{\Delta}$ ______

هـ. $C_7H_{14} + O_2 \rightarrow$ ______

و. $CuCl_2 + Na_2S \rightarrow$ ______

## کەرتی 3-2

# زنجیرەی چالاکێتیی توخمەکان

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- ڕوونی دەکاتەوە، چۆن زنجیرەی چالاکێتیی توخمەکان دروست دەکرێت.
- زنجیرە چالاکێتی، لە پێشبینی توانستی ڕوودانی کارلێکێکی دیاریکراودا بەکاردێنێت.

بە توانستی کارلێککردنی هەر توخمێك هەر توخمێك دەڵێن چالاکێتی توخمەکە و هەر چەندێك توخمەکە خێراتر و ئاسانتر کارلێك بکات ئەوەندە بەچالاکێتی زۆرتر دادەنرێت، **بەڵام زنجیرەی چالاکێتی activity series لیستێکی توخمەکانە، ڕێزکراوە بە پێی پلەی ئاسانی بەشداریکردنی لە هەندێ کارلێکردنی کیمیاییدا** «چالاکێتی زۆرترە» ی بە گوێرەی هەر کانزایەك، واتا هەرچەندە ئارزووی وونکردنی ئەلەکترۆنی زۆربێ و توانای پێکهێنانی ئایۆنی موجەبی زۆربێ، بەڵام بە گویرەی ناکانزا. هەرچەندێك لە وەرگرتنی ئەلیکترۆن پێکهێنانی ئایۆنی سالیبدا تواناتربێت ئەوەندە چالاکتر دەبێت. بەزۆری، ئەو پلەو پایەیەی توخمەکە لە لیستی چالاکێتیدا هەیەتی، مەودای کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە دیاری دەکات. بەوپێیە، توخمە چالاکترەکە کە لە لووتکەی زنجیرەکەدا دادەنرێت، دەتوانێ شوێنی توخمەکانی خوارخۆی بگرێتەوە لە ئاوێتەیەدا کە بەشداری کارلێکی تاکە گۆڕینەوە دەکات و هەرتوخمێکی لیستەکە، دەتوانێت شوێنی هەموو توخمێکی خوارخۆی بگرێتەوە بەڵام ناتوانیت شوێنی هیچ توخمێکی ژوور خۆی لە لیستەکەدا بگرێتەوە. زنجیرەی چالاکێتی کانزاکان لە خشتەی 3-2 دا ، ئەلومنیۆم شوێنی زینك دەگرێتەوە لە کارلێکەکاندا، بەوپێیە دەتوانین پێشبینی ڕوودانی ئەم کارلێکەی خوارەوە بکەین:

$$2Al(s) + 3ZnCl_2(aq) \rightarrow 3Zn(s) + 2AlCl_3(aq)$$

لە لایەکی ترەوە، کۆباڵت ناتوانێ شوێنی سۆدیۆم بگرێتەوە، بۆیە دەتوانین پێشبینی ئەنجامی ئەم کارلێکەی خوارەوە بکەین:

$$Co(s) + 2NaCl(aq) \rightarrow \text{کارلێك ناکات}$$

گرنگە بیرمان بکەوێتەوەکە زنجیرەی چالاکێتی، وەك هۆکارە یاریدەدەرەکانی تری پێشبینی کارلێکێکی کیمیایی، لەسەر بنچینەی تاقیکردنەوە دامەزراوە و ئەو زانیارییانەی تێدایەتی، تەنیا وەك ڕێبەرێکی گشتی پێشبینی ئەنجامی کارلێکەکان بەکاردێن بۆ نموونە زنجیرەی چالاکێتی ڕوونی دەکاتەوە چۆن هەندێ کانزای (وەك پۆتاسیۆم بۆ نموونە) زۆر توند لەگەڵ ئاو و ترشەکان کارلێك دەکات و شوێنی هایدرۆجین دەگرێتەوە و ئاوێتەی نوێ پێك دێنێت و هەندێ کانزای تری وەك ئاسن و زینك، شوێنی هایدرۆجین دەگرنەوە لە ترشەکاندا (وەك ترشی هایدرۆکلۆریك)، بەڵام لەگەڵ ئاو کارلێك ناکات تەنها ئەگەر گەرم بێت تاگەرمی هەڵمین، لە لایەکی تر نیکل شوێنی هایدرۆجین دەگرێتەوە لە ترشەکان بەڵام بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ هەڵمی ئاو کارلێك ناکات، بەڵام زێڕ، نە لەگەڵ ترش نە لەگەڵ ئاوی شل و هەڵمیش کارلێك ناکات، ئەم تێبینییە ئەزموونییانە، بنەمای بنچینەیی ئەو زنجیرەی چالاکێتییەپێك دێنێت کە خشتەی 3-2 ڕوونی دەکاتەوە.

## خشتە 3-2 زنجیرەی چالاکێتیی توخمەکان

| چالاکێتیی کانزاکان | | چالاکێتیی ناکانزا هاڵۆجینەکان |
|---|---|---|
| Li<br>Rb<br>K<br>Ba<br>Sr<br>Ca<br>Na | لەگەڵ ئاوی سارد و ترش کارلێك دەکات و شوێنی هایدرۆجین دەگرێتەوە لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکات و ئۆکسید پێك دێنێت. | $F_2$<br>$Cl_2$<br>$Br_2$<br>$I_2$ |
| Mg<br>Al<br>Mn<br>Zn<br>Cr<br>Fe<br>Cd | لەگەڵ هەڵمی ئاوی گەرم (نەك ئاوی سارد) و ترشەکان کارلێك دەکات و شوێنی هایدرۆجین دەگرێتەوە و لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکات ئۆکسید پێك دێنێت. | |
| Co<br>Ni<br>Sn<br>Pb | لەگەڵ ئاو کارلێك ناکات، بەڵام لەگەڵ ترشەکان کارلێك دەکات و شوێنی هایدرۆجین دەگرێتەوە و لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکات و ئۆکسید پێك دێنێت | |
| $H_2$<br>Sb<br>Bi<br>Cu<br>Hg | لەگەڵ ئۆکسجین کارلێکی دەکات و ئۆکسیدپێك دێنێت. | |
| Ag<br>Pt<br>Au | کەم چالاکە، بەڵام بەرێگەی ناڕاستەوخۆ ئۆکسید پێك دێنێت. | |

### پرسی نموونەیی 6-2

**زنجیرەی چالاکێتی خشتەی 3-2 بەکاربێنەوە پێشبینی بکە کام لەم کارلێکانەی خوارەوە دەشێ ڕووبدەن، ئەوسا ناوی بەرهەمهاتووەکان دیاری بکە، لە هەر کوێیەکدا پێشبینی دەکەیت کارلێك ڕوودات.**

أ. $Zn(s) + H_2O(l) \xrightarrow{50^\circ C}$ ______

ب. $Sn(s) + O_2(g) \rightarrow$ ______

ج. $Cd(s) + Pb(NO_3)_2(aq) \rightarrow$ ______

د. $Cu(s) + HCl(aq) \rightarrow$ ______

## شیکاری

أ. ئەم کارلێکەی نێوان زینك و ئاو، لە پلەی گەرمی $50^oC$ دا، ڕوونادات چونکە ئاوەکە ئەوەندە گەرم نییە ببێتە هەڵم.

ب. هەموو کانزایەکی لە زیو چالاکتر ، لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکات و ئۆکسیدپێك دێنێت، تەنەکە Sn ، دەکەوێتە سەروو زیوەوە لە زنجیرەی چالاکیدا، بۆیە لەگەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکەن و ئۆکسیدی تەنەکە SnO یان $SnO_2$ پێك دێنن.

ج. دەتوانرێت هەر توخمێك، بگۆردرێتەوە بە توخمێکی تری خوارخۆی لە زنجیرەی چالاکیدا لە ئاوێتەیەکی ناو ئاوەگیراوەیەکیدا. کادمیۆم، دەکەوێتە ژوور قورقوشمەوە، بۆیە ئەو کارلێکە لە نێوانیاندا ڕوودەدات کە قورقوشم Pbو نیتراتی کادمیۆم $Cd(NO_3)_2$ پێك دێنێت.

د. هەر کانزایەکی لە هایدرۆجین چالاکتر، شوێنی هایدرۆجینی ترش دەگرێتەوە، مس نەکەوتۆتە ژوور هایدرۆجینەوە لە زنجیرەکەدا، بۆیە کارلێکێکی چاوەڕوانکراو ڕوونادات.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** زنجیرەی چالاکی خشتەی 2-3 بەکاربهێنە و پێشبینی بکە کام لەم کارلێکانەی خوارەوە دەشێ ڕووبدات، ئەوجا بەرهەمهاتووەکان بنووسە، بەپێی پێشبینی ڕوودانی کارلێکی و دواتریش هاوکێشەکە هاوسەنگ بکە.

أ. $Cr(s) + H_2O(l) \rightarrow$ ______ .

ب. $Pt(s) + O_2(g) \rightarrow$ ______ .

ج. $Cd(s) + 2HBr(aq) \rightarrow$ ______ .

د. $Mg(s) + H_2O(g) \xrightarrow{100\ ^\circ c}$ ______ .

**2.** ئەو توخمە دیاری بکە کەبە هایدرۆجینی ترش دەگۆڕ درێتەوە بەڵام ناتوانرێ بە (تەنەکە) بگۆڕدرێتەوە لە ئاوێتەکانی.

**3.** بەپێی خشتەی (2-3) ئەو کانزا گواستراوە کامەیە کە لە هەموان چالاکترە.

وەڵامەکان:

**1.**أ. کارلێك ڕوونادات

ب. کارلێك ڕوونادات

ج. ئەم کارلێکەی خوارەوە ڕوودەدات:

$Cd(s) + 2HBr(aq) \rightarrow CdBr_2(aq) + H_2(g)$

د. ئەم کارلێکەی خوارەوە ڕوودەدات:

$Mg(s) + 2H_2O(g) \rightarrow Mg(OH)_2(aq) + H_2(g)$

**2.** قورقوشم Pb

**3.** مەنگەنیز Mn

## پێداچوونەوەی کەرتی 2-3

**1.** چۆن دەشێ زنجیرەی چالاکی بەسوودبێت لە پێشبینی ڕەفتاری کیمیاییدا؟

**2.** بە پێی زنجیرەی چالاکی، پێشبینی بکە کام لەم کارلێکانەی خوارەوە ڕوودەدەن؟

أ. $Ni(s) + H_2O(l) \rightarrow$ ______ .

ب. $Br_2(l) + KI(aq) \rightarrow$ ______ .

ج. $Au(s) + HCl(aq) \rightarrow$ ______ .

**3.** بەرهەمهاتووەکانی کارلێکە ڕوودان پێشبینکراوەکانی ڕاهێنانی 2 بنووسە و هاوکێشەکان هاوسەنگ بکە.





# ترشە ئاو – هەڕەشەیەکی نادیار

کاتێك خانوویەك دەکرێت لەگەڵ بیرە تایبەتییەکەیدا، زۆر ئاساییە کە ئاوی ئەو بیرە بپشکنیت و بە زۆری پشکنینەکە بۆ هەوڵی زانینی ئەوەی ئاخۆ ئاوەکە وردبینە زیندەوەرە، یان میکرۆبی نەخۆشی تێدایە و بەدەگمەن بایەخ بە ترشیی ئاوەکە دەدرێت.
زۆرکەس لە بەهای pH ی ئەو ئاوەی لە ماڵەکانیاندا بەکاری دێنن ناگەن مەگەر پاش ئەوەی تووشی هەندێ دیاردە نەبن وەك کەڵەکە بوونی ئەڵقەی ماددەیەکی شین لەدەوری ئەو کاشییەی ئاوەڕۆ یان کوت و پڕ وەستانی گەرمکەرە و لەکارکەوتنی، یان چەند بارەبوونەوەی مردنی ماسیی جوانی لە مۆژەکانیاندا، هەموو ئەو ڕووداوانە هۆی سەرەکیی ڕوودانیان، ئەو ترشە ئاوەیە، کە بەرپرسیشە لە بە قوڕقوشم ژاراویبوون.
شیانی بە قوڕقوشم ژاراویبوون بە هۆی ئاوی ماڵەوە زۆربەی کات خراوەتەوە پشت گوێ، لە کاتێکدا زۆربەی خانووە کۆنەکان بۆریی قوڕقوشم بەکاردێنن، بەڵام زۆربەی پارچە بۆرییەکان بەلکێنی (لەحیمی) قوڕقوشم کۆتایی دێت و دادەخرێت، ترشە ئاو دەتوانی قوڕقوشم بە شێوەی کاتایۆن (ئایۆنی موجەب) بتوێنیتەوە لە پارچە لە حیمەکان یان مس لە بۆرییەکان بتوێنیتەوە، ئەم ماددانە بۆری ئاوەڕۆی دەستشۆرەکە، شین دەکەن، سەرباری ئەوەیش، ئەوانەی ڕاهاتوون بەیانیان کوڵینەکانیان لە شێرەکە (بەلوعەکە) ڕاستەوخۆ پڕدەکەن لە ئاو، بێئەوەی ماوەیەکی کەم بەکراوەیی دای بنێن کە ئاوی لەبەربڕوات ئەو سا لێی پڕ بکەن دەشێ هەندێ ماددەی کیمیایی نەویستراو دەکەنە قاوە یان ئەو چایەی دەیخۆنەوە، بە قوڕقوشم ژاراویبوون زۆرترسناکە بۆ منداڵ، چونکە تێکڕای مژینی لە ڕیخۆڵەی منداڵدا زۆر زۆرترە لە هی گەورە و، قوڕقوشمی ژەهرین دەتوانی کۆئەندامی دەماری منداڵ تێکبدات بە شێوەیەکی بەردوام بەڵام ئەوەی جێ ی دڵنەواییە ئەو ئەوەیەکە قوڕقوشمی ژەهرین و کاریگەرییەکانی تری ترشە ئاو لەماڵدا، دەتوانرێ بە ئاسانی خۆیٚ لێ ٚ لا بدرێ، وەك خوارەوە:

1. چاودێری pH ی ئاوی ماڵەکەت بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بکە، بە تایبەتی ئەگەر سەرچاوەی ئاوەکە بیر بوو (ئاوی بیر) بوو، دەتوانیت بە ئاسانی جێبەجێ بکەیت بە هۆی کاغەزی تاقیکردنەوەی pH وە، (بڕوانە شێوەکە)، کە لە دەرمانخانە یان وردە والە فرۆش یان شوێنی فرۆشتنی گیانەوەرە ماڵییەکان دەست دەکەوێت، ئاشکرا زۆرماسی جوانی کەمەرەیی (ئیستوایی)، بەرگەی تفتە ئاوی pH زۆر، یان ترشە ئاوی pH کەم ناگرن، pH ی ئاوی خواردنەوەی شارەکان بە زۆری باش ڕێکخراوە، بەڵام هەر تاقی بکرێتەوە بۆ دڵنیایی باشترە.
2. پێش ئەوەی کوڵێنەکەت پڕ بکەیت لە ئاو، یان پێش ئەوەی بەیانیان لێی بخۆیتەوە، با شێرەکە بەلوعە، نیو دەقیقەیەك کراوە بێت ئەگەر ئاوەکە ترش بوو، ئەوا یەکەم بڕە ئاوەکە لە شێرکەکە دێتە دەرێ زۆرترین خەستی ئایۆنەکانی قوڕقوشم و مسی تێدایە.
3. چەسپکردنی ترومپای تفت پیاکردنی بۆریی سەرەکیی ئاو زۆری تێ ناچێت و، چارەسەرێکی پاراستنی هەزاران و لە هەمان کاتدا بێوەیی دەپارێزێت و شیانی بە قوڕقوشم ژاراویبوون کەم دەکاتەوە لەکاتی بەکارهێنانی ئاوی شێرەکە (ئەو ترۆمپایە بە زۆری بڕێکی کەم تفتەمەنی (کاربۆناتی پۆتاسیۆم یان کاربۆناتی سۆدیۆم) دەکرێتە تەنکی ئاوەکەوە، هەموو جارێك کە ترۆمپای بیرەکە دەخرێتە گەڕ، ئەمە بە شێوەیەکی کاریگەر بڕ ترشێتی ئاوی بەکارهێنراوی ماڵەکە ناهێڵێت، ئەم کارلێکەی خوارەوە، کاری هاوکێشکردنی ترشێتی ئاوی بیرەکە، بە هۆی کاربۆناتی پۆتاسیۆم ڕوون دەکاتەوە (بێگومان سەرچاوەی ترشێتی ئاوی بیر،باراناوی ترشە):

$$K_2CO_3(aq) + H_2SO_4(aq) \rightarrow K_2SO_4(aq) + CO_2(g) + H_2O(l)$$




دەتوانرێت، کاغەزی pH ی وەك ئەوەی لەم وێنەیەدایە، بۆ زانینی pH ی ئاوی ماڵ بەکاربهێنرێت.

# پێداچوونەوەی بەندی 2

## کورتەی بەندەکە

**1-2**

- چوار نیشانە هەن بۆ ڕوودانی کارلێکی کیمیایی، کە دەرپەڕینی ڕوناکی و گەرمییە و پەیدابوونی گازێکی دیاریکراو و گۆڕان لە ڕەنگ و پەیدابوونی نیشتوو.
- هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ، بە هێما و شێوگەکانیەوە، پێناسی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان و ڕێژە برەکانیان لە کارلێکی کیمیاییدا پیشان دەدات.

### زاراوەکان

کارلێکی پێچەوانەیی (51) reversible reaction
هاوکێشەی کیمیایی (47) chemical equation
ووشە هاوکێشە (49) word equation
نیشتوو (47) precipitate
شێوگە هاوکێشە (49) formula equation
کۆلکە (هاوکۆلکە) (48) coefficient

**2-2**

- کارلێکەکانی یەکگرتن، بەم هاوکێشە گشتییە، پیشان دەدرێت:

$$A + X \rightarrow AX$$

- کارلێکەکانی شیبوونەوە، بەم هاوکێشە گشتییە پیشان دەدرێت:

$$AX \rightarrow A + X$$

- کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە، بەیەکێك لەم دوو هاوکێشە گشتییە، پیشان دەدرێت:

$$A + BX \rightarrow AX + B$$

$$Y + BX \rightarrow BY + X$$

- کارلێکەکانی دوانە گۆڕینەوە، بەم هاوکێشەگشتییە، پیشان دەدرێت:

$$AX + BY \rightarrow AY + BX$$

### زاراوەکان

بەکارەبا شیبوونەوە (63) electrolysis
کارلێکی لادان (64) displacement reaction
کارلێکی پێکهاتن (06) compostion reaction
کارلێکی تاکە گۆڕینەوە (64) single replacement reaction
کارلێکی یەکگرتن (60) synthesis reaction
کارلێکی دوانەگۆڕینەوە (65) double replacement reaction
کارلێکی سووتان (66) combustion reaction
کارلێکی لێکهەڵوەشان (62) decomposition reaction

**3-2**

- چالاکییە زنجیرە، توخمەکان بە پێی چالاکی کیمیاییان ڕیزدەکاتو،کە بە سوودە لە پێشبینی ڕوودان یان ڕوونەدانی کارلێکی کیمیاییدا.
- کیمیاگەران، چالاکییە زنجیرە ڕێك دەخەن لە ڕێی ئەو تاقیکردنەوانەوە کە جێبەجێیان دەکەن.

### زاراوەکان

چالاکییە زنجیرە (68) activity series

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

**.1** چوار نیشانە بڵێ کە ڕوودانی کارلێکی کیمیایی پێشان بدەن.

**.2** أ. وشەی کۆلکە (یان هاوکولکە) واتای چییە، کە لە هاوکێشە کیمیاییەکاندا بەکاردێت.
ب. بوونی هاوکۆلکە، لە ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمێکدا چ کارێك دەکاتە ئەو شێوگەی لە پێشیەوە دادەنرێت؟

**.3** نموونەیەك بۆ شێوگە هاوکێشە بهێنەرەوە یەکێکیش بۆ هاوکێشەی کیمیایی.

**.4** ئەو برە زانیاریانەی لە هاوکێشەی کیمیایی دەستمان دەکەون چین؟

**.5** ئەمانەی خوارەوە پێناسە بکە:
أ. ئاوە گیراوە
ب. هاندەر
ج. کارلێکی پێچەوانە

**.6** شێوگی ئەم ئاوێتانەی خوارەوە بنووسە:
أ. هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم ب. نیتراتی کالیسیۆم
ج. کاربۆناتی سۆدیۆم

**.7** ژمارەی گەردیلەکانی هەر توخمە لەم ماددانەی خوارەوە دا چەندە؟
أ. $3N_2$ د. $2Ca(OH)_2$
ب. $2H_2O$ هـ. $3Ba(ClO_3)_2$
ج. $4HNO_3$

**.8** پێنج جۆر بنچینەکانی ئەو کارلێکە کیمیاییانەی لە بەندی 2 دا باس کراون، پێناسە بکە و هاوکێشە گشتییەکانیان بنووسە.

**.9** چی پێویستە بۆ ڕوودانی زۆربەی کارلێکەکانی شیبوونەوە.

**.10** بە کارەبا شیکردنەوە چییە؟

**.11** أ. لە چ ناوەندێکدا دەشێ زۆربەی کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە ڕوووبدەن؟ .
ب. کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوە و کارلێکەکانی شیبوونەوە و کارلێکەکانی یەکگرتن؛بەراورد بکە، لە ڕووی بری وزەی پێویستی ڕوودانیانەوە.

**.12** أ. مەبەستمان لە چالاکی کیمیایی توخم چییە؟
ب. ئەم وەسفە بۆ کانزاو ناکانزاکان ، لەچیدا جیاوازە؟

**.13** أ. چالاکییە زنجیرەی توخمەکان چییە؟
ب. ڕێکخستنی توخمەکان، لە چالاکییە زنجیرەدا، پشت بەچی دەبەستێ؟

**.14** أ. ئەو بنەما کیمیاییە چییە کە چالاکییە زنجیرە پشتی بە پێ دەبەستێ؟
ب. گرنگی شوێن یان ماوەی نێوان دوو کانزا لە چالاکییە زنجیرەدا چییە؟

## چەند پرسێك

### هاوکیشە کیمیاییەکان

**.15** هاوکێشەی کیمیایی تایبەتی هەر یەك لەم کارلێکانەی خوارەوە بنووسە، هێمای دۆخی فیزیایی گونجاوی ماددەکان بنووسە (بڕوانە پرسی نموونەیی 2-1 ).
أ. کارلێککردووەکان: گازی ئۆکسجین،گۆگردیدی زینگی ڕەق
بەرهەمهاتووەکان: گازی دوانۆکسیدی گۆگردو ئۆکسیدی زینکی ڕەق
ب. کارلێکردووەکان: ترشی هایدرۆکلۆریك، گیراوەی هایدرۆکسیدی مەگنیسیۆم
بەرهەمهاتووەکان: گیراوەی کلۆریدی مەگنیسیۆم، ئاو.

**.16** بەرستە، ئەم هاوکێشە کیمیاییانەی خوارەوە دەربڕە (بڕوانە پرسی نموونەیی 2-2 ):
أ. $2ZnS(s) + 3O_2(g) \rightarrow 2ZnO(s) + 2SO_2(g)$
ب. $CaH_2(s) + 2H_2O(l) \rightarrow Ca(OH)_2(aq) + 2\,H_2(g)$

**.17** ئەم هاوکێشانەی خوارەوە هاوسەنگ بکە:
أ. $H_2 + Cl_2 \rightarrow HCl$
ب. $Al + Fe_2O_3 \rightarrow Al_2O_3 + Fe$
ج. $Pb(CH_3COO)_2 + H_2S \rightarrow PbS + CH_3COOH$

**.18** لەم هاوکیشانەی خوارەوە وردببەرەوە و هەڵەکان دیاری بکە ئەگەر هەبوو ڕاستیان بکەرەوە و هاوکێشەکە هاوسەنگ بکە:
أ. $Li + O_2 \rightarrow LiO_2$
ب. $H_2 + Cl_2 \rightarrow H_2Cl_2$
ج. $MgCO_3 \rightarrow MgO_2 + CO_2$
د. $NaI + Cl_2 \rightarrow NaCl + I$

**.19** بۆ هەر ڕستەیەکی خوارەوە، هاوکێشەیەکی کیمیایی بنووسە:
أ. ئەلومنیۆم لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرن بۆ پێکهێنانی ئۆکسیدی ئەلومنیۆم.
ب. ترشی فسفۆریك $H_3PO_4$ لە کارلێکی نێوان دەیە ئۆکسیدی چوارە فۆسفۆر و ئاو پێك دێت.

**20.** چوارە کلۆریدی کاربۆن وەك ناوەندێکی کیمیایی لە دروستکردنی هەندێ ماددەی کیمیاییدا بەکار دێت، بەشێوەی شل، لە کارلێکی نێوان گازی کلۆر و گازی میثان ئامادە دەکرێت و لە و کارلێکەدا گازی کلۆریدی هایدرۆجین پەیدا دەبێت، هاوکێشەی هاوسەنگی کیمیایی بەرهەمهێنانی چوارە کلۆریدی کاربۆن بنووسە (بڕوانە دوو پرسی نموونەیی 2-3 و 2-4 .

**21.** لە هەر کارلێکێکی یەکگرتنی خوارەوەدا، پێناسەی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان و بەرهەمەناتەواوەکان دیاری بکە و هاوکێشە پەیدابووەکە هاوسەنگ بکە:

أ. $Mg + ____ \rightarrow MgO$

ب. $____ + O_2 \rightarrow Fe_2O_3$

ج. $Li + Cl_2 \rightarrow ____$

د. $Ca + ____ \rightarrow CaI_2$

## جۆرەکانی کارلێکە کیمیاییەکان

**22.** هاوکێشەی کارلێکە کیمیاییەکانی خوارەوە تەواو و هاوسەنگ بکە:

أ. $HgO \xrightarrow{\Delta} ____$

ب. $H_2O(l) \xrightarrow{\text{کارەبا}} ____$

ج. $Al + NiSO_4 \rightarrow ____$

د. $Na + H_2O \rightarrow ____$

هـ. $AgNO_3(aq) + NaCl(aq) \rightarrow ____$

و. $CH_4 + O_2 \rightarrow ____$

ز. $C_5H_{12} + O_2 \rightarrow ____$

**23.** ئەو ئاوێتەیەی کە لێك هەڵدەوەشێ و ئەو بەرهەمانەی خوارەوە دەدات، دیاری بکە و دواهاوکێشە هاوسەنگ بکە:

أ. ئۆکسیدی مەگنیسیۆم و ئاو.

ب. ئۆکسیدی قورقوشم (II) و ئاو.

ج. کلۆریدی لیثیۆم و ئۆکسیجین.

## چالاکییە زنجیرە

**24.** چالاکییە زنجیرەی کانزاو هالۆجینەکانی لاپەرە 69 بەکاربهێنە و دەری بخە کام توخم لە و جووتە توخمانەی خوارەوە بە تواناترە بۆ ئەوەی بە توخمێکی تر بگۆڕدرێتەوە لە ئاوێتەیەکدا؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| أ. | K و Na | هـ. | Au و Ag |
| ب. | Al و Ni | و. | Cl و I |
| ج. | Bi و Cr | ز. | Fe و Sr |
| د. | Cl و F | د. | I و F |

**25.** چالاکییە زنجیرەی خشتە 2-3 بەکاربهێنە تاکو پێشبینی ڕوودان یان ڕوونەدانی ئەم کارلێکانەی خوارەوە بکەیت، ئەوجا بەرهەمەکان بنووسە و هاوکێشەی ئەو کارلێکەی کە ڕوودەدات، هاوسەنگ بکە:

أ. $Ni(s) + CuCl_2(aq) \rightarrow ____$

ب. $Zn(s) + Pb(NO_3)_2(aq) \rightarrow ____$

ج. $Cl_2(g) + KI(aq) \rightarrow ____$

د. $Cu(s) + FeSO_4(aq) \rightarrow ____$

هـ. $Ba(s) + H_2O(l) \rightarrow ____$

**26.** چالاکییە زنجیرە بەکاربهێنە ، تاکو پێشبینی ڕوودان یان ڕوونەدانی ئەو کارلێکە یەکگرتنانەی خوارەوە بکەیت، ئەوجا هاوکێشەی کیمیایی ئەو کارلێکانە بنووسە کە ڕوودەدەن:

أ. $Ca(s) + O_2(g) \rightarrow ____$

ب. $Ni(s) + O_2(g) \rightarrow ____$

ج. $Au(s) + O_2(g) \rightarrow ____$

## پێداچوونەوەی هەمەجۆر

**27.** چالاکی زنجیرە بەکاربهێنە، بۆ ئەوەی پێشبینی باشترین کانزاکە بتوانرێت هەڵ بژێردرێت لە نێوان ئەم کانزایانە Sn، Mn، Pt دا بۆ تێدا هەڵگرتنی ترشێك بەکاربێت.

**28.** گیراوەی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم لە پیشەسازیدا لە بەکارەبا شیکردنەوەی ئاوگیراوەی کلۆریدی سۆدیۆم ئامادە دەکرێت گازی کلۆر و هایدرۆجینیش لە کارلێکە –کە پەیدا دەبێت هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگی بەرهەمهێنانی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم بنووسە و دۆخی فیزیایی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان دیاری بکە.

**29.** چالاکییە زنجیرە بەکاربهێنە بۆ پێشبینیکردنی ڕوودان یان ڕوونەدانی ئەم کارلێکانەی خوارەوە، ئەوجا هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ بۆ ئەو کارلێکانە بنووسە کە ڕوودەدەن:

أ. $Al(s) + O_2(g) \rightarrow ____$ .

ب. $Pb(s) + ZnCl_2(s) \rightarrow ____$ .

ج. $Rb(s) + Zn(NO_3)_2(aq) \rightarrow ____$ .

**30.** ژمارەی ئەو مۆڵانەیHCl چەندە کە لەکارلێکی 6.15 mol هایدرۆجین و فرەیەك کلۆر پێك دێت؟

**31.** ئەم هاوکێشانەی خوارەوە هاوسەنگ بکە:

أ. $Pb(NO_3)_2(aq) + NaOH(aq) \rightarrow Pb(OH)_2(s) + NaNO_3(aq)$

ب. $Al(OH)_3(s) + H_2SO_4(aq) \rightarrow Al_2(SO_4)_3(aq) + H_2O(l)$

## بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

**32. پێوەندی ڕێنماییەکان:** چالاکییە زنجیرە، لە ڕێی بەراوردی کارلێکەکانی تاکە گۆڕینەوەی نێوان کانزاکانەوە دروست دەکرێت، بەدامەزراندن لەسەر تێبینی ئەم کارلێکە، دەتوانرێت چالاکی کانزاکان پۆلین بکرێن و ڕیز بکرێ بە پێی توانستی کارلێککردنیان، هەروەها دەتوانرێت چالاکی لە ڕێگەی ئەو ئاسانییەوە لێك بدرێتەوە کە گەردیلەی کانزاکان ئەلیکترۆنی پێ ون دەکەن، ئەو زانیاریانەی سەرەوە بەکاربهێنە بۆ دیاریکردنی شوێنی کانزا چالاکترەکان و کانزا کەمچالاکترەکان لە خشتەی خولیدا، زانیارییەکەت چڕبکەرەوە و بشتیان پێ ببەستە بۆ ئەوەی لێکدانەوەی گونجاوت هەبێت بۆ پێوەندی نێوان چالاکی ئەم کانزایانە و شوێنەکانیان لە خشتەی خولیدا.

**33. شیکاری ئەنجامەکەت :** چالاکییە زنجیرەی توخمە گریمانەییەکانی A، J، Q، Z بنیات بنێ بەبەکارهێنانی ئەم زانیارییانەی خوارەوە:

$$A + ZX \rightarrow AX + Z$$

$J + ZX \rightarrow$ کارلێك ڕوونادات

$$Q + AX \rightarrow QX + A$$

## توێژینەوە و نووسین

**34.** لە بارەی پێشکەوتنی تەکنیکی (هونەری) فلۆراندنی ئاوی خواردنەوە بدوێ، چاکە و خراپەی بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە چییە؟

**35.** سەر لە نزیکترین ناوەندی بەرگری شارستانی بدە و ڕاپۆرتێکی زانستی بنووسە، جۆرەکانی ئاگر کوژێنەوە وە بەکارهێنراوەکانی تێدا بژمێرە و جیاکەرەوەی هەریەکەیان بلێ، بە ئاگر کوژێنەوەی ترشی گۆگردیك و سۆدا، کۆتایی بهێنە، هاوکێشەکان بەکاربهێنە بۆ لێکدانەوەی ئەوەی ڕوودەدات لە کاتی بە کارهێنانی ئاگر کوژێنەوەکەدا.

## برییە هەڵسەنگاندن

**36. هەڵسەنگاندنی جێبەجێکاری :** لە ماوەی هەفتەیەکدا هەموو ئەو بارانەی دەور و بەرت بنووسە، کە بە شێوەیەکی ڕوون نیشانەی گۆڕانێکی کیمیایین، کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان و نیشانەکانی ڕێنمایی دیاری بکە لەسەر ڕوودانی کارلێکی کیمیایی. هەریەکە لە و کارلێکە کیمیاییانە، بپۆلێنە، بە پێی ئەو نموونانەی کە لەم بەندەدا گفت و گۆی لەسەر کراوە.

**37.** نەخشەی کۆمەڵە تاقیکردنەوەیەك بکێشە، کەوات لێ بکەن بتوانیت چالاکییە زنجیرەی توخمەکانی Al، Cr، Fe، Mg دروست بکەیت، بەبەکارهێنانی ئەم جووتانە:

أ. ئەلەمنیۆم و کلۆریدی ئەلەمنیۆم.
ب. کرۆم و کلۆریدی کرۆم (III)
ج. ئاسن و کلۆریدی ئاسن (II)
د. مەگنیسیۆم و کلۆریدی مەگنیسیۆم.

# ژمارکارییە کیمیاییەکان




ژمارکارییە کیمیاییەکان، پردی نێوان کارلێکێك کە لە بەردەمتدا لە بۆرییەکی تاقیکردنەوەدا دەیبینیت و بەرهەمێکی دروستکراوە کە لە ژیانتدا بەکاری دەهێنێت.

## کەرتی 3-1

### نیشانەکانی ڕاپەڕین

- چەمکی ژمارکارییە کیمیاییەکان دەناسێنێ.
- باسی بایەخی ڕێژەیی مۆڵی دەکات لە ژمارکارییە کیمیاییەکاندا.
- ڕێژەی مۆڵی دەنووسرێت، تاکو دوو ماددە پێکەوە ببەستێ لە هاوکێشەی کیمیاییدا

# پێشەکییەك، لە ژمارکارییە کیمیاییەکاندا

زۆربەی زانیارییەکانمان لە کیمیادا، لەسەر بڕە شیکاری وردی ئەو ماددانەی بەشداری دەکەن لەکارلێکە کیمیاییەکاندا دامەزراوە، **ژمارکارییە کیمیاییەکانی پێکهاتن composition stoichiometry** لەبارستە پێوەندی نێوان توخمەکانی ئاوێتە دەدوێت، بەڵام ئەو **ژمارکارییە کیمیاییەی لە سەر کارلێك دامەزراوە، reaction stoichiometry** لە بارستە پێوەندی نێوان ماددە بەشدارەکانی کارلێکی کیمیایی (کارلێککردووەکان) و ماددە لێ پەیدابووەکانی (بەرهەمهاتووەکان) دەدوێت. ژمارکارییە کیمیاییەکانی لەسەر کارلێك دامەزراوەکان، کە بابەتی ئەم بەندەمانە، پشت بە هاوکێشەکیمیاییەکان و،یاسای پاراستنی بارستە دەبەستێت و،هەموو ژمارکارییە کیمیاییە لە سەر کارلێك دامەزراوەکان، بەهاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ balanced equation دەست پێ دەکات کە هاوکۆلکەکانی، ڕێژە مۆڵییەکانی ماددە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان دەردەخات.

### پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییەکان کە لەسەر کارلێکردن دامەزراون

دەتوانرێت پرسەکانی ئەو ژمارکارییە کیمیاییە لەسەر کارلێك دامەزراوانەی لەم بەندەدا هەن، پۆلین بکرێن بەپێی ئەو زانیاریانەش لە پرسەکەدا دراون و ئەو زانیاریانەش کە پێشبینی دەکرێت بدۆزرێنەوە، لە ماددە کارلێککردوو یان بەرهەم هاتووەکان بن، یان ڕەنگە یەکێکیان کارلێککردوو، ئەوەی تر بەرهەمهاتوو بێت، ئاسایی، بارستە بەگرام دەردەبڕدرێت، بەڵام ڕێکەوتی پرسی وا دەکەیت، ئەندازەی پێوانی گەورەی وەك Kg و هی تری بچووك وەك mg ی بەکارهێناوە، پرسی ژمارکارییە کیمیاییەکان، بەبەکارهێنانی ئەو ڕێژانەی لە هاوکێشە کیمیاییە هاوسەنگەکان وەرگیراون شیکاری دەکرێن، بۆ گۆڕینی بڕی دراو لەم بارانەی خوارەوەدا:

**پرسەکانی جۆری یەکەم:** بڕە زانراو و نەزانراو بەمۆڵ پێوراوەکان.

**پرسەکانی جۆری دووەم:** بڕی دراوە بەمۆڵ پێوراو و بارستەی نەزانراوە بەگرام دەربڕدراوەکان.

**پرسەکانی جۆری سێیەم:** بارستەی دراو بەگرام و نەزانراو بەمۆڵ پێوراوەکان.

**پرسەکانی جۆری چوارەم:** بارستەی دراو بەگرام و بارستەی نەزانراویش بەگرام پێوراوەکان.

## ڕێژەی مۆڵی

بۆ شیکاری هەر پرسێك لە پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییە لەسەر کارلێك دامەزراوەکان، پێویستە ڕێژەی مۆڵی بەکار بێت، ئەویش، بۆ گۆڕینی مۆڵ یان گرامی ماددە بەشدارەکانی کارلێکێکی کیمیایی بۆ مۆڵ یان گرامی ماددەیەکی تری ئەو کارلێکە. ڕێژەی مۆڵی **mole ratio** ، بریتی یە لە هاوکۆلکەی گۆڕینی بڕی دوو ماددەیە لە هەر کارلێکێکی کیمیاییدا، بۆ مۆڵ و دەتوانین ڕاستەو خۆ لە هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگەکەوە بگەینە ڕێژەی مۆڵی. بۆ نموونە، هاوکێشەی بەکارەبا شیکردنەوەی ئۆکسیدی ئەلومنیۆم بۆ بەرهەمهێنانی ئەلۆمنیۆم و ئۆکسجین.

$$2Al_2O_3(l) \rightarrow 4Al(s) + 3O_2(g)$$

لە هاوکێشەکەی سەرەوەدا، 2 mol ئۆکسیدی ئەلومنیۆم لێك هەڵدەوەشێت بۆ پێکهێنانی 4 mol ئەلومنیۆم و 3 mol گازی ئۆکسجین. دەتوانین ئەم پێوەندییانە، بەم ڕێژە مۆڵییانەی خوارەوە دەربڕین:

$$\frac{2\ mol\ Al_2O_3}{4\ mol\ Al} \quad و \quad \frac{4\ mol\ Al}{2\ mol\ Al_2O_3}$$

$$\frac{2\ mol\ Al_2O_3}{3\ mol\ O_2} \quad و \quad \frac{3\ mol\ O_2}{2\ mol\ Al_2O_3}$$

$$\frac{4\ mol\ Al}{3\ mol\ O_2} \quad و \quad \frac{3\ mol\ O_2}{4\ mol\ Al}$$

بە پێی لێك هەڵوەشانی ئۆکسیدی ئەلومنیۆم، ڕیژەی مۆڵی پەسەندتر ئەو ڕێژەیەیە، کە وەك هاوکۆلکەی گۆڕین بەکارهێنراوە، ئەویش بۆ گۆڕینی بڕی ماددەی دراو، لە مۆڵەوە بۆ بڕێکی هاوتای ماددەیەکی تری بە مۆڵ داواکراو. بۆ بە مۆڵ دیاریکردن، بڕی ئەو و ئەلومنیۆمەی کە دەتوانرێت لە 13.0 mol ئۆکسیدی ئەلومنیۆم بەرهەم بهێنرێت، پێویستە ڕێژەی مۆڵی لەبار (گونجاو) بەکاربهێنین، کە ڕێژەی پێویستی گۆڕینی $Al_2O_3$ یە بۆ Al .

$$13.0\ \cancel{mol\ Al_2O_3} \times \frac{4\ mol\ Al}{2\ \cancel{mol\ Al_2O_3}} = 26.0\ mol\ Al$$

ئاسایی، ڕێژە مۆڵییەکان، ژمارەی تەواودەبن، بۆیە ئەو ژمارەی ڕەنووسە واتاییەکانی هیچ ژمارەیەك دیاری ناکات، بەڵکو ژمارەی ڕەنووسە واتاییەکان، تەنیا لە وەڵامدا دیاری دەکرێت، بەژمارەی ڕەنووسە واتاییەکانی دراوەکانی ئەو پرسە.

## بارستەی مۆڵی

پێشتر، فێری ئەوەبوویت، کە بارستەی مۆڵی، دەکاتە (بارستە بەگرام) بۆ مۆڵێکی ماددەکە و بارستەی مۆڵی، هاوکولکەیەکی گۆڕینە، کە بارستەی ماددەیەك دەبەستێت بە بڕەکەیەوە بە مۆڵ و لە خشتەی خولییەوە دەستمان دەکەوێت.
بەگەرانەوە بۆ نموونەکەی پێشوو، کە تایبەت بوو بە لێکهەڵوەشانی ئۆکسیدی ئەلومنیۆم، بەهای بارستە مۆڵییە نزیکخراوەکان، کەلەخشتەی خولی وەرگیراون وەك خوارەوە:

$$Al_2O_3 = 101.96\ g/mol \quad O_2 = 32.00\ g/mol \quad Al = 26.98\ g/mol$$

ئەم بارستە مۆڵییانە، بەم هاوکۆڵکەی گۆرینانەی خوارەوە، دەردەبڕێن:

$$\frac{1\ mol\ Al_2O_3}{101.96\ g\ Al_2O_3}$$

$$\frac{1\ mol\ Al}{26.98\ g\ Al}$$

$$\frac{1\ mol\ O_2}{32.00\ g\ O_2}$$

بۆ دۆزینەوەی ژمارەی گرامەکانی ئەلەمنیۆم، لە 26.0 mol ئەلەمنیۆم، ژمارکارییەکان وەك خوارەوە ڕوودەدات:

$$26.0\ \cancel{mol\ Al} \times \frac{26.98\ g\ Al}{\cancel{mol\ Al}} = 701\ g\ Al$$

### پێداچوونەوەی کەرتی 1-3

1. مەبەست لە چەمکی ژمارکارییە کیمیاییەکان چییە؟
2. چۆن ڕێژەی مۆڵی لە کارلێکێکی کیمیایی دیاریکراو دەرهێنراو، لە پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییەکاندا بە کار دەهینرێت؟
3. ڕێژە مۆڵییە شیاوەکانی هەریەك لەم هاوکێشانەی خوارەوە بدۆزەرەوە.

أ. $2HgO(s) \rightarrow 2Hg(l) + O_2(g)$

ب. $2Al(s) + 3H_2SO_4(aq) \rightarrow Al_2(SO_4)_3(aq) + 3H_2(g)$

# پێکهاتنی کیمیایی ڕۆنی زەیتون

لە وتارێکی دکتۆر (زغلول النجار) ەوە.

داری زەیتون، درەختێکی تەمەندرێژی هەمیشە سەوزە، زۆر بەرگەگرە بۆ وشکایی و، بەرەکەی، گرنگترین بەری ڕۆنی ڕووەکییە، ڕۆنەکەی 60% تا 70% ی تێکڕای کێشی بەرەکەی پێکدێنێت.

ڕۆن زەیتون لە چەند ئاوێتەیەکی کیمیایی گرنگ پێك دێت، وەك ئاوێتەکانی گلیسرین و ئەو ترشە چەورییانەی پێیان دەڵێن گلیسرایدەکان glycerides، ترشی چەوری ڕێژەیەکی زۆری ڕۆنەکە پێك دێنێت، بۆیە ڕەوشتەکانی هەر ڕۆنێك، تارادەییەکی زۆر بەندە بە جۆری ئەو ترشە چەورییە وەکە ئاوێتەی گلیسریدەکانی پێك دێنن.بە بەناوبانگترینی ئەو ترشە چەورییانەی لە زەیتوون و ڕۆنەکان بە گشتیدا هەن ئەمانەن:

1.ترشی ڕۆنی زەیتون (ئۆلییك) oleic acid
2. ترشی ڕۆنی خورما (پاڵمیتیك) palmatic acid
3. ترشی ڕۆنی کەتان (لینۆلییك) linoleic acid
4. ترشی ڕۆنستیاریك (ستیاريك) stearic acid
5. ترشی شاراوە (میستریك) mystric acid

سەرباری ئەمانە ڕۆنی زەیتوون پرۆتین و ڕێژەی جیاواز ئەم توخمانەی تێدایە: پۆتاسیۆم، کالیسیۆم، مەگنیسیۆم، فۆسفۆر، ئاسن، مس ،گۆگرد و هی تریش، سەرەڕای ڕێژەیەك ریشاڵ، ئەم پێکهێنانە لە دروستکرنی نزیکەی هەزار ئاوێتەی کیمیایی گرنگ، لە



ڕۆن زەیتوندا هەیە، کە هەموویان بەسوودن بۆ لەشی مرۆڤ و هەندێکیشیان بۆ بێوەیی پێویستن، لەمەوە بە پەسندترین ڕۆنی ڕووەکی دانراوە و جگە لە ڕەوشی کەمکردنەوەی پەستانی خوێن و کەمکردنی کۆلیسترۆڵ مژینی لەلایەن لەشەوە بە شێوەیەکی گشتی کەمکردنەوەی تێکڕای گشتی کۆلیسترۆڵ لە خوێن بە نزیکەی 13% و، کەمکردنەوەی تێکڕای کۆلیسترۆڵی زیانبەخش لە خوێندا کە پێی دەڵێن سووکە کۆلیسترۆڵ LDL (low density lepidoprotein) بە ڕێژەی 21% ، بەوەیش ڕێژەی کۆلیسترۆلی بەسوود لە خوێندا زۆر دەبێت، کە ناسراوە بە کۆلیسترۆڵی قورس HDL (high density lepidoprotein) . لە ڕووی پزیشکییەوە سەلمێنراوەکە هەرچەندێك ڕێژەی کۆلیسترۆڵی بەزیان کەم بکات، ئەوەندە ڕێژەی

کۆلیسترۆڵی بەسوود زۆردەبێت و ڕێژەی تووشبوونی خوێن مەیینی دڵ کەم دەکات، بۆیە بەبڕی ڕێك و پێك خواردنی دەبێتە هۆی پاراستنی دڵ لە نەخۆشی داخرانی خوێنبەرەکان کە فراوانترین نەخۆشی سەردەمە، بە تایبەتی لەو دەوڵەتە دەوڵەمەندانەدا کە خەڵکەکەیان زۆر خۆرن و، بینراوە کە تووشبوونی نەخۆشی خوێنبەرەکانی دڵ، لەناوچەی دەریایی سپی ناوەڕاستدا کەمترین ڕێژەیە لە جیهاندا، بە تایبەتی لە وولاتانەدا کە خەڵکەکەی زەیتوون و ڕۆنەکەی بە زۆری و ڕێك و پێکی دەخۆن بە شیکاری ورد سەلمێنراوە کە رونی زەیتوون چەند ئاوێتەیەکی کیمیایی تێدایە کە ناهێڵێت خوێن بمەییێت، بۆ یە پزیشکەکان ئامۆژگاری ئەوانە دەکەن کە خوێنبەرەکانیان بۆ فراوان کراوە، ڕۆژانە 4-5 کەوچك ڕۆن بخۆن وەك بەشێك لە چارەسەر.

کەرتی 2-3

# ژمارکارییە کیمیاییە بیردۆزەییەکان (نموونەییەکان)

## نیشانەکانی ڕاییکاری

- بڕی کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکان (بەمۆڵ) دەدۆزێتەوە، لە بڕی بە مۆڵی کارلێکردوو بەرهەمهاتووی ترەوە.
- بارستایی کارلێکردوو یان بەرهەم، لە بڕی مۆڵەکانی کارلێککردوو یان بەرهەمهاتووی ترەوە دەدۆزێتەوە.
- بڕی کارلێکردوو یان بەرهەم بەمول، لە بارستەی کارلێکردوو یان بەرهەمی ترەوە دەدۆزێتەوە.
- بارستەی کارلێککردوو یان بەرهەم، لە بارستەی کارلێککردوو یان بەرهەمهاتووی ترەوە دەدۆزێتەوە

هاوکێشەی کیمیایی کارێکی زۆر گرنگی هەیە لە هەموو ژمارکارییە کیمیاییەکاندا، چونکە ڕێژەی مۆڵی ڕاستەوخۆ لە هاوکێشەوە دەست دەکەوێت و بۆ شیکاری هەر پرسێك لە پرسەکانی ژمارکاری کیمیایی پێویستە بە هاوکێشەی هاوسەنگ دەست پێ بکەین. هاوکێشە کیمیاییەکان یاریدەدەرن لە دانانی پێشبینی لەبارەی کارلێکی کیمیاییەوە بێ ئەوەی پێویست بە ئەنجامدانی کارلێککە بکات لە تاقیگەکەدا، ئەو ژمارکارییانەی لەم بەندەدا باس کراون، ژمارکاری بیردۆزین (تیۆرین) و باسی بڕی مادده کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکانی کارلێکێکی کیمیایی دەکات کە لە بارودۆخێکی نموونەییدا ڕوویان دابێت، کە ماددەی کارلێککردوو هەمووی دەگۆڕدرێت بۆ ماددەی بەرهەمهاتوو ئەم بارودۆخە نموونەییانە، بەگران کردەییانە دەستەبەر دەکرێن، لەگەڵ ئەوەیشدا، ژمارکارییە کیمیاییەکان، ئامانجێکی گرنگ دەبن، ئەویش دەرخستنی زۆرترین بڕی بەرهەمەکە دەستمان بکەوێت بێ ئەوەی پێویست بەکردنی کارلێککردنی تاقیگەیی بکات. شیکاری پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییەکان ڕاهێنانی زۆرتری دەوێت، شیکاری پرسی نموونەیی، ڕێك و پێك، یارمەتیت دەدات لە سەرکەوتن بۆ دانانی شیکاری ئەو پرسانە.

## گۆڕینەوەی بڕە بە مۆڵ دەربڕدراوەکان

لەم پرسانەی ژمارکارییەکیمیاییانەدا، داوات لێ دەکرێت بڕی مۆڵەکانی ماددەیەك بدۆزیتەوە کە کارلێك دەکات یان لە بڕە ماددەیەکی تر بەرهەم دەهێنرێت کە بەمۆڵ پێوراوە. ئەو نەخشەی ڕاییکارییەی پێویستە چاودێری بکرێت لە پرسی گۆڕینی مۆڵدا ئەمەیە:

بڕی ماددەی دراو (مۆڵ) ← بڕی ماددەی نەزانراو (بەمۆڵ)

ئەم نەخشەیە پێویستی بەیەك هاوکۆڵکەی گۆڕین هەیە، کە ڕێژەی مۆڵی ماددەیەکی نەزانراوە بۆ مادده دراوەکە، ئەویش بە بەکارهێنانی هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ، بۆ شیکاری ئەم جۆرە پرسانە، بڕی دراو لەگەڵ هاوکۆلکەی گۆڕینی گونجاو لێك بدە:

بڕی نەزانراو = بڕی دراو × هاوکۆلکەی گۆڕین




**شێوە 1-3** نەخشەی شیکاری ئەو پرسانەی کە هەر یەکەی کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان بەمۆڵ دەردەبڕێت.

## پرسی نموونەیی 1-3

**لە کەشتییەکی ئاسمانیدا، دەتوانرێت خۆ لەو دوانۆکسیدی کاربۆنەی لە هەناسەدانەوەی دەستەی کەشتییەکە پەیدا دەبێت ڕزگار بکرێت، بەکارپێ کردنی لەگەڵ هایدرۆکسیدی لیثیۆم LiOH، بە پێی ئەم هاوکێشەیە:**

$$CO_2(g) + 2LiOH(s) \rightarrow Li_2CO_3(s) + H_2O(l)$$

**ژمارەی مۆڵەکانی هایدرۆکسیدی لیثیۆمی پێویست بۆ کارلێك لەگەڵ 20 mol $CO_2$ دا چەندە، کە تێکڕای ئەو $CO_2$، یە کە لە هەناسەدانەوەی یەك کەس پەیدا دەبێت لە ڕۆژێکدا؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** بڕی $CO_2$ = 20 mol

**نەزانراو:** بڕی LiOH بە مۆڵ

**2 نەخشە بکێشە**

بڕی $CO_2$ (بەمۆڵ) ← بڕی LiOH (بەمۆڵ)

ئەم پرسە، پێویستی بە هاوکۆلکەی گۆڕینێك هەیە، کە ڕێژەی مۆڵی LiOH و $CO_2$ە، ڕێژەی مۆڵیت لە هاوکێشەی هاوسەنگەوە دەست دەکەوێت و لە بەر ئەوەی دراو بڕی مۆڵەکانی $CO_2$ ، پێویستیت بەو ڕێژەی مۆڵییەدەبێت کە مۆڵەکانی LiOH ت دەداتێ لە وەڵامی کۆتاییدا، ڕێژە تەواوەکە بەم جۆرەیە:

$$\frac{\text{mol LiOH}}{\text{mol } CO_2}$$

ئەم ڕێژەیەکەی mol LiOH دەدات لە وەڵامەکەدا.

$$\text{mol } CO_2 \times \frac{\text{mol LiOH}}{\text{mol } CO_2} = \text{mol LiOH}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بەهاکان، لە هاوکێشەکەدا بگۆڕەوە، لە هەنگاوی 2 داو ئەنجام بدۆزەرەوە:

$$20 \cancel{\text{mol } CO_2} \times \frac{2 \text{ mol LiOH}}{1 \cancel{\text{mol } CO_2}} = 40 \text{ mol LiOH}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وەڵامەکە، بە شێوەیەکی ڕاست نزیك بخەرەوە لە ڕەنووسێکی واتایی، تاکو لەگەڵ 20 mol $CO_2$ بگونجێت و یەکەکان کورت دەکرێنەوە بۆ ئەوەی تەنیا mol LiOH بمێنێتەوە کە نەزانراوەکەیە.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

1. گازی ئەمۆنیا $NH_3$ بە شێوەیەکی فراوان لە پەینسازی کیمیاییدا بە کاردێت، ژمارەی مۆڵەکانی ئەمۆنیای بەرهەمهاتوو لە کارلێکی 6 mol گازی هایدرۆجین لەگەڵ فرەیەك گازی نیترۆجیندا بدۆزەرەوە.

2. لێکهەڵوەشانی کلۆراتی پۆتاسیۆم $KClO_3$ وەك سەرچاوەیەکی ئۆکسجین لە تاقیگەدا بەکاردێت، ژمارەی مۆڵەکانی $KClO_3$ پێویست چەندە بۆ بەرهەمهێنانی 15 mol لە ئۆکسجین؟

وەڵامەکان:
1. 4 mol $NH_3$
2. 10. mol $KClO_3$

## گۆڕینی بڕێك بە مۆڵ بۆ بارستە

لەم جۆرە ژمارەکارییە کیمیاییانەدا، داوات لێ دەکرێت بارستەی ماددەیەك بدۆزیتەوە (کەئاسایی بە گرام دەبێت) کارلێك دەکات یان بەرهەم دێت لە بڕێکی دراوی ماددەیەکی تری بەشدار لە هەمان کارلێکدا بە مۆڵ، ئەو جێبەجێکارییەی دەکرێت لە گۆڕینی مۆڵەکان بۆ گرام بەم جۆرەیە:

بڕی ماددەی دراو (بەمۆڵ) ← بڕی ماددەی نەزانراو (بەمۆڵ) ← بارستەی ماددە نەزانراوەکە (بەگرام)

ئەم شیکارییە، دوو هاوکۆڵکەی گۆڕینی پێویستە کە ئەمانەن: ڕێژەی مۆڵیی ماددە نەزانراوەکە بۆ ماددەی دراوەکە و، بۆ شیکاری ئەو جۆرە پرسانە، دەبێت بڕە دراوە کە بڕەکەی بەمۆڵە، لەگەڵ هاوکۆڵکەیەکی گۆڕینی گونجاو و لێك بدرێن:

**شێوە 2-3** ئەمە هێڵکارییەکی شیکاری ئەو پرسانەیەکە بڕی دراو بە مۆڵ دەردەبڕدرێت و بڕی نەزانراویش بەگرام.




بڕی ماددەی دراو بە مۆڵ mol X بارستە $\frac{\text{گم}}{\text{مۆل}}$ g/mol = بڕی ماددەی نەزانراو بە گرام g

### پرسی نموونەیی 2-3

**لە کردەی ڕۆشنە پێکهاتن، ڕووەکان وزەی خۆر بەکاردێنن بۆ بەرهەمهێنانی گلوکۆز $C_6H_{12}O_6$ و ئۆکسجین لە ڕێی کارلێکی دوانۆکسیدی کاربۆن و ئاوەوە. بارستەی گلوکۆز بە گرام چەندە کە لە کارلێکی 3.00 mol ئاو لەگەڵ دوانۆکسیدی کاربۆن پێك دێت؟**

### شیکاری

1 **شی بکەرەوە**
دراو: بڕی ئاو $H_2O$ = 3.00 mol
نەزانراو: بارستەی $C_6H_{12}O_6$ ی بەرهەمهاتوو بە گرام.

**2 نەخشە بكێشە**

سەرەتا هاوكێشەی كیمیایی بنووسە و هاوسەنگی بكە

$$6CO_2(g) + 6H_2O(l) \rightarrow C_6H_{12}O_6(s) + 6O_2(g)$$

بۆ شیكاری ئەم پرسە، دوو هاوكۆڵكەی گۆڕینمان دەوێت، كە ڕێژەی مۆڵی گلوگۆز بۆ ئاو و، بارستەی مۆڵی گلوگۆز.

ڕێژەی مۆڵی — بارستەی مۆڵی

$$mol\ H_2O \times \frac{mol\ C_6H_{12}O_6}{mol\ H_2O} \times \frac{g\ C_6H_{12}O_6}{mol\ C_6H_{12}O_6} = g\ C_6H_{12}O_6$$

**3 بدۆزەرەوە**

خشتەی خولی بەكار بهێنە بۆ دۆزینەوەی بارستەی مۆڵی $C_6H_{12}O_6$.

$$C_6H_{12}O_6 = 180.18\ g/mol$$

$$3.00\ mol\ H_2O \times \frac{1\ mol\ C_6H_{12}O_6}{6\ mol\ H_2O} \times \frac{180.18\ g\ C_6H_{12}O_6}{1\ mol\ C_6H_{12}O_6} = 90.1\ g\ C_6H_{12}O_6$$

**4 هەڵسەنگێنە**

ڕەنووسەكە نزیك دەكرێتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی تەواو، تاكو لەگەڵ $3.00\ mol\ H_2O$ بگونجێت ئەو یەكانەی لە پرسەكەی پێشوودا كورت كرانەوە $g\ C_6H_{12}O_6$ لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە وەك یەكەیەك لەوەلامدا كە لەگەڵ یەكەی نەزانراو هاوجووت دەبن.

## پرسی نموونەیی 3-3

**بارستەی ئەو دوانۆكسیدی كاربۆنەی كە پێویستە لەگەڵ 3.00 mol ئاو یەك بگرێت بە گرام چەندە، لە كارلێكی ڕۆشنەپێكهاتن، لە پرسی نموونەیی 2-3 دا باس كراوە؟**

**شیكاری**

**1 شی بكەرەوە**

**دراو:** بڕی $H_2O$ = 3.00 mol

**نەزانراو:** بارستەی $CO_2$ بەگرام

**2 نەخشەبكێشە**

هاوكێشەی كیمیایی هاوسەنگ لە پرسی نموونەیی 2-3 دا بەم جۆرەیە:

$$6CO_2(g) + 6H_2O(l) \rightarrow C_6H_{12}O_6(s) + 6O_2(g)$$

بۆ شیكاری پرسەكە پێویستیمان بە دووهاوكۆڵكەی گۆڕین هەیە، ڕێژەی مۆڵی $CO_2$ بۆ ئاو، بارستەی مۆڵی $CO_2$.

ڕێژەی مۆڵی — بارستەی مۆڵی

$$mol\ H_2O \times \frac{mol\ CO_2}{mol\ H_2O} \times \frac{g\ CO_2}{mol\ CO_2} = g\ CO_2$$

**3 بدۆزەرەوە**

خشتەی خولی بەكاربهێنە بۆ دۆزینەوەی بارستەی مۆڵی $CO_2$ .

$$3.00\ mol\ H_2O \times \frac{6\ mol\ CO_2}{6\ mol\ H_2O} \times \frac{44.01\ g\ CO_2}{mol\ CO_2} = 132\ g\ CO_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وەڵامەكەت نزیك بكەرەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی تەواو تاكو لەگەڵ $3.00\ mol\ H_2O$ بگونجێت، یەكەكان كورت دەكرێنەوە و تەنیا $CO_2$ (g) دەمێنێتەوە ئەویش نەزانراوەكەیە.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** کە مەگنیسیۆم لە هەوادا بسوتێت، لەگەڵ ئۆکسجین یەك دەگرێت بۆ پێکهێنانی ئۆکسیدی مەگنیسیۆم، بە پێی ئەم هاوکیشەیە:

$$2Mg(s) + O_2(g) \rightarrow 2MgO(s)$$

بارستەی ئۆکسیدی مەگنیسیۆم بە گرام کە لە 2.00 mol مەگنیسیۆم بەرهەم دێت چەندە؟

**2.** بارستەی ئۆکسجین بەگرام کە لەگەڵ 2.00 mol مەگنیسیۆم یەك دەگرێت لە کارلێکی پێشوودا چەندە؟

**3.** بارستەی گلوگۆزی پەیدا بوو لە کارلێکی ڕووناکییە پێکهاتن بەگرام چەندە کە 10 mol دوانۆکسیدی کاربۆن بەکاربهێنێت؟

$$6CO_2(g) + 6H_2O(l) \rightarrow C_6H_{12}O_6(aq) + 6O_2(g)$$

وەڵامەکان:

**1.** 80.6 g MgO

**2.** 32.0 g $O_2$

**3.** 300 g $C_6H_{12}O_6$

## گۆڕینی بارستە، بۆ بڕ بە مۆڵ

لەم جۆرە زمارکارییە کیمیاییانەدا، داوادەکرێت بڕی یەکێك لەو ماددانەی کارلێك دەکەن یان لە بارستەیەکی ماددەیەکی دراوی تر بەرهەم دێن لەم جۆرە پرسانەدا، بە بارستەی (کەڕەنگە بەگرام پێورابێت) لە ماددەیەکی دیاریکراو دەست پێ بکرێت، ئەو جێبەجێکارییەی بۆ شیکاری دەیکەیت، بەمجۆرە دەبێت:

بڕی ماددەی دراو (بەگرام) ← بڕی ماددەی دراو (بەمۆڵ) ← بڕی ماددەی نەزانراو (بەمۆڵ)

هەروەها بۆ ئەم شیکارییە، دوو زانیاریی تریش پێویستە: بارستەی مۆڵی ماددەی دراو و ڕێژەی مۆڵی. بارستەی مۆڵی، بەبەکارهێنانی بارستە لە خشتەی خولی دیاری دەکرێت، بۆ گۆڕینی بارستەی ماددەیەك بۆ مۆڵ، ئەو هاوکولکەی گۆڕینە بەکاردێت کە پێی دەڵێن بارستەی مۆڵی پێچەوانە، کە دەکاتە هەڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی $\frac{1}{\text{بارستەی مۆڵی}}$ بۆ شیکاری ئەم جۆرە پرسانە، بڕە زانراوەکە، لەگەڵ هاوکۆلکەی گۆڕینی گونجاو لێك دەدرێن یان دابەش دەکرێت .بەسەریدا، وەك خوارەوە.




**شێوە 3-3** جێبەجێکاریی شیکاری لەو پرسانەدا کە بڕی دراو بە گرام پێورابێ و بڕی نەزانراو بە مۆڵ.

**پرسی نموونەیی 4-3**

**یەکێك لە یەکەم هەنگاوەکانی دروستکردنی ترشی نیتریك، ئۆکساندنی ئەمۆنیای هاندراوە:**

**$NH_3(g) + O_2(g) \rightarrow NO(g) + H_2O(g)$ (ناهاوسەنگ)**

**کارلێکەکە، بەبەکارهێنانی 824 g ئەمۆنیا $NH_3$ لەگەڵ فرەیەك $O_2$ تەواودەبێت.**

**أ چەند مۆڵ NO لە کارلێکەکە پێك دێت؟**

**ب چەند مۆڵ $H_2O$ لە کارلێکەکە پێك دێت؟**

## شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** بارستەی $NH_3$ = 824 g

**نەزانراو:** أ. بڕی NO ی پەیدابوو بە مۆڵ.

ب. بڕی $H_2O$ ی پەیدابوو بە مۆڵ.

**2 نەخشەبکێشە**

یەکەم جار هاوکێشەی هاوسەنگ بنووسە:

$$4NH_3(g)+5O_2(g) \rightarrow 4\,NO(g) + 6H_2O(g)$$

لێرەدا، پێویستمان بە دوو هاوکۆڵکەی گۆڕین دەبێت بۆ شیکاری بەشی ( أ )ی پرسەکە بارستەی مۆڵی $NH_3$ و، ڕێژەی مۆڵی NO بۆ $NH_3$ و بەشی (ب) ی پرسەکە پێویستمان بە بارستەی مۆڵی $NH_3$ وڕێژەی مۆڵی $H_2O$ بۆ $NH_3$ هاوکۆڵکەی گۆڕینی یەکەم لە هەر بەشێکدا، هەڵەوگێڕاوی بارستەی مۆڵی $NH_3$ یە.

هەڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی — ڕێژەی مۆڵی

أ. $$g\ NH_3 \times \frac{1\ mol\ NH_3}{g\ NH_3} \times \frac{mol\ NO}{mol\ NH_3} = mol\ NO$$

ڕێژەی مۆڵی هەڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی

ب. $$g\ NH_3 \times \frac{1\ mol\ NH_3}{g\ NH_3} \times \frac{mol\ H_2O}{mol\ NH_3} = mol\ H_2O$$

**3 بدۆزەرەوە**

خشتەی خولی بەکاربهێنە، بۆ دۆزینەوەی بارستەی مۆڵی $NH_3$ .

$$NH_3 = 17.04\ g/mol$$

أ. $$824\ g\ NH_3 \times \frac{1\ mol\ NH_3}{17.04\ g\ NH_3} \times \frac{4\ mol\ NO}{4\ mol\ NH_3} = 48.4\ mol\ NO$$

ب. $$824\ g\ NH_3 \times \frac{1\ mol\ NH_3}{17.04\ g\ NH_3} \times \frac{6\ mol\ H_2O}{4\ mol\ NH_3} = 72.6\ mol\ H_2O$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وەڵامەکان بە سێ ڕەنووسی واتایی تەواو دانراون، یەکەکان لە دوو پرسەکەدا، کورت کراونەتەوە و mol NO و mol $H_2O$ ماونەتەوە کە نەزانراوەکانن.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

جۆزێف بریستلی، ساڵی 1774 ، ئۆکسجینی دۆزییەوە کاتێك ئۆکسیدی جیوە (II) ی گەرم کردو لێك هەڵوەشا بۆ توخمە پێکهاتەکانی

**.1** چەند مۆڵ ئۆکسیدی جیوە (II) HgO مان دەوێت بۆ دەستکەوتنی 125 g ئۆکسجین$O_2$ ؟

**.2** چەند مۆڵ جیوە لەم کارلێکەدا پێك دێت؟

**وەڵامەکان:**

**.1** 7.81 mol HgO

**.2** 7.81 mol Hg

بڕی ماددە
دراو
(بەگرام)

لە پرسەکەدا دراوە

هێڵگەڕاوەی بارستەی مۆڵی
(خشتەی خولی)

ڕێژەی مۆڵی لە
هاوکێشەکەوە

بارستەی مۆڵی
(خشتەی خولی)

$$\times \frac{1}{\text{(g/mol) بارستەی مۆڵی دراو}} \times \frac{\text{مۆڵە نەزانراوەکان}}{\text{مۆڵە دراوەکان}} \times \text{(g/mol) بارستەی مۆڵی نەزانراوەکە} =$$

هاوکۆڵکەی گۆڕین

بڕی ماددەی
نەزانراو
(بەگرام)

دۆزراوەتەوە

**شێوە 4-3** جێبەجێکارییەکانی شیکاری ئەو پرسانەی کە باسی بڕە دراوەکانی بەگرام پێ دەکرێت و بڕە نەزانراوەکانیش بەگرام پێ دەکرێت.

## ژمارکارییەکانی بارستە - بارستە

ئاسایی، ژمارکارییەکانی بارستە – بارستە، لە هەموو ژمارکارییەکانی تر کاری پێ دەکرێت، کە لە بواری مۆڵە ژمارکارییەکاندا خوێندووتە. ناتوانرێ، بڕی ماددەکان بە مۆڵ ڕاستەوخۆ بپێورێت، لە بەر ئەوەی بڕی ماددە بە مۆڵ دەدۆزرێتەوە، لە بارستەکەیەوە کە دەتوانرێت لە تاقیگەدا بپێورێت دەتوانرێت، پرسەکان دابنرێت و، شیکاری ئەم پرسانە پەیڕەوی ئەم نەخشەیە دەکات:

بارستەی ماددەی دراو (بەگرام) ← بڕی ماددەی دراو (بەمۆڵ) ← بڕی ماددەی نەزانراو (بەمۆڵ)

← بارستەی ماددەی نەزانراو بەگرام

بۆ شیکاری ئەم پرسانە پێویستە سێ دراو هەبێت کە ئەمانەن: بارستەی مۆڵی ماددەی دراو و، ڕێژەی مۆڵی و، بارستەی مۆڵی ماددە نەزانراوەکە.

**پرسی نموونەیی 3-5**

**فلۆریدی تەنەکە (II)، $SnF_2$ لە پیشەسازی هەندێ دەرمانی ددانە بەکاردێت و، لە ڕێی کارلێکی تەنەکەوە لەگەڵ فلۆریدی هایدرۆجین بە پێی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:**

$$Sn(s) + 2HF(g) \rightarrow SnF_2(s) + H_2(g)$$

**بارستەی $SnF_2$ بەگرام چەندە، کە لە کارلێکی 30.00 g HF لەگەڵ Sn پەیدا دەبێت؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە** دراو: 30.00 g = HF

نەزانراو: بارستەی $SnF_2$ ی پەیدابوو بەگرام.

**2 نەخشە بکێشە** دوو هاوکۆڵکەی گۆڕینی پێویست ئەمانەن: بارستەی مۆڵی HF و $SnF_2$ و، ڕێژەی مۆڵی $SnF_2$ بۆ HF .

$$\text{g HF} \times \underset{\text{هەڵەڕاوەی بارستەی مۆڵی}}{\frac{1\ \text{mol HF}}{\text{g HF}}} \times \underset{\text{ڕێژەی مۆڵی}}{\frac{\text{mol } SnF_2}{\text{mol HF}}} \times \underset{\text{بارستەی مۆڵی}}{\frac{\text{g } SnF_2}{\text{mol } SnF_2}} = \text{g } SnF_2$$

**3 بدۆزەرەوە** خشتەی خولی بەکاربهێنە، بۆ دۆزینەوەی بارستەی مۆڵی هەریەکەی HF و $SnF_2$ .

$$HF = 20.01\ g/mol$$

$$SnF_2 = 156.71\ g/mol$$

$$30.00\ g\ HF \times \frac{1\ mol\ HF}{20.01\ g\ HF} \times \frac{1\ mol\ SnF_2}{2\ mol\ HF} \times \frac{156.71\ g\ SnF_2}{1\ mol\ SnF_2} = 117.5\ g\ SnF_2$$

**4 هەڵسەنگێنە** وەڵامەکان، نزیك کراوەتەوە بۆ چوار ڕەنووسی واتایی تەواو، یەکەکان کورت کراونەتەوە و $g\ SnF_2$ دەمێنێتەوە وەك داوای دۆزینەوەی دەکرێت

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** خەندە گاز (گاز پێکەنینهێن، ئۆکسیدی نیترۆز ، ) هەندێ جار وەك سرکە ڕێك لە پزیشکی دداندا بە کاردێت، ئەم گازە لە لێکهەڵوەشانی نیتراتی ئەمۆنیۆم پەیدا دەبێت بە پێی ئەم کارلێکەی خوارەوە:

$$NH_4NO_3(s) \longrightarrow N_2O(g) + 2H_2O(s)$$

أ . بارستەی $NH_4NO_3$ بەگرام ی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی $33.0\ g$ لە $N_2O$ ؟

ب .چەند گرام ئاو لەم کارلێکە پەیدا دەبێت؟

**2.** کە توخمی مس بکرێتە گیراوەی نیتراتی زیوەوە، توخمی زیوو نیتراتی مس (II) پەیدا دەبێت، بارستەی زیوی پەیدا بوو لە 100.gکارلێکی Cu چەندە؟

وەڵامەکان:

**1.** أ . $60.0\ g\ NH_4NO_3$

ب . $27.0\ g\ H_2O$

**2.** 339 g

## پێداچوونەوەی کەرتی 2-3

**1.** دەتوانرێت کارلێکێکی هایدرۆجین بەرهەمهێن، بەم هاوکێشە نا هاوسەنگەی خوارەوە پێشان بدرێت:

$$Mg(s) + HCl(aq) \rightarrow MgCl_2(aq) + H_2(g)$$

أ. بارستەی HCl ی پێویست بۆ کارلێکردن لەگەڵ 5.2 mol مەگنیسیۆم.

ب. بارستەی هەر بەرهەمێکی بەشی (أ) چەندە؟

**2.** گازی ئەستیلین $(C_2H_2)$ وەك بەرهەمێکی ئەم کارلێکەی خوارەوە دەست دەکەوێت:

$$CaC_2(s) + 2H_2O(l) \rightarrow C_2H_2(g) + Ca(OH)_2(aq)$$

أ. ئەگەر $32.0\ g$ $CaC_2$ کارکرا لەم کارلێکەدا، چەند مۆڵی $H_2O$ مان پێویستە؟

ب. هەر بەرهەمەی چەند مۆڵی لێ پەیدا دەبێت؟

## کەرتی 3-3

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- ڕێگەیەك بۆ دیاریکردنی کام کارلێککردوو دیاریکەرە ڕاڤە دەکات.
- بڕی بەرهەم بە مۆڵ یان گرام دەدۆزیتەوە بە زانینی دووکارلێککردوو یەکێکیان زیادەیە.
- دەستکەوتی بیردۆزی (تیۆری ) و دەستکەوتی کردەیی و ڕێژەی سەدی دەستکەوت لێك جیا دەکاتەوە.

# کارلێکردووە دیاریکراوەکان و ڕێژەی سەدیی بەرهەم

کارلێککردنە کیمیاییەکان، ئاساییی، بەبڕی پێویست و ئەندازەی تەواوی کارلێککردووەکان ڕوونادەن، زۆربەی کات، بڕێکی زۆرتری یەکێك لە کارلێککردووەکان بەکاردێت، ئەمەش واتە کارلێکەکە، بەبڕێکی زیاد لە پێویستی کارلێکردوو (کارلێککردووەکان) ڕوودەدات. لەلایەکی ترەوە، بەتەنیا تەواوبوونی یەکێك لە کارلێکردووەکان، یان براەوەی لە کاتی کارلێکرکردنەکەدا، پەیدابوونی بەرهەم دەوەستێت، **ئەو ماددەیەی دەبڕێتەوە یان کاردەکرێت یەکەم جار پێی دەڵێن کارلێککردوی دیاریکەر، *کارلێککردووی دیاریکەر* limiting reactant، ئەو ماددە کارلێککردووەیە، کە بڕی کارلێکردووەکانی تر دیاری دەکات و، بەو پێیەش بڕی ماددەی بەرهەمهاتووی کارلێکە کیمیاییەکە دیاری دەکات، و بەو ماددەیەی بە تەواوی لە کارناکرێت لە کارلێکەکەدا، دەڵێن *کارلێککردووی زیادە* excess reactant. دەشێ جاروبار بە کارلێککردووی دیاریکەر بوترێت دۆزەرەوەی دیاریکەر *limiting reagent* .**

چەمکی کارلێککردووی دیاریکەر بە سوودە کە لەو پەیوەندییە دەچێت لە نێوان ژمارەی ئەو گەشتیارانەی دەیانەوێت بە فڕۆکەیەکی دیاریکراو بڕۆن و ژمارەی ئەو شوێنانەی لەو فڕۆکەیەدا دەستە بەر دەکرێن، ئەگەر ژمارەی گەشتیارەکان 400 کەس بوون و ژمارەی شوێنەکان 350 کورسی بوو، ئەوا تەنیا 350 کەس دەڕۆن و 50 کەس بە چاوەڕوانی دەمێننەوە. کەواتە ژمارەی شوێنەکانی فڕۆکەکە، ژمارەی ڕۆیشتوانی دیاری کرد. هەمان ئەو چەمکە لەکارلێککردنە کیمیاییەکاندا کاری پێ دەکرێت، بۆ نموونە با کارلێکی نێوان ئۆکسجین و کاربۆن بۆ پەیدابوونی دوانۆکسیدی کاربۆن وەربگرین:

$$C(s) + O_2(g) \rightarrow CO_2(g)$$

بە پێی هاوکیشەکە مۆڵێکی کاربۆن لەگەڵ مۆڵێکی گازی ئۆکسجین کارلێك دەکەن بۆ پێکهێنانی مۆڵێکی دوانۆکسیدی کاربۆن، بەڵام وا دابنێ 5 mol کاربۆن لەگەڵ 10 molمۆڵ لە $O_2$ تێکەڵ کرد لە کارلێکێکدا، وەك لە شێوە 3-5 دادەردەکەوێت، بڕێکی زۆر ئۆکسجین کە لە پێویستی کارلێکی لەگەڵ کاربۆن زیاتر بێت، کەواتە کاربۆن کارلێکردووی دیاریکەرە لەم بارەدا و، ئەو بڕی $CO_2$ ی پەیدابوو دیاری دەکات و ئۆکسجین کارلێککردووی زیادەیە و 5 mol لێ دەمێنیتەوە بە زیادە لە کۆتایی کارلێك:

**شێوە 3-5** ئەگەر وا دابنێیت، کە ژمارەی گەرد و گەردیلەکان، ژمارەی مۆڵەکان دەردەبڕن، دەتوانیت هۆی زیادی ئۆکسجین ببینیت.



**پرسی نموونەیی 6-3**

**دوانۆکسیدی سیلیکۆن (کوارتز)، ماددەیەکی ئاسایی ناچالاکە، بەڵام لەگەڵ فلۆریدی هایدرۆجین خێرا کارلێك دەکات بە پێی ئەم هاوکێشەیە:**

$$SiO_2(s) + 4HF(g) \rightarrow SiF_4(g) + 2H_2O(l)$$

**ئەگەر 2.0 mol HF لەگەڵ 4.5 mol $SiO_2$ کاریان لێك کرد، کامیان کارلێککردووی دیاریکەر دەبێت؟**

## شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** بڕی $2.0\ mol = HF$

بڕی $4.5\ mol = SiO_2$

**نەزانراو:** کارلێککردووی دیاریکەر

**2 نەخشەبکێشە**

بەگوێرەی یەکێك لەبەرهەمەکان، بڕی دراوی مادەکارلێك کردوەکان بەکاردێن بۆ دۆزینەوەی بڕی بەرهەمهاتو لەسایەی بارودۆخی نموونەیی کەمترین بڕی بەرهەم کە پەیدا دەبێت بەو مادە کارلێك کردوەی کە هەیە بڕیتی یە لە کارلێك کردووی دیاریکەر.

$$mol\ HF \times \frac{mol\ SiF_4}{mol\ HF} = mol\ SiF_4 \quad \text{بەرهەمهاتوو}$$

$$mol\ SiO_2 \times \frac{1\ mol\ SiF_4}{mol\ SiO_2} = mol\ SiF_4$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$2\ \cancel{mol\ HF} \times \frac{1\ mol\ SiF_4}{4\ \cancel{mol\ HF}} = 0.5\ mol\ SiF_4$$

$$4.5\ mol\ SiO_2 \times \frac{1\ mol\ SiF_4}{1\ mol\ SiO_2} = 4.5\ mol\ SiF_4$$

**4 هەڵسەنگێنە**

لە سایەی بارودۆخێکی نموونەیی (2) mol لە HF دەتوانێت 0.5 mol لە $SiF_4$ پێك بێنێت و 4.5 mol $SiO_2$ دەتوانێت 4.5 mol لە $SiF_4$ پێك بێنێت و لەبەرئەوەی HF کەمترین بڕی بەرهەمی پەیدا بوو پێك دێنێت بۆیە HF دەبێتە کارلێك کردووی دیاریکەر.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** هەندێ بزوێنی موشەکەکان، تێکەڵێکی هایدرازین $N_2H_4$ و ژووڕۆکسیدی هایدرۆجین $H_2O_2$ وەك سووتەمەنی بەکاردێنن بە پێی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە.

$$N_2H_4(l) + 2H_2O_2(l) \rightarrow N_2(g) + 4H_2O(g)$$

أ. کام لەو دوو کارلێککردووە، کارلێککردووی دیاریکەر لەو کارلێکەدا، لەکاتی تیکەڵکردنی 0.750 mol لە $N_2H_4$ لەگەڵ 0.500 mol لە $H_2O_2$؟

ب. بڕی کارلێککردووی زیادە بە مۆڵ چەندە؟

ج. چەند مۆڵ لە هەریەکەی ئەو دوو بەرهەمە پێك دێت؟

**وەڵامەکان:**

**1.** أ. $H_2O_2$

ب. 0.50 mol $N_2H_4$

ج. 0.25 mol $N_2$

10 mol $H_2O$

1.0 mol

## ڕێژەی سەدی داهات (بەرهەم)

بڕی بەرهەمی دۆزراوە، لە پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییەکانی ئەم بەندەدا، داهاتی تیۆری (بیردۆزی) دەنوێنێت، داهاتی بیردۆزی **theoretical yield واتە ئەو بەڕی (زۆرترین) ئەو بەرهەمەی کە بیردۆزانە دەستمان دەکەوێت لە ڕێی ژمارکارییە کیمیاییەکانەوە** و، ئەو بەرهەمانەی لە زۆربەی کارلێککردنەکاندا دەست دەکەون لەداهاتی بیردۆزی کەمترە ، زۆر هۆیش هەیە بۆ ئەوەی وەك بەشداریی کارلێککردوو لە کارلێکی لابەلای پێشبڕکێیدا، کە بەشێکی کاردەکەن و، بڕی بەرهەمیش کەم دەکەن، هەروەها زۆربەی کات بەرهەم تەواو خاوێن نابێت و بەشێکی کەم دەکات لە کاتی خاوێنکردندا، **بەبڕی پێوراوی بەرهەمی کارلێکی کیمیایی دەڵێن داهاتی کردەیی actual yield** ی بەرهەم. کیمیاگەران، ئاسایی بایەخ بە سوودی کارلێك دەدەن، ئەویش بەوە دەربڕدرێت، کە داهاتی بیردۆزی بە داهاتی کردەیی بەراورد دەکرێت و، **ڕێژەی داهاتی کردەیی بۆ داهاتی بیردۆزی، لەگەڵ *100* لێك دەدرێن و، پێی دەڵێن ڕێژەی سەدی داهات percent yield**.

$$\text{ڕێژەی سەدی داهات} = \frac{\text{داهاتی کردەیی}}{\text{داهاتی بیردۆزی}} \times 100$$

### پێداچوونەوەی کەرتی 3-3

**1.** دوانە گۆگردیدی کاربۆن، لە ئۆکسجیندا دەسووتێت و دوانۆکسیدی کاربۆن و دوانۆکسیدی گۆگرد دەدات، بە پێی ئەم هاوکێشەیە:

$$CS_2(l) + 3O_2(g) \rightarrow CO_2(g) + 2SO_2(g)$$

أ. ئەگەر یەك مۆڵ $CS_2$ لەگەڵ یەك مۆڵ $O_2$ یەکیان گرت، کامیان کارلێککردووی دیاریکەردەبن؟

ب. ژمارەی مۆڵەکانی کارلێککردووی زیادەی ماوە چەندە؟

ج. چەند مۆڵی هەر بەرهەمێك پێك دێت؟

# پێداچوونەوەی بەندی 3

## کورتەی بەندەکە

**1-3**

- لە کردەی کارلێکی کیمیاییدا، ژمارکارییە کیمیاییەکان، بارستە پێوەندی نێوان کارلێککردووان و بەرهەمهاتووان دەگرێتەخۆی.
- ڕێژەی مۆڵی، هاوکۆلکەی گۆڕینە، بڕ بە مۆڵی هەردوو ماددە دەبەستێت بەیەکەوە لە کارلێککردنێکی کیمیاییدا و ڕێژەی مۆڵی، لە هاوکێشەی هاوسەنگەوە وەردەگرێت.
- بڕی ماددە بە مۆڵ و بارستەی ماددە بەیەکەی پێوانەی بارستە، وەك گرام و کیلۆگرام و میلیگرام دەردەبڕێت، بارستەی ماددە بڕە بەهایەکە، بەڵام مۆڵ و گرام، یەکەیەکی پەتین.
- هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ بۆ شیکاری پرسەکانی ژمارکارییە کیمیاییەکان پێویستە.

### زاراوەکان

ئەو ژمارکارییە کیمیاییانەن کە لەسەر کارلێك دامەزراون (77) reaction stoichiometry

ژمارکارییە کیمیاییەکانی پێکهاتن (77) composition stoichiometry

ڕێژەی مۆڵی (78) mole ratio

**2-3**

- لە ژمارەکارییە کیمیاییە بیردۆزییەکاندا (نموونەی)، بارستە یان بڕی هەر ماددەیەکی کارلێککردوو یان بەرهەمهاتوو، لە هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگەوە دەدۆزێتەوە و، بەزانینی بارستە یان بڕی هەریەکێك لە مادە کارلێککردوویان بە رهەمهاتووەکان

**3-3**

- لە کارلێکە کردەییەکاندا، ماددە کارلێککردووەکان بە ڕێژەیەك یەك دەگرن، کە بەزۆری لە و ڕێژە وردانەی کە بۆ تەواوکاری کارلێك بەکاردێن جیاوازە.
- کارلێککردووی دیاریکەر دەستی گرتووە بەسەر زۆرترین بڕی شیاو بۆ پێکهێنانی بەرهەمدا.
- لە کاتی زانینی بڕی زانراوی کارلێکردووەکاندا، هەمیشە بڕی بەرهەم کەمترە لە زۆرترین بڕی شیاو، ڕێژەی سەدی داهات، پێوەندی نێوان داهاتی بیردۆزی و داهاتی کردەی بەرهەمێکی دیاریکراوی کارلێکەکە دەردەخات.

$$\text{ڕێژەی سەدی داهات} = \frac{\text{داهاتی کردەیی}}{\text{داهاتی بیردۆزی}} \times 100 .$$

### زاراوەکان

کارلێککردووی زیادە (89) excess reactant

داهاتی کردەیی (91) actual yield

ڕێژەیی سەدی داهات (91) percent yield

کارلێککردووی دیاریکەر (89) limiting reactant

داهاتی بیردۆزی (91) theoretical yield

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

**.1** أ. چەمکی ڕێژەیی مۆڵی، ڕاڤە بکە، وەك لە پرسی ئەو ژمارکارییە کیمیانەدا کە لەسەر کارلێك دامەزراون بەکارهێنراون.

ب. سەرچاوەی ئەو ڕێژەیە چییە؟

**.2** بۆ هەر یەك لەم هاوکێشانەی خوارەوە، هەموو ڕێژە مۆڵییە شیاوەکان بنووسە.

أ. $2Ca + O_2 \rightarrow 2CaO$

ب. $Mg + 2HF \rightarrow MgF_2 + H_2$

**.3** أ. بارستەی مۆڵی چییە؟

ب. کاریگەری چییە لەو ژمارکارییە کیمیاییانەدا کە لەسەر کارلێك دامەزراون.

**.4** کارلێککردووی زیادە و کارلێککردووی دیاریکەر لە کارلێککردنێکی کیمیاییدا لێك جیا بکەرەوە.

**.5** داهاتی بیردۆزی و داهاتی کردەیی لەژمارکارییە کیمیاییەکاندا لێك جیابکەرەوە.

**.6** ڕێژەی سەدی داهات، لە کارلێکەکیمیاییەکاندا چییە؟

**.7** ئاسایی، بۆچی داهاتی کردەیی کەمترە لە داهاتی بیردۆزی؟

## چەند پرسێك

### ژمارکارییە کیمیاییەکان

وادامەنێ کە هاوکێشە کیمیاییەکان بە بێ هاوکۆلکە هاوسەنگ دەبێت:

**.8** دراو، هاوکێشە کیمیاییەکەیە:

$$Na_2CO_3(aq) + Ca(OH)_2(s) \rightarrow 2NaOH(aq) + CaCO_3(s)$$

بارستە مۆڵییەکان تا دوو شوێنی (خانەی) دەیی بۆ هەموو ماددە بەشدارەکانی هاوکێشەکە دیاری بکە و ئەوسا وەك هاوکۆڵکەی گۆڕین بیان نووسە.

**.9** هایدرۆجین و ئۆکسجین لە سایەی بارودۆخێکی دیاریکراودا کارلێك دەکەن بە پێی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:

$$2H_2(g) + O_2(g) \rightarrow 2H_2O(g)$$

أ. ژمارەی مۆڵەکانی هایدرۆجینی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی 5.0 mol ئاو چەندە؟

ب. ژمارەی مۆڵەکانی ئۆکسجینی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی ئەو برە ئاوەی لقی أ ، چەندە؟ بڕوانە پرسی نموونەیی 3-1 ).

**.10** أ. ئەگەر 4.50 mol ئیثان بە پێی ئەو هاوکێشە ناهاوسەنگەی خوارەوە سووتا:

$$C_2H_6 + O_2 \rightarrow CO_2 + H_2O$$

ژمارەی مۆڵەکانی پێویستی کارلێکەکە چەندە؟

ب. چەند مۆڵ لە هەر بەرهەمێك پەیدا دەبێت؟

**.11** پەیدابوونی کلۆریدی سۆدیۆم لە دوو توخمەکەی بە کارلێکێکی یەکگرتن ڕوودەدات، بارستەی پێویستی هەر کارلێککردوویەك چەندە بۆ بەرهەمهێنانی 25.0 mol کلۆریدی سۆدیۆم؟

**.12** ئاسن لە خاوی ئاسن بەرهەم دێت، لە فرنێکی تواندنەوە (شلکردنەوە) دا بە پێی ئەم هاوکێشەیە:

$$Fe_2O_3(s) + CO(g) \rightarrow Fe(s) + CO_2(g)$$

أ. ئەگەر 4.00 kg لە $Fe_2O_3$ مان هەبوو بۆ کارلێککردنەکە، ئایا چەند مۆڵ CO مان بۆ کارلێکەکە پێویستە؟

ب. چەند مۆڵی هەر بەرهەمێك پێك دێت؟

**.13** میثانۆڵ $CH_3OH$ ، ماددەیەکی پیشەسازییە و گرنگە، بە پێی ئەم هاوکێشەیە بەرهەم دێت:

$$CO(g) + H_2(g) \rightarrow CH_3OH(g)$$

بارستەی دوو کارلێککردووەکە، چەندە کە بۆ بەرهەمهێنانی 100.0 kg لە میثانۆڵ پێویستن؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 3-5 .

**.14** نیترۆجین لەگەڵ ئۆکسجین لە هەوادا یەك دەگرن لە کاتی هەورە بروسکەدا، بۆ پێکهێنانی یەکۆکسیدی نیترۆجین NO و، ئۆکسیدی نیترۆجین جارێکی تر لەگەڵ $O_2$ یەك دەگرن بۆ پێکهێنانی دوانۆکسیدی نیترۆجین $NO_2$.

أ. بارستەی $NO_2$ پەیدابوو لە کارلێکی NO لەگەڵ 384 g لە $O_2$ ؟

ب. چەند گرام NO پێویستە بۆ کارلێککردنی نێوان NO و هەمان بڕی $O_2$ ؟

**15.** ماوەیەکی زۆر لە مەوبەر، پێشنیازکرا $NaOH$ وەك هۆکارێکی لابردنی $CO_2$ لە کەشتییە ئاسمانییەکان بە پێی ئەم کارلێکەی خوارەوە، بەکاربێت:

$$NaOH + CO_2 \rightarrow Na_2CO_3 + H_2O$$

أ. ئەگەر لەشی مرۆڤ $925.0\ g$ $CO_2$ ڕۆژانە بەهۆی هەناسەدانەوە بەرهەم دێنێت چەند مۆڵ $NaOH$ پێویستە بۆ هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا و لە ناو کەشتییە ئاسمانییەکەدا بۆ لابردنی هەموو ئەو $CO_2$ەی کە پەیدا دەبێت؟

ب. چەند مۆڵی هەر بەرهەمێك پەیدا دەبێت

**16.** کارلێکی دووانە گۆڕینەوەی نیوان نیتراتی زیو برۆمیدی سۆدیۆم، برۆمیدی زیو بەرهەم دێنێت، کە یەکێکە لە پێکهێنەکانی فیلمی وێنەگرتنی فۆتۆگرافی:

أ. ئەگەر $4.50\ mol$ مۆڵ نیتراتی زیو، کارلێك بکات، ئایا بارستەی برۆمیدی سۆدیۆمی پێویستی کارلێکەکە چەندە؟

ب. بارستەی برۆمیدی زیوی پەیدابوو چەندە ؟

**17.** ترشی گۆگردیکی خەست، لە ئاگر کوژێنەوەیەکدا، لەگەڵ کاربۆناتی سۆدیۆمی هایدرۆجینی کارلێك دەکات، بۆ بەرهەمهێنانی دوانۆکسیدی کاربۆن و گۆگرداتی سۆدیۆم و ئاو.

أ. چەند مۆڵ گۆگرداتی سۆدیۆم هایدرۆجینی پێویستە، بۆ ئەوەی لەگەڵ $150.0\ g$ ترشی گۆگردیك کارلێك بکات؟

ب. چەند مۆڵی هەر بەرهەمێك پەیدا دەبێت؟

**18.** ترشی گۆگردیك، لەگەڵ هایدرۆکسیدی سۆدیۆم بە پێی ئەم هاوکێشەیە کارلێك دەکات:

$$H_2SO_4 + NaOH \rightarrow Na_2SO_4 + H_2O$$

أ. هاوکێشەکە هاوسەنگ بکە

ب. بارستەی $H_2SO_4$ ی پێویست، بۆ کارلێککردن لەگەڵ $NaOH\ 0.75\ mol$ چەندە؟

ج. بارستەی هەر بەرهەمێکی کەلەم کارلێکەدا پەیدا دەبێت چەندە؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 3-2 )

**19.** مس، لەگەڵ نیتراتی زیو لە تاکە گۆڕینەوەیەکدا کارلێك دەکات.

أ. ئەگەر لەم کارلێکە $2.25\ g$ زیو پەیدا بوو بێت، ئاخۆ چەند مۆڵ نیتراتی مس (II) یش پەیدادەبێت؟

ب. ژمارەی مۆڵەکانی هەریەك لەو دوو کارلێککردووەی بۆ ئەو کارلێکە پێویستن چەندە؟( بڕوانە پرسی نموونەیی 3-4 ).

**20.** لەم کارلێکەی خوارەوەدا ئەسپرین $C_9H_8O_4$ لە ترشی سالیسیلیك $C_7H_6O_3$ و ئەنهایدرایدی سرکە (ئەسیتیك) $C_4H_6O_3$ پەیدا دەبێت :

$$C_7H_6O_3(s) + C_4H_6O_3(l) \rightarrow C_9H_8O_4(s) + HC_2H_3O_2(l)$$

أ. بارستەی ئەسپرین(kg) کە دەتوانرێت بەرهەم بهێنرێت لە $75.0\ mol$ لە ترشی سالیسیلیك. چەندە؟

ب. بارستەی پێویست (kg) ی ئەنهایدرایدی سرکە چەندە؟

ج. چەند لیتر ترشی سرکە $HC_2H_3O_2$ ، لە کارلێکەکە پەیدا بێت؟چڕی $HC_2H_3O_2$ $1.05\ g/cm^3$

## کارلێککردووی دیاریکەر

**21.** بڕی ماددە کارلێککردووەکانی هەر هاوکێشەیەکی کیمیاییت هەیە، کارلێککردووی دیاریکەر، دیاری بکە لە هەر یەك لەم بارانەی خوارەوەدا:

أ. $\underset{2\,mol}{HCl} + \underset{2\,mol}{NaOH} \rightarrow NaCl + H_2O$

ب. $\underset{2.5\,mol}{Zn} + \underset{0.6\,mol}{2HCl} \rightarrow ZnCl_2 + H_2$

(بڕوانە پرسی نموونەیی 3-6 )

**22.** بۆ هەر کارلێکی پرسی 21 ،بە مۆڵ بڕی ماوەی کارلێککردووی زیادە چەندە؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی3-7)

**23.** بەمۆڵ بڕی هەربەرهەمێکی کارلێکەکانی پرسی21چەندە؟

**24.** أ. ئەگەر $2.50\ mol$ مس و $5.50\ mol$ نیتراتی زیو بۆ ڕوودانی کارلێك بەرێگەی تاکە گۆڕینەوە دەستەبەربوو، کارلێککردووی دیاریکەر چییە؟

ب. بە مۆڵ، بڕی کارلێککردووی زیادەی ماوە چەندە؟

ج. بڕی هەر بەرهەمێك بە مۆڵ چەندە؟

## ڕێژەیی سەدی داهات

**25.** دوو بڕە داواکراوەکەی ئەم دوو کارلێکە کیمیاییەی خوارەوە بدۆزەرەوە:

أ. داهاتی بیردۆزی= $20.0\ g$ ، داهاتی کردەیی= $15.0g$ ، ڕێژەی سەدی داهات= ؟

ب. داهاتی بیردۆزی = $1.0\ g$، ڕێژەی سەدی داهات= $90.0\%$ ،داهاتی کردەی .

## پێداچونەوەی هەمەجۆر

**26.** مەگنیسیۆممان لە ئاوی دەریادەست دەکەوێت، بە تێکردنی $Ca(OH)_2$ لە ئاوەکە، بۆ نیشاندانی $Mg(OH)_2$، دواى ئەوە نیشتووەکە دەپاڵێورێت و لەگەڵ HCl کارلێك دەکات بۆ پێکهێنانی $MgCl_2$، کە بەکارەبا شی دەکرێتەوە بۆ بەرهەمهێنانی Mg و $Cl_2$. ئەگەر 185.0 g مەگنیسیۆم لە پوختە کردنی 1000.0 g $MgCl_2$ دەست بکەوێت، ڕێژەی سەدی داهاتی ئەم کارلێکە چەندە؟

**27.** فۆسفاتە هاڕڕاوی نانکردن، لە تێکەڵێکی نیشاستە و کاربۆناتی سۆدیۆمی هایدرۆجینی و فۆسفاتی کالیسیۆمی دوو هایدرۆجینی پێك دێت، کە ئەم هاڕڕاوەیە تێکەڵی ئاو بکرێت، گازی دوانۆکسیدی کاربۆن بەرەلادەکات کە بڵقی هەوایی و هەلاوسانی هەویرەکەی لێ پەیدا دەبێت.

$$2NaHCO_3(aq) + Ca(H_2PO_4)_2(aq) \rightarrow aN_2HPO_4(aq) + CaHPO_4(aq) + 2CO_2(g) + 2H_2O(l)$$

ئەگەر پێویستیت بە 0.750 L $CO_2$ بوو، بۆ دروستکردنی کێکێك و، زانیت کە هەر کیلۆ گرامێك سودای نانکردن $NaHCO_3$ 168 g تێدابێت، چەند گرام سودای نانکردن پێویستە بۆ دروستکردنی ئەو بڕە $CO_2$، ئەگەر چڕی $CO_2$ لەپلەی گەرمی نانکردندا 1.20 g/L بێت.

**28.** گازاندنی خەڵوز gasification، کردەی گۆڕینی خەڵوزە بۆ گازی میثان، ئەگەر ڕێژەی سەدی داهات لەم کردەیەدا 85.0% بێت، بارستەی ئەو میثانەی کەلە 1250 g کاربۆن دەستمان دەکەوێت چەندە؟

$$2C(s) + 2H_2O(l) \rightarrow CH_4(g) + CO_2(g)$$

**29.** وەستاو پزیشکانی ددان، گەچ (plaster of Paris) $CaSO_4 \cdot \frac{1}{2}H_2O$، لە دەفری و توند داخراودا هەڵدەگرن بۆ ئەوەی هەڵمی ئاو لە هەوا نەمژێت و ببێتە جیپس (gypsum)، $CaSO_4 \cdot 2H_2O$. چەند لیتر ئاو پەیدا دەبێت لە گەرمکردنی 5.00 L جیپس، تاپلەی $110^oC$ ؟ چڕی $CaSO_4 \cdot 2H_2O$ دەکاتە 2.32 g/mL و هی هەڵمی ئاو 0.581 g/mL.

**30.** دەتوانرێت زێڕ لە ئاوی دەریا دەربهێنرێت لە ڕێی کارلێککردنی ئاوە و لەگەڵ ئەو زینکەی کە لە ئۆکسیدی زینك دەرهێنراوە، زینك شوێنی زێڕ دەگرێتەوە لە ئاودا. بارستەی ئەو زێڕە چەندە کە دەردەهێنرێت ئەگەر 2.00 g ئۆکسیدی زینکمانZnO بە کارهێنا لەگەڵ بڕێکی زۆر ئاوی دەریادا؟

$$2ZnO(s) + C(s) \rightarrow 2Zn(s) + CO_2(g)$$

$$2Au^{+3}(aq) + 3Zn(s) \rightarrow 3Zn^{2+}(aq) + 2Au(s)$$

## بیرکردنەوەی ڕەخنەسازانە

**31.** **بیر پێکەوەبەستن**: هاوکێشەی کیمیایی سەرچاوەیەکی باشی ئەو زانیاریانەیە کە پەیوەندییان بە کارلێکەکەوە هەیە. پێوەندی نێوان داهاتی کردەیی بەرهەمێکی دیاریکراو و هاوکێشەی کیمیایی ئەو بەرهەمەوە.

**32.** **شیکاریی ئەنجامەکان**: بەدەگمەن، کیمیاگەران، لە کارلێکێکی کیمیاییدا، داهاتێکی تەواوی ( واتە 100% ) بەرهەمهاتوویان دەست دەکەوێت.لەگەڵ ئەوەدا کە داهات گرنگە بەهۆی تێچوونی بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی لە خواستن کەمتر، ، بۆ نموونە، لەکاتی گەرمکردنی کانزای مەگنیسیۆم لە بۆتەیەکدا تاپلەیەکی گەرمی بەرز، ئۆکسیدی مەگنیسیۆم MgO پێك دێت وەك بەرهەمێك، بە پێی لێکدانەوەت بۆ کارلێکەکە،باسی هەندێ لەو جێبەجێکاریانە بکە کە دەشێ بکرێن بۆ زۆرکردنی ڕێژەی سەدیی داهات، لەگەڵ ئەم کارلێکەدا:

$$2Mg(s) + O_2(g) \rightarrow 2MgO(s)$$

**33.** **شیکاریی ئەنجامەکان**: تاقیکردنەوەیەك لە تاقیگە دادەکرێت کە ڕێژەی سەدی داهات 115% بێت ، هۆیەکانی ئەم ئەنجامە چیین؟ ئایا دەشێت داهاتی کردەیی لە داهاتی بیردۆزی زۆرتربێت؟ وەڵامەکەت ڕوون بکەرەوە.

## توێژینەوەو نووسین

**34.** سەردانی کارگەیەکی نزیك بدە، ئەوجا ڕاپۆرتێك دەربارەی بەرهەمێکی پیشەسازی بنووسە و ڕێژەی سەدی داهات دەربخە و پێوەندی بە لێکۆڵینەوەی سوودی ئابوورییەوە پیشان بدە.

بەشی

# 2

# دۆخەکانی ماددە

بەندەکان


4 ڕەوشە فیزیاییەکانی گاز
5 گەردە پێکهاتەی گازەکان
6 شلەکان و ماددە ڕەقەکان




## پێویستە هەمیشە بپرسین

پەرۆشی زانستخوازی، هۆی تایبەتی خۆی هەیە کەمایەی بوونێتی و مرۆڤ کە لە نهێنییەکانی تاهەتایی و ژیان و بنەمای قەشەنگی ڕاستی ورد دەبێتەوە، خەریکە دەتۆقێ و ڕەنگە ئەوەندە بەس بێت کە مرۆڤ هەوڵ بدات، هەر ڕۆژە لە چەمکێکی پچووکی ئەو نهێنییانە بگات و هەرگیز دەستبەرداری پیرۆزی خۆشەویستی زانست نەبێت؟

(ئەلبێرت ئاینشتاین)



بەندی 4

# ڕەوشە فیزیاییەکانی گاز



چڕیی گاز، بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمییەکەی کەم دەکات

## کەرتی 1-4

# بیردۆزی گەردە جوولەی مادده

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- دەقی بیردۆزی گەردە جوولەی مادده باس دەکات.
- پێنج گریمانەکەی بیردۆزی گەردە جوولەی گاز باس دەکات.
- هەموو ڕەوشە جیاکەرەوەکانی گاز: کشان و چڕی و ڕژۆکی و پەستێوران و بڵاوبوونەوە و دەرپەڕین باس دەکات.
- باسی ئەو بار و دۆخە دەکات کە گازی ڕاستەقینە لەڕەفتاری «نموونەیی» لادەدات.

لە بەندی 1 ی کتێبی پۆلی دەیەمەوە فێری ئەوە بوویت کە مادده، لەسیٚ دۆخدا هەیە: ڕەق و شل و گاز، لەگەڵ گرانی بینینی ڕەفتاری تەنۆکە تاکەکاندا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، زانایان لە کۆمەڵی گەورەی ئەو تەنۆکانەیان کۆڵییەوە، لە هەر سیٚ باری ( ڕەق و شل و گازدا).

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، زانایان، بیردۆزی گەردە جوولەیان گەشەپێکرد، بۆ باسکردنی گەردیلە و گەردەکانی مادده. **بیردۆزی گەردە جوولە molecular theory kinetic-** خۆی لەسەر بیرۆکەیەك ڕاگیردەکات کە دەڵێت: تەنۆکەکانی مادده هەمیشە دەجووڵێن و ئەم بیردۆزە، بۆ لێکدانەوەی ڕەوشەکانی مادده ڕەق و شل و گازەکان، لەسەر بنچینەی وزەی تەنۆکەکان و هێزە کاریگەرەکانی نێوانیان لێك دەداتەوە ، لەم بەرگەدا، بیردۆزەکە بەکارپێکراوی لەسەر گەردەکانی گاز دەخوێنێت و پێیٚ دەڵێن بیردۆزی گەردە جوولەی گازەکان.

## بیردۆزی گەردە جوولەی گازەکان

ئەم بیردۆزە، یارمەتیت دەدات کە لە ڕەفتاری گەردەکانی گاز و ڕەوشە فیزیاییەکانی بگەیت و بیردۆزەکە نموونەیەکی گازی نموونەیی دەخاتە بەرچاو و گازی نموونەیی **ideal gas** گریمانە گازێکە کە هەموو گریمانەکانی بیردۆزی گەردە جوولەی لەگەڵدا دەچەسپیٚ و دەهێنێتەدی.

بیردۆزی گەردە جوولە، پشت بەم پێنج گریمانەی خوارەوە دەبەستێت:

**1.** گازەکان، لە ژمارەیەکی زۆر تەنۆکەی زۆر بچووك و دوور لەیەکتر پێك دێن لە چاو قەبارەیاندا، بۆیە زۆربەی ئەو قەبارەیەی گاز داگیری دەکات کەلێنێکی بۆشە، و چڕی کەمی (کەمچڕیی) گازەکان لێك دەداتەوە، لە چاو چڕی مادده شل و ڕەقەکاندا، هەروەك ئەم گریمانە، ئاسان پەستێورانی گازەکان ڕوون دەکاتەوە.

**2.** پێکداکەوتنی نێوان تەنۆکەکانی گاز و پێداکەوتنی تەنۆکەکان بە دیوارەکانی ئەو دەفرەیش کە گازەکەی تێدایە، هەردووکیان جیرن و، جیرەپێکداکەوتن **elastic collision** ، ئەو پێکداکەوتنەیە کە ونبوونی جوڵە وزەی گشتی لەگەڵدا نییە کە لەگەڵی جوڵە وزەی نێوان دوو تەنۆکەکە دەگوازێتەوە لە کاتی کرداری بەیەکداکەوتن، کە کۆی جوڵە وزەی گشتی بە جێگری دەمێنێتەوە لەبەر ئەوەی پلەی گەرمی جێگرە.

**3.** تەنۆکەکانی گاز، لەباری جووڵەیەکی هەمیشەیی و خێراو کوێرانەدا هەرمەکی دەبێت بەرە و هەموو لایەك، وەك لە شێوەی 1-4 دا دەردەکەوێت، بۆیە وزەی جووڵەی هەیە و وزەی جووڵەی تەنۆکەکان، زاڵ دەبێت بەسەر هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانیان، تەنیا لەو بارەدا نەبێت کە گازەکە، لەو پلەی گەرمییە نزیك دەبێتەوە کە تێیدا خەست دەبێتەوە و دەبێتە شل.




**شێوە 1-4** تەنۆکەکانی گاز بە هێڵی ڕاست دەجووڵێن تا پێکدا دەکەون یان بەدیواری ئەو دەفرەدا دەکەون کە گازەکەی تێدایە.

**4. هێزی یەکتر ڕاکێشان یان لێك دوورکەوتنەوە لە نێوان تەنۆکەکانی گازدا نییە،** (دەتوانرێت گەردەکانی گازێکی نموونەیی وا بهێنرێتە بەرچاو کە وەك تۆپەکانی بلیارد ڕەفتار دەکەن، پێکتردا دەکەون و پێکەوە نالکێن، بەڵکو دەگەڕێتەوە و لەکاتی پێکداکەوتنیاندا لە خۆیانەوە لێك دوور دەکەونەوە).

**5.** تێکڕای وزەی جووڵەی گەردەکانی گاز، بەستراوە بە پلەی گەرمییەکەوە و وزەی جووڵەی تەنە جووڵۆکەکان بە گشتی و تەنۆکەکانی گاز بە تایبەتی، بەم هاوکێشەیە دەردەبڕدرێت:

$$KE = \frac{1}{2} mv^2$$

کە $m$ بارستەی تەنۆکە و $v$ خێراییەکەی پێشان دەدات و لەبەر ئەوەی تەنۆکەکانی گازێك هەموویان هەمان بارستەیان هەیە، بۆیە وزەی جووڵەیان تەنیا پشت بە خێراییان دەبەستێت و تێکڕای خێرایی و وزەی جووڵەی تەنۆکەکانی گاز، بە بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی زۆر دەبێت و بە نزمبوونەوەی پلەی گەرمی کەم دەکات.
لە هەمان پلەی گەرمیدا، تێکڕای وزەی جووڵەی هەموو گازەکان یەکسانە، بۆیە سووکە تەنۆکەکانی گاز ( وەك گەردەکانی هایدرۆجین ) خێراترن لە خێرایی تەنۆکە قورسترەکان (وەك گەردی ئۆکسجین) لە هەمان پلەی گەرمیدا.

## بیردۆزی گەردە جووڵە و سروشتی گازەکان

بیردۆزی گەردە جووڵە، تەنیا لەگەڵ گازە نموونەییەکاندا کاری پێ دەکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە گازی نموونەیی بە کردەیی نییەو، زۆربەی گازەکان ڕەفتاریان نزیکە نموونەییە، ئەگەر پەستانەکەی زۆر بەرز نەبێت، یان پلەی گەرمییەکەی زۆرنزم نەبێت، لە کەرتەکانی داهاتوو دەبینیت بیردۆزی گەردە جووڵە ڕەوشە فیزیاییەکانی گازەکان چۆن لێك دەداتەوە (ڕاڤەدەکات).

### کشان

گازەکان شێوە، یان قەبارەیەکی دیاریکراویان نییە، بۆیە ئەو دەفرە پڕ دەکاتەوە کە تێی دەکرێت و شێوەی دەفرەکە وەردەگرێت، کاتێك لیترێکی دەگویزرێتەوە بۆ دەفرێکی دوو لیتری، گازەکە لە خۆیەوە دەکشێت بۆ پڕکردنەوەی قەبارە تازەکەی دەفرەکە، ئەم بیردۆزی گەردە جووڵەیە لە ڕێی دوو گریمانی 3 و 4 ەوە ئەو ڕاستییە لێك دەداتەوە کە ئاماژە دەکەن بۆ خێرایی جووڵانی تەنۆکەکانی گاز بە هەموولایەکەدا، بێئەوەی یەکتر ڕاکێشان یان لێك دوورکەوتنەوە یەکی هەستپێکراو ڕوودات.

### ڕژۆکی (ڕەوین)

لەبەرئەوەی یەکتر ڕاکیشانی گاز، فەرامۆشکراوە (گریمانی 4 ) تەنۆکەکانی گاز بە ئاسانی پێکدا دەڕەوێت و، وا لە گاز دەکات، کە وەك شل ڕەفتار بکات و **لەبەرئەوەی هەریەکەی گاز و شل ڕەوشتی ڕەوینیان هەیە، پێیان دەڵێن ڕژۆکەکان fluids** .

### کەمبوونەوەی چڕی

چڕیی ماددە لە دۆخی گازدا، نزیکەی 1/1000 چڕییەکەیەتی لە دۆخی شل یان ڕەقدا، چونکە تەنۆکەکان لە دۆخی گازدا زۆر لەیەك دوورن (گریمانی – 1 ) .

## پەستۆکی (توانستی پەستێوران)

لەکاتی پەستێوراندا، گەردە لێکدوورەکانی گاز (گریمانی – 1 ) پێکەوە کۆ دەبنەوە و بەوەیش قەبارەی نموونەیەکی گازەکە زۆر کەم دەکات و بۆیە لوولەکی پۆڵا بۆ تێدا هەڵگرتنی گازی بەستێوراو پەشێوەیەکی فراوان بەکاردێت.

## بڵاوبوونەوە و دەرپەڕین

گازەکان بڵاودەبنەوە و پێکدا دەچن و لەگەڵ یەکتر تێکەڵ دەبن، بێئەوەی پێویست بە ڕاوەشاندن و جوڵاندن بکات، لە کاتی لابردنی سەری دەفرێك ئەمۆنیا لە ژوورێکدا، گازی ئەمۆنیا کە بەرێك و پێك تێکەڵی هەواکە دەبێت و بە کەشی ژوورەکەدا بڵاودەبێتەوە، جووڵەی بەردەوامی ناڕێکی گەردەکانی ئەمۆنیا (گریمانی – 3 ) وای لێ دەکات بە کەشی کەلێنی ژوورەکەدا بڵاو بێتەوە. بەدیاردەی لە **خۆوە تێکەڵبوونی نێوان تەنۆکەکان ماددەکان بە هۆی ناڕێك بە هەموو لایەکدا جوڵانیانەوە دەڵێن بڵاوبونەوە diffusion.**

تێکرای بڵاوبونەوەی گازێکی دیاریکراو لە نێوان چەند گازێکی تردا.بەستراوە بە سێ ڕەوشی تەنۆکەکانی گازەوە، کە ئەمانەن: خیراییەکانیان و تیرەکانیان هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانیان، لە شێوە 4-2 دا، گازی هایدرۆجین بەخێرایی بە نێوان ئەو گازانەی تردا بڵاودەبێتەوە کە لە هەمان پلەی گەرمیدان، چونکە گەردەکانی هایدرۆجین سووکتر و خێراترن لە گەردی گازەکانی تر.

بڵاوبوونەوە، کردەیەکە، بە پێی ئەوە تەنۆکەکانی گازێك لە خۆیەوە بە نێوان گازەکانی تردا بڵاو دەبێتەوە و تێکەڵیان دەبێت و بەرانبەر بەوە، دەرپەڕین **effusion** ، کردەیەکە، **بە پێی ئەوە تەنۆکەکانی گاز بەکونێکی زۆر بچووکدا تێ دەپەڕێت** و خێرایی دەرپەڕینی گازەکە جۆراوجۆرەکان ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ خێرایی تەنۆکەکانیاندا و بە هۆی ئەو هاوڕێژەیەوە، دەرپەڕینی گەردە بارستە بچووکەکان، لەگەردە بارستە گەورە ترەکان خێراتر دەبن




**شێوە 2-4** کاتێك، بواری گازی هایدرۆجین دەدرێت لە کەمۆڵەیەکدا، تێکەڵ بەهەوای کەمۆڵەیەکی تر بێت لە ژێر هەمان پەستاندا، گەردەکانی هایدرۆجین کە بارستەیان بچووکترە، بە خێرایی بە کەمۆڵە هەواکەدا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام گەردەکانی قورسە (نایترۆجین و ئۆکسجین)، زۆر بە خاوی بەکەمۆڵەی هایدرۆجینەکەدا بڵاودەبێتەوە.

## لادانی گازە ڕاستەقینەکان لە ڕەفتاری نموونەیی

زۆربەی گازەکان، کاتێك تەنۆکەکانیان دوورن لەیەکەوە، نموونەییانە ڕەفتاردەکەن و، ئەوەندەی پێویست وزەی جووڵەیان هەیە، بەڵام هەموو گازە ڕاستەقینەییەکان، تاڕاددەیەك لە ڕەفتاری گازی نموونەیی لادەدەن، **گازی ڕاستەقینە real gas** ئەو **گازەیە کە بە شێوەیەکی تەواو لەگەڵ گریمانەکانی بیردۆزی گەردە جووڵەدا ڕێك ناکەون**، یۆهان ڤاندرڤاڵز ساڵی 1873 ئەم لادانەی بەوە لێکدایەوە کە گەردەکانی گازی ڕاستەقینە شوێنێك داگیر دەکەن و یەکتری ڕادەکێشن و، لە پەستانی بەرز و پلەی گەرمی نزمدا ئەو لادانە هەستپێکراو (بەرهەست) دەبێت، لەم بارودۆخەدا، تەنۆکەکانی لێك نزیك دەبن ووزەی جووڵەکەیان ئەوەندە نابێت کە بەتەواوی بەسەر هێزی یەکتر ڕاکێشاندا زاڵ بێت، وەك لە شێوەی 4-3 دا دیارە.

بیردۆزی گەردە جووڵە بەسەر ئەو گازانەدا کاری پێ دەکرێت کە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانی لاوازە و گازە سستەکان (خانەدانەکان) ی وەك هیلیۆم He و نیۆن Ne ، لە بوارێکی فراوانی پەستان و پلەی گەرمیدا وەك گازی نموونەیی ڕەفتاردەکەن و تەنۆکەکانی ئەم گازانە یەك گەردیلەیین، بۆیە لە لایەکی ترەوە جەمسەردار نابن، بەڵام تەنۆکەی گازە ئاساییەکان، وەك نایترۆجین $N_2$ و هایدرۆجین $H_2$ ، بێجەمسەر و دووگەردیلە دەبن، بۆیە ڕەفتاری ئەم گازانە، لە بار و دۆخێکی دیاریکراودا نزیك دەبێتەوە لە ڕەفتاری گازی نموونەیی و هەرچەندە جەمسەرداریی گەردەکان گاز زۆرتربێت، هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانیان زۆرتر دەبێت و لادانی گازەکە لە ڕەفتاری نموونەیی زۆرتر دەبێت و گازە زۆر جەمسەر دارەکانی وەك ئەمۆنیا $NH_3$ و هەڵمی ئاو بۆ نموونە، زۆر لە ڕەفتاری نموونەیی دوور دەکەونەوە لە چاو گازە بێجەمسەرەکاندا.



( أ )

( ب )

**شێوە 4-3** ( أ ) گەردەکانی گاز لەناو لوولەکی بزوێنی ئۆتۆمۆبیلدا، دەکشێت بۆ ئەوەی لوولەکەکە پڕبکاتەوە. (ب) بەپەستاوتن کارکردنە گەردەکان، لێك نزیك دەبنەوە و قەبارەی گازەکە کەم دەکات.

## پێداچوونەوەی کەرتی 4-1

**1.** ئەم ڕەوشانەی خوارەوەی گازەکان ڕاڤەبکە بە بەکارهێنانی بیردۆزی گەردە جووڵە: کشان، ڕژۆکی، کەمی چڕی، پە ستۆکی (توانستی پەستێوران)، بڵاوبوونەوە.

**2.** باسی ئەو بار و دۆخە بکە لە گازی ڕاستەقینە وەك گازی نموونەیی ڕەفتار دەکات.

**3.** ئەو دوو هۆکارە بڵێ کە ڤاندرڤاڵز وای دانان، بۆ لێکدانەوەی لادانی گازی ڕاستەقینە لە ڕەفتاری نموونەیی.

**4.** کام لەم گازانەی خوارەوە لادانیکی بەرهەست (هەست پێکراو) لە ڕەفتاری نموونەیی لادەدەن: $H_2$ ،$O_2$ ،He، $H_2O$ ،$N_2$ ،HCl ،$NH_3$ ؟



# هاندەری یەکۆکسیدی کاربۆن نەهێڵێ بکوژە نادیارە

یەکۆکسیدی کاربۆن، ئەو نهێنکوژە بێڕەنگ و بۆیەیە، کە ساڵانە دەبێتە هۆی مردنی سەدانو، کاتێك سووتەمەنی بەتەواوی ناسووتێ لە کردەی سووتاندندا، یەکۆکسیدی کاربۆن پەیدا دەکات، هەروەهایش لە فڕن (کوورە) و گەرمکەرە و کوڵێن و ئاگرگە، ماڵ گەرمکەرەکاندا کە سووتەمەنییان بە تەواوی تێدا نەسووتێ، یەکۆکسیدی کاربۆنە پەیدابووەکە لەکاتی هەناسەداندا، لەگەڵ هیمۆگلۆبینی خوێن یەك دەگرێت و ناهێڵێت ئۆکسجینی پێویست بگاتەخانەکانی لەش و پێش ئەوەی خەڵك هەست بکات کە کەلێنێك یان ناتەواوییەك هەیە لەم هۆی سووتاندنانەدا کات بەسەرچووە:

$$O_2Hb + CO \rightarrow COHb + O_2$$

یەکۆکسیدی کاربۆن، ئارەزوویەکی کیمیایی هەیە بۆ یەکگرتن لەگەڵ هیمۆگلۆبینی خوێن (Hb) ، کە دوو سەد ئەوەندەی ئارەزووی یەکگرتنی ئۆکسجینە لەگەڵ هیمۆگلۆبین، ئەمەیش واتە، ئەگەر لەش بواری هەڵبژاردنی بۆ بدرێت، ئارەزووی لەگەڵ یەکۆکسیدی کاربۆن یەکگرتن دەکات نەك ئۆکسجین و ئەگەر ڕێژەی یەکۆکسیدی کاربۆن لە خوێندا زیادی کرد، کوشندە دەبێت.

بەڵام دەتوانرێت ژەهراویبوون بە یەکۆکسیدی کاربۆن قەدەغەبکرێت، بە دانانی پاڵێوکی تایبەت کە گازە کە دەمژێت، بەڵام دوای ماوەیەك ئەو پاڵێوکانە تێر گاز دەبن، بە ئازادی یەکۆکسیدی کاربۆن دەردەکاتە هەواوە ، ڕێگەی نموونەیی قەدەغەکردنی بە یەکۆکسیدی کاربۆن ژاراویبوون هەر گاز جیاکردنەوە نییە بە پاڵاوتن، بەلکو بە تەواوی ڕزگارکردنی هەوایە لێی بۆ چارە سەری ئەم کێشەیە، زانایانی ناسا NASA گاز هاندەرێك گەشە پێ کرد، کە لە ئۆکسیدی تەنەکە و پلاتین دروست دەکرێت، یەکۆکسیدی کاربۆنی پەیدابوو دەئۆکسێنێت بۆ دوانۆکسیدی کاربۆن و، هەر زوو ئەو زانایانە هەستیان کرد، کە گازبرەکەیان زۆر توانایە بۆ ئەوەی کە لەسەر ڕووی زەویش کاری پێ بکرێت، یەکێك لەو کارپێکردنانە نەهێشتنی یەکۆکسیدی کاربۆنە لە ماڵ و بیناکان.

وەك دەزانین، کوڵێنە ناسازەکان، لە ڕێی سیستەمی هەوا گۆڕکێوە، یەکۆکسیدی کاربۆن پەیدا دەکات و، دەیکاتە هەواکەی دەوروبەری و کاتێك گاز برەکە لە گوزەری سیستەمی هەوا گۆڕکێکەدا دا دەنێن، خۆلە یەکۆکسیدی کاربۆن ڕزگار دەکرێت بە ئۆکساندن و گۆڕینی بۆ دوانۆکسیدی کاربۆنی نا ژەهر، پێش ئەوەی بچێتە ناو ژوور یان بیناکەوە.

گازبرەکە بە شێوەی تەنەکە چینێکی ڕووپۆش دەبێت، جۆرێك لە لاشیان یان بابەتی ژێرەوە دەبێت (وەك وای پێ دەڵێن) داڤید شرایەری کارمەندی NASA دەڵێت:«ئەو ماددە ژێرەکی یان لاشیپانە، دەشێت یەکێك بێت لە ژمارەیەکی زۆر ماددە گرنگترین بەشی ڕووی دەرەوەیەتی، بۆ یە ڕەنگە گازبرەکە زۆر تەنك بێت بەڵام زۆر کاراش بێت».

بیرۆکەی بەکارهێنانی گازبرە لە ئۆکساندنی گازەکاندا شتێکی نوێ نییە، بگۆڕی گازبرەی catalytic converter داری گازبڕی ئۆتۆمۆبیلەکە، یەکۆکسیدی کاربۆن و هایدرۆکاربۆنە نەسووتاوەکان دەئۆکسێنێت، پیسبوون کەم دەکات، زۆر ماددە هەیە کە دەئۆکسێنرێن و، دەگۆڕدرێن بۆ ماددەی نوێ و بۆمەبەستی پیشەسازی گونجاو، بەڵام ئەو دوو جۆرە کارلێکە هاندراوەکان، لە پلەی گەرمی بەرزدا ڕوودەدەن و لەلایەکی تریشەوە گازبرەی NASA تایبەتمەندترە، چونکە دەتوانرێت لە پلەی گەرمی ژووردا یەکۆکسیدی کاربۆن لابەرێت و دەیشتوانێت فۆرماڵدیهاید، کە ماددەیەکی کیمیایی زیان بەخشە بەزۆری لە کەرەسەکانی ڕاخەر و پەردە و بیناسازیدا هەیە. بەپێی بیر و بۆچوونی داڤید شرایەر، گازبرە گەرمی نزمەکان، بابەتێکی نوێی گازبرە فرە کارپێکردن گونجاوەکانی ئایندە پێك دێنن.

## کەرتی 2-4

### نیشانەکانی ڕاپیکاری

- پەستان پەیوەندی بە هێزەوە پێناسە دەکات.
- باسی چۆنییەتی پێوانی پەستان دەکات.
- یەکەکانی پەستان دەگۆڕێت.
- لە مەرجە پێوانەییەکانی گەرمی و پەستان دەدوێت

# پەستان

وا دابنێ کەمۆڵەیەکی پڕ هەوات هەیە، کەقەبارەکەی لیترێکە ئایا بەکردەوە چەندت هەوا هەیە؟ زاراوەی « لیترێکی هەوا» مانای وایە زۆرنیە ئەگەر ئەو بارو دۆخەی تێیدا پێوراوە نەزانرێت، لیترێکی هەوا، دەتوانرێت بپەستێورێت بۆ چەند میللیلیترێك هەروەك دەشێ بشێت تاکو هۆڵێکی گەورە داگیردەکات.بۆ وەسفی گازێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی تەواو، پێویستە چوار بڕی بۆ پێوان شیاو دیاری بکەین کە دەتوانرێت بپێورێت، کە ئەمانەن: قەبارە، پلەی گەرمی ژمارەی گەردەکان، پەستان،

لەم بەشەدا، زۆرشت لە بواری پەستان و ڕێگەکانی پێوانی فێردەبێت و لە کەرتی 4-3 دا پێوەندی بیرکاری نێوان قەبارە و پلەی گەرمی و ژمارەی گەردەکانی گاز و پەستان دەخوێنیت.

## پەستان و هێز

ئەگەر میزڵدانێکی لاستیکت پڕ کرد لە هەوا، قەبارەکەی زیاددەکات، هۆی زۆربوونی قەبارە، پێداکەوتنی گەردەکانی هەوایە بە دیوارەکانی ناوەوەی میزڵدانەکەدا، کە پاڵ بە دیوارەکانی ناوەوەی میزڵدانەکەوە دەنێن بەرەو دەرەوە، یان هێزێك دژی دیوارەکانی ناوەوە پەستان **pressure (*P*)** ، بەم جۆرە پێناسە دەکرێت: **ئەو هێزەیە، کە کاردەکاتە یەکەی ڕووبەری ڕووەکەو**، ئەو هاوکێشەیەیش کە پەستان دەناسێنێت بەم جۆرەیە:

**شێوە 4-4** ئەو پەستانەی ئەم لاوە دەیخاتە سەر ئەرزەکە، لە سەر ڕووبەری (بەرکەوتی) لاوەکەو زەوی وستاوە، هەرچەندێك ڕووبەری بەرکەوتن کەمتر بێت، پەستان زۆرتر دەبێت.




( أ ) ڕووبەری بەرکەوتن $450\ cm^2$

$$\text{پەستان} = \frac{\text{هێز}}{\text{ڕووبەری ڕووەکە}}$$

$$= \frac{700\ N}{450\ cm^2} = 1.6\ N/cm^2$$




(ب) ڕووبەری بەرکەوتن $20\ cm^2$

$$\text{پەستان} = \frac{\text{هێز}}{\text{ڕووبەری ڕووەکە}}$$

$$= \frac{700\ N}{20\ cm^2} = 35\ N/cm^2$$




(ج) ڕووبەری بەرکەوتن $10\ cm^2$

$$\text{پەستان} = \frac{\text{هێز}}{\text{ڕووبەری ڕووەکە}}$$

$$= \frac{700\ N}{10\ cm^2} = 20\ N/cm^2$$

یەکەی نێو دەوڵەتی SI ی هێز، نیوتن **newton** ەو بە N کورت دەکرێتەوە و **بەواتا ئەو هێزەی خێرایی تەنێکی یەك کیلۆ گرامی بە بڕی مەتر / چرکە زیاد دەکات** و، لەسەر ڕووی زەوی هەر کیلۆگرامێك بارستە، بەهێزێکی 9.8 N ی کاریگەری هەیە بە هۆی ڕاکێشانی زەوییەوە ، با باری ئەولاوە وەربگرین کە بارستاییەکەی 71 kg ەو وەك لە شێوە 4-4 دا دەردەکەوێت، دەبینین بارستەی 71 kg ، بە هێزی $(71 \times 9.8)$ 700 N کاردەکاتە سەر ڕووی زەوی، وەستانی لاوەکە هەر چۆنێك بێت، ئەو بڕە، کار لە ڕووی زەوی دەکات، لە لایەکی ترەوە، ئەو پەستانەی لاوەکە کاری پێ دەکاتە زەوی بەستراوە بە ڕووبەری ساوا (بەرکەوتە) ی نێوان لەشی لاوەکە و زەوی. کاتێك کێشەکەی لەسەر هەردوو پێی جێگیر دەبێت، وەك لە شێوە 4-4 (أ) دا دەردەکەوێت، ڕووبەری بەرکەوتن $450\ cm^2$ دەبێت و پەستان یان هێز لە سەر یەکەی ڕووبەری لەو بارەدا دەکاتە $700\ N/450\ cm^2$ ، واتە نزیکەی $1.6\ N/cm^2$ و، کاتێك لاوەکە لەسەر نووکی پەنجەکانی هەردوو پێی دەوەستێ، وەك شێوە 4-4 (ب) ، ڕووبەری گشتی بەرکەوتە، تەنیا $20\ cm^2$ دەبێت و، ئەوسا پەستانی کارتێکەر $700\ N/20\ cm^2$ یان نزیکەی $35\ N/cm^2$ دەبێت وکاتێك لەسەر نووکی پەنجەکانی یەك پێی دەوەستێ، وەك شێوە 4-4 (ج) ، بە پەستانێکی دوو ئەوەندەیی کاردەکات واتە $70\ N/cm^2$ ، لەبەر ئەوە هەمان ئەو هێزەی کاردەکاتە ڕووبەرێکی بچووکتر، پەستانێك بەرزتر پەیدا دەکات.
گەردەکانی گاز پەستانێك دەخاتە سەر هەر ڕوویەك کە پێیدا بکەوێت و، ئەو پەستانەی گازەکە کاری پێ دەکات، بەستراوە بە قەبارە و گەرمی و ژمارەی گەردەکانەوە.
بەرگەکەش دەوری زەوی پەستانێك کارپێ دەکات، شێوە 5-4 دەری دەخات کە پەستانی کەش لە ئاستی ڕووی دەریادا یەکسانە بە بارستەی 1.03 kg لەسەر هەر سەنتیمەتر دووجا یەکی ڕووەکە ، یان $10.1\ N/cm^2$ ، ئەو پەستانی کەشە، هی کێشی ئەو گازانەیە کە بەرگە کەشیان لێ پێکهاتووە، کەلە 78% نایترۆجین ، 21% ئۆکسجین ، و 1% گازی ترە لەوانە : ئەرگۆن و دوانۆکسیدی کاربۆن .

**شێوە 5-4** ئەو گازانەی بەرگەکەشیان لی پێك دێت بەزۆری نایترۆجین و ئۆکسجینە، گەردەکانی ئەم گازانە بەر ڕووی زەوی دەکەون و پەستانی $10.1\ N/cm^2$ کارپێ دەکات.









**شێوە 4-6** (أ) هەوای ناو تەنەکەکە، لەگەڵ پەستانی کەشدا هاوسەنگ دەبێت. (ب) پاش هەوا تێدا نەهێشتنی تەنەکە، دەقوپێت.

بۆ ئەوەی لە چەمکی پەستانی گازو بڕەکەی بگەین، نموونەی تەنەکەیەکی بۆش وەردەگرین، کە لە شێوەی 4-6 وا دیارە (أ) و (ب)، تەنەکە بۆشەکە تێکەڵە گازێکی هەوای تێدایە، کە پاڵ دەنێن بەرەو دەرەوەو، پەستانی هەوا هاوسەنگ دەکەن کە بەرەو ناوەوە پاڵ دەنێن (أ)، کاتێك هەوا لە تەنەکەکەدا ناهێڵرێت، بەهۆی ترومپایەکەوە، ئەوەندە هەوا نامێنێتەوە کە بەشی هاوکێشکردنی پەستانی کەشی دەرەکی بکات، بۆیە تەنەکەکە دەقوپێت وەك لە (ب)دا دەی بینین.

## پێوانی پەستان

**پەستانپێو (بارۆمەتر) barometer** ئامێرێکە، بەکاردێت بۆ پێوانی پەستانی کەش. یەکەم جۆری پەستانپێو (شێوە 4-7 ) ئیڤانگلیستاتۆریشەلی لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا دای هێنا، کە سەرێکی بۆرییەکی درێژی داخست و پڕی کرد لە جیوە، ئەوجا بۆرییەکەی هەڵوگێڕ لەناو دەفرێکی پڕ لە جیوەدا دانا بە جۆرێك سەرە کراوەکەی لەژێر ڕووی جیوەی ناو دەفرەکەدا بێت و، بوار نەدرێت هیچ بڕە هەوایەکی تێ بچێت، کە پەنجە گەورەی لەسەردەمی بۆرییە پڕ جیوەکە لابرد، جیوەی ناو بۆرییەکە نزم بووەوە تا بەرزی نزیکەی 760 mm . لەسەر ڕووی جیوەی ناودەفرەکە، تۆریشەلی تاقیکردنەوەکەی چەند جارێك دووبارە کردەوە بەبەکارهێنانی بۆڕی تیرە جیاواز و درێژی جیاواز و هەر جارێك چیوەکە نزم دەبۆوە بۆ نزیکەی بەرزی 760 mm

ئەو بۆشاییەی سەر جیوەی ناو بۆرییەکە، بەتاڵەو بەتەواوی هەوای تێدانییەو جیوەی ناو بۆرییەکە لەکاری هێزی ڕاکێشانی زەوی دێتە خوارەوە، ستوونە جیوەی ناو بۆرییەکە، لە دابەزین دەوەستێت لە پنتێکی دیاریکراودا، چونکە پەستانی کەش کاردەکاتە سەر جیوەی دەری بۆرییەکەو ئەو هێزە بە جیوەکەدا دەگوێزرێتەوەو کار دەکاتە ستوونە جیوەی ناو بۆرییەکە بەرەو ژوور، ئەویش تا ماوەیەکی دیاریکراو بە بۆرییەکەدا دێتە خوارەوە، تاکو ئەو پەستانەی کێشەکەی یەکسان دەبێت بە پەستانی کەش.

بەرزی ڕاستی جیوەی ناو بۆری پەستانپێو ( بارۆمەتر) مکە.

لە تاقیکردنەوەکانی تۆریشەلی و هی تریشەوە، زانرا کە تێکڕای پەستان لە ڕووی دەریا و لە پلەی گەرمی 0°C (سفری سەدیدا) یەکسانە بە پەستانی ستوونێکی جیوەکە بەرزییەکەی 760 mm بێت و لە هەر پنتێکی تری سەر ڕووی زەوی، بەهای پەستانی کەش، لەکاتی پێوانیدا، بەستراوە بە بەرزی و هۆکارەکانی ئاوو هەواوە.




**شێوە 4-7** تۆریشەلی گەیشتە ئەوەی کە پەستانی کەش یەکسانە بە پەستانی ستوونێك جیوە کە بەرزییەکەی 760 mm بێت لە سەرووی ئاستی جیوەی ناو دەفرەکەوە.

ئەگەر پەستانی کەش لە تێکڕاکەی سەر ڕووی دەریا بەرزتر بووەوە بەرزی ستوونی جیوەی ناو بارۆمەترەکە لە 760 mm زۆرتر دەبێت و، ئەگەر پەستانی کەش نزم بووە، بەرزیی ستوونی جیوەی ناو بارۆمەترەکە لە 760 mm کەمتر دەبێت.

هەمووگازەکان، نەك هەر گازەکانی بەرگە کەش پەستانیان هەیە و ئامێرێك هەیە پێی دەڵێن مانۆمەتر manometer ، بۆ پێوانی پەستانی نموونەی گازە قەتیسەکان بەکاردەهێنرێت، وەك لە شێوەی 8-4 دا دەردەکەوێت ، جیاوازی بەرزی جیوەی دوو پەلی بۆرییە ( U شێوەکە) پێوەری پەستانی گازی ئۆکسجینە لە کەمۆڵەکەدا.

## یەکەکانی پەستان

چەند یەکەیەك بۆ پێوانی پەستان بەکاردەهینرێن و، لە بەرئەوەی پەستانی کەش بەزۆری بە بارۆمەتری جیوە دەپێورێت، بۆیە پەستان بەپێی بەرزی ستوونی جیوە دەردەبڕدرێت، لەبەر ئەوە، **یەکەی باوی پێوانی پەستانی، میللیمەتر جیوە millimeter of mercury** و بە *mm Hg* کورت دەکرێتەوە، بە پەستان *1 mm Hg* دەڵێن **1 torr** ، بۆ بە نەمری هێشتنەوەی یادی تۆریشەلی کە بارۆمەتری دۆزییەوە، تێکڕای پەستانی کەش لە ئاستی ڕووی دەریا و لە پلەی گەرمی سفری سەدیدا دەکاتە 760 mm Hg :

بەزۆری پەستان بەیەکەی پەستانی کەش دەپێورێت، **یەکەی پەستانی کەش atmosphere of pressure** ، یەك *(atm)* ، دەکاتە *760 mm Hg* .

لەیەکە نێودەوڵەتییەکاندا ، SI ، پەستان بە یەکەیەکی وەرگرتە دەردەبڕدرێت پێی دەڵێن پاسکاڵ، بەناوی (پلاز پاسکاڵ) ەوە، ئەو بیرکاریزان و فەیلەسووفە فەرەنسایییەی لەسەدەی حەڤدەیەمدا لە پەستانی کۆڵییەوەو یەك پاسکاڵ **pascal** *(Pa)* ئەو پەستانەیە، کە هێزێکی یەك نیوتنی *(1 N)* دەیخاتە سەر ڕووبەرێکی یەك مەتر دووجا.

خشتەی 1-4 ، ئەو یەکەی پەستانانەی لەم کتێبانەدا بەکارهێنراون کورت دەکاتەوە.

**خشتە 1-4 یەکەکانی پەستان**

| یەکە | هێما | پێناسە / پێوەندی |
|---|---|---|
| پاسکاڵ | Pa | یەکەی SI ی نێو دەوڵەتی<br>$1\ Pa = \frac{1\ N}{m^2}$ |
| میللیمەترجیوە | mm Hg | ئەو پەستانەیەکە یەکسانە بە پەستانی ستوونێك جیوە، بەرزییەکەی 1 mm لە بارۆمەتردا. |
| تۆر | torr | 1 torr = 1 mm Hg |
| پەستانی کەش | atm | تێکڕای پەستانی کەش لە ئاستی ڕووی دەریا و لە سفری سەدیدا.<br>1 atm = 760 mm Hg<br>= 760 torr<br>$= 1.01325 \times 10^5$ Pa<br>= 101.325 kPa |



**شێوە 8-4** لەو پەستان پێوەی سەرەوەدا، پەستانی ئەو گازی ئۆکسجینەی لە کەمۆڵەکەدایە، ستونە جیوەکە پاڵ پێوە دەنێت، جیاوازی بەرزی جیوەکە لە هەردوو لای بۆری پەستان پێوەکەدا (کە لە پیتی U دەچێت)، نیشانەی ئەوەیە کە گازی ئۆکسجین پەستانی هەیە.

## پلەی گەرمی پەستانی پێوانەیی

بۆ بەراوردکردنی قەبارەی گازە جیاوازەکان، پێویستە پلەی گەرمی و پەستان زانراین و بە ئامانجی بەراورد، زانایان لە سەر دوو مەرجی پێوانەیی ڕێککەوتوون، پەستانی *1 atm* ، و پلەی گەرمی *0℃* ، بەم دوو مەرجە دەڵێن: پلەی گەرمی و پەستانی پێوانەیی **standard temperature and pressure** و ئاسایی بە *STP* کورت دەکرێتەوە.

**پرسی نموونەیی 1-4**

تێکڕای پەستانی کەش لە شارێك لە بوو **0.830 atm**، ئەم پەستانە بە : ( أ ) **mm Hg** (ب) **kPa** دەربڕە.

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پەستانی کەش = 0.83 atm

1 atm = 760 mm Hg

1 atm = 101.325 kPa

**نەزانراو:** أ. پەستانی کەش بە mm Hg

ب. پەستانی کەش بە kPa

**2 نەخشە بکێشە**

أ. $atm \rightarrow mm\ Hg; \quad atm \times \frac{mm\ Hg}{atm} = mm\ Hg$

ب. $atm \rightarrow kPa; \quad atm \times \frac{kPa}{atm} = kPa$

**3 بدۆزەرەوە**

أ. $0.830\ \cancel{atm} \times \frac{760\ mm\ Hg}{\cancel{atm}} = 631\ mm\ Hg$

ب. $0.830\ \cancel{atm} \times \frac{101.325\ kPa}{\cancel{atm}} = 84.1\ kPa$

**4 هەڵسەنگێنە**

یەکە لێکچووەکان لە هەردوو لای هاوکێشە کە کورت کراوەتەوە بۆ ئەوەی یەکە داواکراوەکان بمێنێتەوە، وەڵامەکان چاکسازی کراون بۆ ژمارەی تەواو لە ڕەنووسە واتاییەکانەوە، پەستانی دراو %80 ی پەستانی کەشا.

**کارپێکەرە ڕاهێنان**

**1.** 1.75 atm بگۆڕە بۆ kPa و mm Hg .

**2.** 570. torr بگۆڕە بۆ atm و kPa .

**وەڵامەکان:**

**1.**177 kPa، 1330 mm Hg

**2.** 0.750 atm، 76.0 kPa

## پێداچوونەوەی کەرتی 2-4

**1.** پەستان پێناسەبکە.

**2.** ئەو یەکانە بۆ پێوانەی پەستان بەکار دەهێنرێن چین؟

**3.** دوو مەرجە پێوانەییەکانی، پێوانەی گازەکان چین؟

**4.** ئەم پەستانەی خوارەوە بگۆڕە بۆ یەکەی atm :

أ. 151.98 kPa

ب. 456 torr

ج. 912 mm Hg

## کەرتی 4-3

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- بیردۆزی گەردە جوولە بەکاردێنێت بۆ لێکدانەوەی پێوەندی نێوان قەبارەی گاز و پلەی گەرمی و پەستان.
- یاسای بۆیل بەکاردێنێت بۆ دۆزینەوەی گۆڕانی قەبارە و پەستان، لەکاتی جێگیریی پلەی گەرمیدا.
- یاسای شارڵ بەکاردێنێت بۆ دۆزینەوەی گۆڕانی قەبارە و پلەی گەرمی، لەکاتی جێگیری پەستاندا.
- یاسای گایلۆساك بەکاردێنێت بۆ دۆزینەوەی گۆڕانی قەبارە و پلەی گەرمی، لەکاتی جێگیریی قەبارەدا .
- یاسای گشتی گازەکان بەکاردێنیت، بۆ دۆزینەوەی گۆڕانی قەبارە و پلەی گەرمی و پەستان.
- یاسای بەشە پەستانی دالتۆن بەکاردێنێت بۆ دۆزینەوەی بەشە پەستان و پەستان گشتی.

# یاساکانی گاز

زانایان سەدان ساڵ لە ڕەوشی فیزیایی گازەکان کۆڵییەوە، لە ساڵی 1662دا، ڕۆبەرت بۆیل بۆی دەرکەوت کە پەیوەندییەکی بیرکارییانە هەیە لە نێوان پەستانی گاز و قەبارە کەیدا، ئەو سەرنجەی بۆیل و کەسانی تریش بووە هۆی گەشەکردنی یاساکانی گاز، یاسا کانی گاز **gas laws** **پێوەندی بیرکاریی سادەیە لە نێوان قەبارەی گاز و پلەی گەرمییەکەی و پەستان و بڕەکەیدا.**

## یاسای بۆیڵ: پەیوەندیی نێوان قەبارە و پەستان

ڕۆبەرت بۆیل دۆزییەوە کە دوو ئەوەندە کردنی پەستانی گازێك لە پلەیەکی گەرمیی جیگیردا، دەبێتە هۆی کەمکردنی قەبارەکەی بۆ نیوئەوەندە و بەسێ ئەوەندە زیادکردنی پەستان، قەبارەکەی دەبێتە سێ یەکی و بە پێچەوانەیشەوە کەمکردنەوەی پەستانەکەی بۆ نیوئەوەندە، دەبێتە هۆی دوو ئەوەندە گەورە بوونی قەبارەکەی و هەر چەند یەکێك لەو دوو هۆکارە زیادبکات، هۆکارەکەی تریان کەم دەکات، شێوە 9-4 ، دەری دەخات هەر چەندێك قەبارەی گازی ناو سرنجەکە، کەم بکات پەستانەکەی زیاد دەکات.

دەتوانین بیردۆزی گەردەجوولە بەکاربهێنین، بۆ تێگەیشتنی هۆی ئەم پێوەندییە، لە نێوان قەبارەی گاز و پەستانەکەیدا، پەستانی گاز لە پێکداکەوتنی گەردە جووڵەکەکان بە دیواری دەفرەکەدا پەیدا دەبێت وادابنێ کە قەبارەی دەفرەکە کەم کراوەتەوە، لەگەڵ مانەوەی ژمارەی گەردیلەکانی گاز و پلەی گەرمییەکەی بە جێگیری ، ژمارەیەکی زۆرتر گەرد دەبێت لە یەکەیەکی قەبارەدا و لە ئەنجامدا زۆربوونی ژمارەی پێکداکەوتنەکان لەسەر ڕووبەری دیوارەکە و ئەوەیش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پەستانی گاز.







**شێوە 9-4** قەبارەی گاز لەو سەرنجەی لە وێنەکەدا دەردەکەوێت، کەم دەکات، کاتێك باڵی پەستێنەکە بەرە و خوارپاڵ پێوەدەنرێت، پەستانی گاز زۆر دەبێت کە قەبارەکەم بکات، چونکە گەردەکان زۆرتر لەگەڵ دیواری دەفرەکەدا بەریەك دەکەون، لە قەبارەی کەمتردا.

**خشتە 2-4** زانیارییەکانی قەبارە و پەستانی نموونەیەکی گاز (بارستە و پلەی گەرمی جێگیرن)

| قەبارە (mL) | پەستان (atm) | قەبارە × پەستان (atm × mL) |
|---|---|---|
| 1200 | 0 .5 | 600 |
| 600 | 1.0 | 600 |
| 300 | 2.0 | 600 |
| 200 | 3.0 | 600 |
| 150 | 4.0 | 600 |
| 120 | 5.0 | 600 |
| 100 | 6.0 | 600 |

خشتەی 2-4 زانیارییەکانی پەستان و قەبارەی بارستەیەکی جێگیری گاز، لە پلەیەکی گەرمیی جێگیردا، وێنەکێشانی بەهاکانی قەبارە بەرانبەر بە پەستان هێڵێکی زانیاریی ڕوونکەرەوەمان دەداتێ وەك لە شێوەی 10-4 دا و بەم پەیوەندییە گشتییەی نێوان قەبارە و و پەستان دەڵێن یاسای بۆیڵ **Boyle's law** بەم پێیە: **قەبارەی بارستەیەکی گازێك پێچەوانە لەگەڵ پەستان هاوڕێژە دەبێت، لە کاتی جێگیری پلەی گەرمیدا.**

بیرکارییانە، یاسای بۆیڵ وەك خوارەوە دەردەبڕێت:

$$VP = k \quad \text{یان} \quad V = k\,\frac{1}{P}$$

بەهای $k$ ی جێگیربۆ نموونەیەکی دیاریکراوی گازێك و تەنیا پشت بە بڕی گازەکە و پلەی گەرمی دەبەستێت. (سەرنج بدە، بەهای $k$ لە زانیارییەکانی خشتە 2-4 دا دەکاتە: $k = 600$ atm × mL )، ئەگەر پەستانی نموونەیەکی گاز لە پلەیەکی گەرمی جیگیردا گۆڕا ئەوا، قەبارەیش دەگۆڕێت، بەڵام بڕی پەستان لێکدراو لەگەڵ قەبارە بۆ هەمان بەهای $k$ بەیەکسانی دەمێنێتەوە.

دەتوانرێت ، یاسای بۆیڵ بۆ بەراوردی بارودۆخی گۆڕدراوی گاز، بەکاربهێنریت بە بەکارهێنانی $P_1$ و $V_1$ بۆ نواندنی بەهای پەستان و قەبارە، لە باری دووەمدا بەو پێیە ئەم دوو هاوکێشەیەمان دەست دەکەوێت:

$$P_1V_1 = k \quad k_2V_2 = k$$

جا، لەبەر ئەوەی بەهای $k$ جێگیرە ، ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە دەست دەکەوێت:

$$P_1V_1 = P_2V_2$$

بەزانینی بەهای سێ گۆڕاو لەم چوارە: $P_1$، $V_1$، $P_2$، $V_2$ دەتوانین بەهای گۆڕاوی چوارەمی سیستەمە هەبوو لە پلەی گەرمی جێگیرە بدۆزینەوە.




**شێوە10-4** شێوە ڕوونکەرەوەکە، بوونی پێوەندییەکی پێچەوانەی نێوان قەبارە و پەستان دەردەخات، قەبارە دەبێتە دوو ئەوەندە، کاتێك پەستان دەبێتە نیو ئەوەندە.

پرسی نموونەیی 2-4

**قەبارەی نموونەیەکی گازی ئۆکسجین 150 mL ، کاتێك پەستانەکەی 0.947 atm بێت، قەبارەی گازەکە دەبێتە چەند کاتێك پەستانەکەی دەبێتە 0.987 atm ، لەکاتی جێگیری پلەی گەرمیدا؟**

## شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** $V_1 = 150$ mL ی ئۆکسجین $O_2$ .

$P_1 = 0.947$ atm ی ئۆکسجین $O_2$ .

$P_2 = 0.987$ atm ی ئۆکسجین $O_2$ .

**نەزانراو:** $V_2$ ی ئۆکسجین $O_2$ بە mL

**2 نەخشە بکێشە**

$$P_1 ، V_1 ، P_2 \rightarrow V_2$$

هاوکێشەی یاسای بۆیل $(P_1V_1 = P_2V_2)$ ڕێك بخە تاکو $V_2$ ت دەست بکەوێت.

$$V_2 = \frac{P_1V_1}{P_2}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بەهای $P_2$ ، $V_1$ ، $P_1$ بگۆرە ڕەوە بۆ دەستکەوتنی قەبارەی نوێ $V_2$ .

$$V_2 = \frac{P_1V_1}{P_2} = \frac{(0.947 \text{ atm})(150. \text{ mL } O_2)}{0.986 \text{ atm}} = 144 \text{ mL } O_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

کە پەستان کەمیك زیاد بکات و پلەی گەرمی جێگیربێت قەبارەکەمێك بچووك دەبێتەوە، وەك چاوەڕوان دەکرێت، یەکەکان کورت دەکرێنەوە تاکو mL مان دەست بکەوێت کە یەکەی قەبارەیە.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** بالۆنێکی پڕ گازی هیلیۆم، قەبارەکەی 500 mL لە ژێر پەستانی 1 atm دا، بالۆنەکە بەردراو، گەیشتە بەرزی 6.5 km ، کە پەستان دەبێتە 0.5 atm ، گازەکە لەو بەرزاییەیدا قەبارەکەی چەند دەبێت ئەگەر وا دابنێتی پلەی گەرمی ناگۆڕدرێت؟

**2.** گازێك پەستانەکەی 1.26 atm ، قەبارەکەی دەکاتە 7.40 L ، ئەگەر قەبارەی گازەکە بووە 2.93 L پەستانەکەی چەند دەبێت، ئەگەر وا دابنێت پلەی گەرمی جێگیرە ؟

**3.** ژێر ئاو گەڕان دەزانن کە پەستانی ئاو نزیکەی 100 kPa زیاددەکات هەر چەندە 10.2 m قووڵتر بێت ، ئەمە واتە لە قووڵایی 10.2 m لە ژێر ڕووی ئاوەکەوە، پەستان دەبێتە 201 kPa و، و لە قووڵایی 20.4 m وە پەستان دەبێتە 301 kPa و هەروەها ئەگەر قەبارەی بالۆنێك 3.5 L بێت لەباری STP دا و، پلەی گەرمی ئاوەکە ناگۆڕێت، قەبارەکەی لە قووڵایی 51 m لە ژێر ڕووی ئاوەکەوە چەند دەبێت؟

**وەڵامەکان:**

**1.** 1000 mL He

**2.** 3.18 atm

**3.** 0.59 L

# یاسای شارڵ: پێوەندی نێوان قەبارە و پلەی گەرمی

ئارەزو مەندانی باڵۆنسواری (شێوەکەی سەرەتای بەندەکە)، سوودیان لە یەکێك لەڕەوشە فیزیاییەکانی گازەکان وەرگرتووە کە بەگەرمی کشانی گاز ، لەگەڵ جێگیریی پەستاندا، کاتێك پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە، ئەو قەبارەیەی ژمارەیەکی دیاریکراوی گەردەکانی گاز داگیری دەکەن زیاددەکات و، بەجێگیر هێشتنەوەی پەستان.

برە پێوەندی نێوان قەبارە و پلەی گەرمی، ساڵی 1787 لە لایەن (جاك شارڵ) ی زانای فەرەنسییەوە دۆزرایەوە تاقیکردنەوەکەی شارڵ دەری خست کە هەموو گازەکان بەیەکسانی دەکشێن، ئەگەر بۆ ماوەی یەکسان گەرم بکرێن و شارڵ ئەوەیشی دۆزییەوە کە بۆ هەر پلەیەکی سەدی، قەبارە بە ڕێژەی $1/273$ ی قەبارەی بنچینەیی گازەکە دەگۆڕدرێت، ئەگەر لە ژێر پەستانێکی جیگیرو پلەی گەرمی $0^{o}C$ دا لەسەرەتای گەرمکردنەکەدا ڕوویدات، بۆ نموونەکە پلەی گەرمی ببێتە $1^{o}C$ ، قەبارەی گازەکان $1/273$ قەبارەی بنچینەییەکەی لە $0^{o}C$ دا زیاد دەکات و لە پلەی $10^{o}C$ دا، قەبارەکەی $10/273$ ی قەبارە بنچینەییەکەی لە $0^{o}C$ دا زیاد دەکات وکە پلەی گەرمی بەرزبووەوە بۆ $273^{o}C$ ، قەبارەی گازەکە بە ڕێژەی $273/273$ قەبارەی بنچینەیەکەی زیاد دەکات، واتە دەبێتە دوو ئەوەندەی قەبارە سەرەتاییەکەی.

بەهەمان شێوە، قەبارەی گازەکە دەگۆڕێت و کەم دەکات، ئەگەر ساردکرایەوە پەستان بە جێگیری، وەك لە باڵۆنەکانی شێوە 4-11 دا دەردەکەوێت و، بەنزمبوونەوە لە $0^{o}C$ یەوە بۆ $-1^{o}C$ ، قەبارە بە ڕێژەی $1/273$ کەم دەکات و هەروەها، نزمبوونەوەی پلەی گەرمی لە $0^{o}C$ یەوە بۆ $-273^{o}C$ دەبێتە هۆی کەمکردنی قەبارە بە ڕێژەی $273/273$ واتە قەبارە دەبێتە سفر. کە شتی وا ڕوونادات و لە ڕاستیدا ناتوانرێت گازە ڕاستەقینەکان سارد بکرێنەوە بۆ $-273^{o}C$ و پێش گەیشتنە ئەو پلە گەرمییە، هێزە گەردییە نێوانییەکان، زاڵ دەبن بە سەر وزەی جووڵەی گەردەکاندا و گازەکان خەست دەبنەوە. شل یان تەنی ڕەق پێك دێنن

**شێوە11-4** ئەگەر هەندێ باڵۆن (میزڵدان) پڕلە هەوا لە نایترۆجینی شلکراوەدا، دابنێین، زۆر بچووك دەبنەوە و کە لە نایترۆجینە شلکراوەکە دەریان بهێنین وا دابنرێن تاکو گەرمی ژوورەکە هەواکەیان بۆ دەگێڕێتەوە باڵۆنەکە دەکشێنەوە و قەبارەکەیان وەك خۆی لێ دێتەوە.







**خشتە 3-4** زانیارییەکانی قەبارە و پلەی گەرمیی نموویەکی گاز (بارستە و پەستان جێگرن).

| پلەی گەرمی (ºC) | قەبارە (mL) |
|---|---|
| 273 | 1092 |
| 100 | 746 |
| 10 | 566 |
| 1 | 548 |
| 0 | 546 |
| -1 | 544 |
| -73 | 400 |
| -173 | 200 |
| -223 | 100 |

زانیارییەکانی خشتەی 3-4 ، پەیوەندی نێوان قەبارە و پلەی گەرمی ڕوون دەکاتەوە، لە کاتی جێگیری پەستانی نموونەیەکی گاز کە قەبارەکەی 546 mL بێت لە 0ºC دا.

دەبینین لە خشتەی 3-4 دا، کە قەبارە ڕاستەوانە لەگەڵ زۆربوونی پلەی سەدی (سیلیزی) دا زۆر نابێت و، کە پلەی گەرمی دە ئەوەندە زیاد بکات، لە10ºC وە بۆ 100ºC ، بۆ نموونە قەبارە ، دە ئەوەندە زیاد ناکات، بەڵکو لە566 mL وە دەبێتە 746 mL .

(پێوەری کەلڤن)ی پلەی گەرمی، پێوەرێکە بە پلەی 273.15ºC– دەست پێ دەکات کە بچووکترین پلەی گەرمییە کە بتوانین بیگەینێ و بە پلەی گەرمی ***–273.15ºC*** دەڵێن **سفری پەتی absolute zero** و بەو جۆرە بەهای سفر دەدرێت لە **پێوەری کەلڤنداو**، پێوەندیی نێوان پێوەری پلەی گەرمی سەدی وکەلڤن بەم هاوکێشەیە ڕوون دەکرێتەوە:

$$K = 273.15 + ºC$$

بۆ ئاسانی دۆزینەوە، ڕەنووسەکە نزیك دەکرێتەوە لە 273.15 بۆ 273

پێوەری کەلڤنی پلەی گەرمی، نزیکترینە بۆ دەربڕینی وزەی جووڵەی گەردەکانی گاز، قەبارەی گاز و پلەکانی کە لڤن ڕاستەوانە هاوڕێژەن کە پلەکانی کەلڤن چوار ئەوەندە زیاد بکات قەبارەی گازیش چوار ئەوەندە زیاد دەکات و کە پلەی کەلڤن تا نیو ئەوەندە نزم ببێتەوە قەبارەیش دەبێتە نیو ئەوەندە.

بەپێوەندیی نێوان پلەکانی کەلڤن و قەبارەی گاز دەڵێن یاسای شارڵ، **دەقی یاسای شارڵ Charles's law** بەم جۆرەیە: **قەبارەی بارستەیەکی گاز، ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ پلەی گەرمی (کەلڤن) دا، لە کاتی جێگیری پەستاندا.**

**خشتە 4-4** زانیارییەکانی قەبارە و پلەی گەرمی نموویەکی گاز (بارستە و پەستان جێگرن).

| قەبارە (mL) | پلەی گەرمی کەلڤن (K) | $V/T$ یان $k$ (mL/K) |
|---|---|---|
| 1092 | 546 | 2 |
| 746 | 373 | 2 |
| 566 | 283 | 2 |
| 548 | 274 | 2 |
| 546 | 273 | 2 |
| 544 | 272 | 2 |
| 400 | 200 | 2 |
| 100 | 50 | 2 |




**شێوە 12-4** وێنە ڕوونکەرەوەکە دەری دەخات پێوەندی نێوان قەبارە و پلەی گەرمیی بەکەلڤن دەردەخات کە لە و زانیاریانەی خشتە 4-4 ەوە ، وەرگیراون پێوەندییەکە هێڵییە درێژکراوەی ئەو هێڵە بە پنتی سفردا دەڕوات و، پێشانی دەدات کە قەبارە دەبێت بە سفر لە پلەی گەرمی $-273^oC$ دا، پەیوەندی هێڵیی جەختی بوونی هاوڕێژە بوونێکی ڕاستەوانە دەکاتەوە لە نێوان دوو گۆڕاوەکەدا.

شێوە 12-4 ، پێوەندی نێوان قەبارەی گاز و پلەی گەرمی کەلڤن ڕوون دەکاتەوە، ئەویش بە وێنەکیشانی زانیارییەکانی خشتە 4-4 ، دەتوانین یاسای شارڵ بەم شێوەیەی خوارەوە دەربڕین:

$$V = Tk \quad \text{یان} \quad \frac{V}{T} = k$$

بەهای $T$ پلەی گەرمی کەلڤنە و $k$ بڕێکی جێگیرە، بەهاکەی بەستراوە تەنیا بە بڕی گاز و پەستانەوە وە یەکسانە بە ڕێژەی $V/T$ ، بۆ هەموو کۆمەڵە بەهایەکی قەبارە و پلەی گەرمی بەهای $k$ ناگۆڕدرێت ، دەقی یاسای شارل کە دەتوانرێت ڕاستەوخۆ لە زۆربەی پرسەکان قەبارە و پلەی گەرمی لە گازەکاندا بەکاربهێنرێت، وەك خوارەوەیە:

$$\frac{V_1}{T_1} = \frac{V_2}{T_2}$$

$V_1$ و $T_1$ دوو مەرجەکەی سەرەتایی گازەکە و، $V_2$ و $T_2$ دوو مەرجە نوێیەکەیین و، کەسێ بەها لە چواری ($V_1$ و $T_1$ و$V$ و $T_2$) زانراوبن، هاوکێشەکەی سەرەوە بەکاردێت، بۆ دۆزینەوەی بەهای چوارەم.

**پرسی نموونەیی 3-4**

**نموونەیەکی گازی نیۆن، قەبارەکەی 752 mL بوو لە پلەی گەرمی 25°C دا، ئایا قەبارەی گازەکە، لە پلەی گەرمی 50°C و پەستانێکی جێگیردا (هەمان پەستاندا) چەند دەبێت؟**

شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** قەبارەی نیۆن $V_1$ = 752 mL .

پلەی گەرمی نیۆن $T_1$ = 298 K = 25°C + 273 .

پلەی گەرمی نیۆن $T_2$ = 323 K = 50°C + 273

سەرنج بدە لە پلەی گەرمییە سەدییەکان، گۆڕاون بۆ کەلڤن، ئەمەیش هەنگاوێکی گرنگە بۆ زانینی پرسەکانی ئەم بەندە.

**نەزانراو:** قەبارەی نیۆن $V_2$ بە mL .

**2 نەخشە بکێشە**

لەبەر ئەوەی گازەکە لەژێر پەستانێکی جێگیردا دەمێنێتەوە، هەر زیادبوونێکی پلەی گەرمی، دەبێتە هۆی زۆربوونی قەبارە، بۆ دەستخستنی $V_2$ ،. هاوکێشەی یاسای شارڵ ڕێزبکەرەوە:

$$V_2 = \frac{V_1 T_2}{T_1}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بەهای $V_1$ ،$T_1$ ،$T_2$ بگۆڕەرەوە، بۆ دەستخستنی $V_2$ ی نوێ:

$$V_2 = \frac{V_1 T_2}{T_1} = \frac{(752\ \text{mL Ne})(323\ \cancel{\text{K}})}{298\ \cancel{\text{K}}} = 815\ \text{mL Ne}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

وەك چاوەڕوان دەکرێت، قەبارەی گازەکە بە زۆر بوونی پلەی گەرمی زۆر دەبێت، یەکەکان کورت کراونەتەوە بۆ دەستخستنی ملیلیتر، وەك داوکراوە، وەڵامەکە، ژمارەیەکی گونجاو ڕەنووسی واتایی تێدایە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** باڵۆنێکی پڕ گازی هیلیۆم، قەبارەکەی 2.75 L بوو، لەپلەی گەرمی 20°C دا، ئەگەر قەبارەکەی بووبە 2.46 L کاتێك لە بەستێنی بەفرگرێکدا دانرا freezer ، پلەی گەرمی لە ناو بەستێنەکەدا بەکەلڤن K چەندە؟ و بەپلەی سەدی چەندە C° ؟

**2.** گازێك پلەی گەرمییەکەی 65°C قەبارەکەی 4.22 L بوو، لە چ پلەیەکی گەرمی سەدیدا ، قەبارەکەی دەبێتە 3.87 L ، ئەگەر وا دابنێت کە پەستان جێگیرە؟

**وەڵامەکان:**

**1.** 262 K ؛ −11°C

**2.** 37°C

## یاسای گایلۆساك: پەیوەندی نێوان پەستان و پلەی گەرمی

فێری برە پەیوەندیی نێوان قەبارە و پلەی گەرمی بە جێگیری پەستان بوویت، چی چاوەڕوان دەکەیت بۆ پێوەندی نێوان پەستان و پلەی گەرمی بە جێگێری قەبارە؟ بینیت کە پەستان لە پێکداکەوتنی گەردەکانی گاز لەگەڵ دیواری ئەو دەفرەی گازەکەی تێدایە پەیدا دەبێت و وزە و لەرەی پێکداکەوتووەکان ( ژمارەیان لەیەکەیەکی کاتدا) بەستراوە بە تێکڕای وزەی جووڵەی گەردەکانەوە و ئەویش بە پێی خۆی بەستراوە بە

پلەی گەرمییەوە لە بڕێکی دیاریکراوی گازێکی قەبارە جێگیردا، پێویستە پەستان ڕاستەوانە هاوڕێژەبێت لەگەڵ پلەی گەرمی کەلڤندا، کە ڕاستەوخۆ بەستراوە بە تێکرای وزەی جووڵەوە.

ڕاستی ئەو گریمانە، بۆ هەر گۆڕانێکی پلەی گەرمی کەلڤن دەردەکەوێ کە پەستانی گازێکی پەستێوراو بە ڕێژەی 1/273 ی پەستانەکەی دەگۆڕێ لە 0ºC دا ، ساڵی 1802 ، گایلۆساك ڕێزی لێ نرا، چونکە گەیشتبووە ئەو ڕاستییە، ئەو شێوە ڕوونکەرەوەیەی لە شێوە 4-13 دا دەیبینین، یاسای گایلۆساك **Gay-Lussac's law** دەڵێت: **پەستانی بارستەیەکی دیاریکراوی گاز، ڕاستەوانە لەگەڵ پلەی گەرمیی دەگونجێت، لە کاتی جێگیربوونی قەبارەی گازدا و بیرکارییانە**، یاسای گایلۆساك بەم جۆرە دەردەبڕدرێت:

$$P = Tk \quad \text{یان} \quad \frac{P}{T} = k$$

کاتێك $T$ پلەی گەرمییە بە کەلڤن و $k$ ، بڕێکی جێگیرە و بەهاکەی پشت بەبڕ و قەبارەی گازەکە دەبەستێت و، بیرکارییانە بەم جۆرەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

$$\frac{P_1}{T_1} = \frac{P_2}{T_2}$$

کە بەهای سیان لەم چوار بڕە بزانرێت $(P_1 ، P_2 ، T_1 ، T_2)$ دەتوانرێت بەهای چوارەمیش بدۆزرێتەوە.




**شێوە 4-13** وێنەکە دەری دەخات کە پەستانی گاز ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ پلەی گەرمی کە لڤندا، کاتێك قەبارە جێگیربێت.

**پرسی نموونەیی 4-4**

**پەستانی گازێك لە قوتووی بۆنێکدا 3.00 atm بوو، لە پلەی گەرمی 25ºC دا، ئاگادارییەکانی قوتووەکە دەڵێت: نابێت لە شوێنێکدا دابنرێت کە پلەی گەرمییەکەی لە 52ºC زۆرتر بێت، پەستانی گازەکە لەو پلەیەدا چەند دەبێت؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پەستانی گازەکە $P_1 = 3.00\ atm$ .

پلەی گەرمی گازەکە $T_1 = 25ºC + 273 = 298\ K$ .

پلەی گەرمی گازەکە $T_2 = 52ºC + 273 = 325\ K$

**نەزانراو:** پەستانی گازەکە $P_2$ بە atm .

**2 نەخشە بکێشە**

لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی گازەکە، لە قەبارەی جێگیری قوتووەکەدا دەمێنێەوە و هەر زۆربوونێکی پلەی گەرمی دەبێتە هۆی زۆربوونی پەستان، هاوکێشەی یاسای گایلۆساك ڕیزبکەرەوە تاکو بە های $P_2$ دەست بکەوێت:

$$P_2 = \frac{P_1 T_2}{T_1}$$

**3** **بدۆزەرەوە** بەهای $P_1$، $T_1$، $T_2$ دابنێ بۆ دەستکەوتنی بە های نوێی پەستان $P_2$:

$$P_2 = \frac{P_1T_2}{T_1} = \frac{(3.00 \text{ atm})(325 \text{ K})}{298 \text{ K}} = 3.27 \text{ atm}$$

**4** **هەڵسەنگێنە** زۆربوونی پلەی گەرمی لە قەبارە جێگیرەکاندا، دەبێتە هۆی، وەك پێشبینی دەکرێت، زۆربوونی پەستانی ناوەڕۆکی قوتووەکە، یەکەکان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست کورت دەکرێنەوە وەڵامەکە، ژمارەی تەواو ڕەنووسی واتایی تێدا دەبێت.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. پێش گەشتێك لە شاری قودسەوە بۆ مەککەی پیرۆز، پەستانی هەوای ناو تایەی ئۆتۆمۆبیلێك 1.8 atm بوو لە 20°C دا و لە کۆتایی گەشتەکەدا، پەستان بوو بە 1.9 atm ، پلەی گەرمییە نوێیەکە چەند پلەی سەدی دەبێت لە ناو تایەکەدا؟، (وادابنێ قەبارەی تایەکە ناگۆڕدرێت) .
2. نموونەیەك نایترۆجین پەستانەکی 1.07 atm بوو لە پلەی گەرمی 120°C دا، پەستانە پێشبینیکراوەکەی لە پلەی گەرمی 205°C دا چەندە؟ (ئەگەر وا دابنێین ، پەستان نە گۆڕەوە).
3. نموونەیەکی هیلیۆم، پەستانەکەی 1.20 atm بوو لە 22°C دا، ئایا ئەو پلە گەرمییە سەدییە چەندە کە پەستانی هیلیۆمی تێدادەگاتە 2.00 atm ؟

وەڵامەکان:

1. 36°C
2. 1.30 atm
3. 219°C

## یاسای گشتی گازەکان

نموونەیەکی گاز دەکەوێتە بەر گۆڕانی هەنووکەیی پلەی گەرمی و پەستان و قەبارە، ئەو کاتە، پێویست دەکات چاودێری ئەو سێ گۆڕۆکە بکرێت، لە هەمان کاتدا، لەم بارەدا بۆ ئاسانکاری دەبێ ڕەفتار لەگەڵ هەرسێ گۆڕۆکەکەدا بکرێت بە کۆکردنەوەی یاساکانی بۆیل و شارڵ و گایلۆساك لە شێوگێکدا، **یاسای گشتی گازەکان combined gas law** پێوەندی نێوان پەستانی بڕێکی دیاریکراو گاز و قەبارە و پلەی گەرمییەکەی دەردەبڕێت و دەتوانرێت یاساکە، بەم شێوگە بیرکارییە دەربڕدرێت:

$$\frac{VP}{T} = k$$

کە بڕێکی جێگیرە و پشت بە بڕی گازەکە دەبەستێت و دەتوانرێت شێوگی یاساگشتیەکە بەم جۆرە بنووسرێتەوە:

$$\frac{P_1V_1}{T_1} = \frac{P_2V_2}{T_2}$$

ژێر ڕەنووسەکان، لە هاوکێشەکەدا دوو کۆمەڵە بارودۆخ پیشان دەدات، $T$ پلەی گەرمییە بە کەلڤن و، دەتوانرێت لەم هاوکێشەیەدا هەر هۆکارێك لەو شەش هۆکارە بدۆزرێتەوە ئەگەر پێنجەکەی تریان زانراو بن، سەرنج بدە، دەتوانرێت هەر یاسایەکی سێ یاساکەی گازمان دەست بکەوێت، لەگەڵ جێگری گۆڕۆکی گونجاودا، بۆیە لە کاتی جێگیری پلەی گەرمییدا $T$ لە هەردوو لای هاوکیشەکە کورت بکرێتەوە چونکە

بەهای $T$ نەگۆڕدراو $(T_1 = T_2)$ و بەو پێیە:

$$P_1V_1 = P_2V_2$$

لە باری جێگیری پەستاندا، $P$ کورت دەکرێتەوە لە هەر دوولای هاوکێشە، چونکە $P_2$ = $P_1$ و، بە و پێییە:

$$\frac{V_1}{T_1} = \frac{V_2}{T_2}$$

و لە باری جێگیری قەبارەدا، $V$ لە لە هەردوو لای هاوکێشەکە کورت دەکرێتەوە، چونکە $V_1 = V_2$ و یاسای گایلۆساکمان دەست دەکەوێت:

$$\frac{P_1}{T_1} = \frac{P_2}{T_2}$$

**پرسی نموونەیی 5-4**

**قەبارەی باڵۆنێکی پڕ هیلیۆم، 50.0 L بوو لە پلەی گەرمی 25ºC و لە ژێر پەستانی 1.08 atm ، قەبارەی باڵۆنەکە چەندە لە ژێر پەستانی 0.855 atm و پلەی گەرمی 10ºC دا؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** قەبارەی هێلیۆم $V_1$ = 50.0 L

پلەی گەرمی هیلیۆم $T_1$ = 298 K = 273 + 25ºC

پەستانی هیلیۆم $P_1$ = 1.08 atm

پلەی گەرمی هیلیۆم $T_2$ = 283 K = 273 + 10ºC

پەستانی هیلیۆم $P_2$ = 0.855 atm

**نەزانراو:** قەبارەی هیلیۆم $V_2$ بە L

**2 نەخشە بکێشە**

لەبەرئەوەی پلەی گەرمی و پەستانی گازەکە دەگۆڕدرێت، یاسای گشتیی گازەکان کاری پێ دەکرێت، یاسای گشتی گاز ڕێزبکەرەوە بۆ دۆزینەوەی قەبارەی کۆتایی $V_2$ :

$$\frac{P_1V_1}{T_1} = \frac{P_2V_2}{T_2} \rightarrow V_2 = \frac{P_1V_1T_2}{P_2T_1}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بەها زانراوەکانی هاوکێشەکە بگۆڕەوە و بەهای $V_2$ دەست بخە:

$$V_2 = \frac{(1.08 \text{ atm})(50.0 \text{ L He})(283 \text{ K})}{(0.855 \text{ atm})(298 \text{ K})} = 60.0 \text{ L He}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

دیارە پەستان کەمی کردوە و، کەمکردنەکەی لە کەمکردنی پلەی گەرمی کەلڤن کەمترە وەك چاوەڕوان دەکرێت، بەرەنجامی کۆتایی دوو گۆ ڕۆکەکە، زۆربوونی قەبارەی، لێ دەکەوێتەوە، لە 50.0 L وە گۆڕدراوە بۆ 60.0 L ، لەگەڵ کورت کردنەوەی ئەندازە لێکچووەکانی هەردوو لای هاوکێشەکەو، نزیکخستنەوەی وەڵامەکە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی.

راهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** گازێك، قەبارەکەی 27.5 mL لەپلەی گەرمی 22.0°C و لەژێر پەستانی 0.974 atm دا، قەبارەکەی لە پلەی گەرمی 15.0°C و لە ژێر پەستانی 0.993 atm دا چەندە؟

**2.** نموونەی گازێك، قەبارەکەی 700. mL بوو لە بارە پێوانەییەکاندا STP ، پەستێورا تا قەبارەکەی بوو بە 200. mL و، گەرمی گازەکە کرا بە 30.0°C ، پەستانی نوێی گازەکە، بە Pa چەند دەبێت.

**وەڵامەکان:**

**1.** 26.3 mL

**2.** $3.94 \times 10^5$ Pa یان 394 kPa

## یاسای بەشەپەستانی داڵتۆن

جۆن داڵتۆن ئەو کیمیاگەرە ئینگلیزییەی بیردۆزی گەردیلەی دانا، لە تێکەڵکردنی گازەکان کۆڵییەوە، بینی کە پەستانی تێکەڵە گازێکی کارلێك نەکردوو، دەکاتە کۆی پەستانی تایبەتی ئەو گازانە، شێوە 4-14 دەفرێکی قەبارە یەك لیتری پێشان دەدات کە پڕە لە گازی ئۆکسجین لە ژێر پەستانی 0.12 atm و و لەپلەی گەرمی 0°C داو، لە دەفرێکی تردا، ژمارەیەکی یەکسانی گەردی گازی نایترۆجین کە پەستانەکەی 0.12 atm و پلەی گەرمییەکەی 0°C بوو، دوای ئەوە هەردوو نموونەی دووگازەکە، کرانە دەفرێکی تری یەك لیترییەوە ( لە پلەی گەرمیی 0°C دا، گازی ئۆکسجین و نایترۆجینەکە کارلێك ناکەن) لە کاتی پێوانی گشتە پەستانی ( پەستانی گشتی ) ناو دەفرەکەدا بینرا دەکاتە 0.24 atm لە پلەی گەرمی 0°C دا، ئەو پەستانە هەر گازێکی لە ناو تێکەڵە گازێکدا، سەربەخۆیە لە و پەستانەی گازەکانی تر دەیخەنە سەر دەفرەکە، بە پەستانی هەر گازێك لە تێکەڵە گازێکدا دەڵێن بەشە پەستان **partial pressure** ی ئەو گازە، دەقی یاسای داڵتۆن بۆ پەستانە بەشییەکان (بەشە پەستان) **Dalton's law of partial pressures** دەڵێت: **پەستانی گشتی تێکەڵە گازێك دەکاتە کۆی بەشە پەستانەکانی ئەو گازانەی تێکەڵەکە پێك دێنن،** یاساکە کارپێکراوە بێ گوێدانە جۆری ئەو گازانەی تێکەڵەکەیان لێ پێك دێت و، دەتوانرێت یاساکە بیرکاریانە بەم جۆرە دەرببڕدرێ:

$$P_T = P_1 + P_2 + P_3 \ldots +$$

کە $P_T$ ، گشتە پەستانی تێکەڵەکە و $P_1$، $P_2$، $P_3$... ، بەشە پەستانی پێکهێنەکانی تیکەڵە گازی 1، 2، 3... ، تادوایی.

دەتوانرێت لە ڕێی چەمکی بیردۆزی ئەو گەردە جووڵەیەوە لە یاسای داڵتۆن بگەین، کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تەنۆکە جووڵۆکەکانی هەرگازێکی تێکەڵە گازەکە، هەمان هەڵی پێکداکەوتنی دیواری دەفرەکەیان هەیە، لەبەر ئەوە هەر گازێکیان پەستانێکی سەربەخۆ لە هی گازەکانی تر دەخاتە سەر دیواری دەفرەکە و بۆیە پەستانی گشتی ئەنجامی کۆی ئەو پێکداکەوتنانەیە کە گازەکان دەیخەنە سەر یەکەی ڕووبەری دیوارەکە لەیەکەی کاتدا، (سەرنج بدە، کە بەهۆی سەربەخۆ جووڵانی تەنۆکەکانی گازەوە، دەتوانین یاساکانی تری گازیش ، کار پێ بکەین، سەرباری یاسای داڵتۆن، بەسەر تێکەڵە گازە کارلێکی نەکردووەکاندا.




**شێوە4-14** دوو نموونەی گازێکی ئۆکسجین و نایترۆجین کە لە دەفرێکدا تیکەڵ کراون. پەستانی گشتی دوو گازەکە لە دەفرەکەدا دەکاتە ئەنجامی کۆکردنەوەی پەستانی دوو گازەکە

## کرداری کۆکردنەوەی گازەکان بە لادانی ئاو

زۆربەی ئەو گازانەی کە لەتاقیگەدا بەرهەم دەهێنرێن، لەسەر ئاو کۆ دەکرێنەوە، گازە پەیدابووەکەی کارلێکەکە، ئاو لە دەفری گازکۆکردنەوەکەدا لا دەدات وەك لە شێوە 15-4 دا دەردەکەوێت، دەتوانێت یاسای بەشە پەستانی داڵتۆن لە دۆزینەوەی پەستانی گازە پەیدا بووەکاندا (بەم رێگەیە) بەکاربهێنرێت، چونکە گازی بەرێگەی ئاولادان کۆکراوە خاوێن نابێت، بەڵکو هەمیشە هەڵمی ئاوی لەگەڵدا دەبێت و بە هۆی ئەوەش ئەوەیەکە.




**شێوە15-4** دەتوانرێت هایدرۆجین بە لادانی ئاو کۆبکریتەوە، ئەویش بە کارلێکی زینك لەگەڵ ترشی گۆگردیکی ڕوون، گازی هایدرۆجینە پەیدابووەکە ئاوی بۆری گازە کۆکەرەوەکە لا دەدات کە بڕێك هەڵمی ئاوی تێدایە.

هەڵمینی گەردەکانی ئاوە لە ڕووی شلەکە و تێکەڵبوونی لەگەڵ گەردەکانی گازەکەدا، هەڵمی ئاویش وەك گازەکانی تر پەستانێك پەیدادەکات، کە پێی دەڵێن: بەشە پەستانی هەڵمی ئاو. بۆ زانینی پەستانی گشتی گاز و هەڵمی ئاوەکە، لە ناو دەفرەکەدا، پێویست دەکات دەفرەکە بەرزبکرێتەوە، تاکو ئاستی ئاوەکە لە دەرەو و ناوەوەی دەفرەکە دا یەکسان دەبن لە بارەشدا پەستانی گشتی ناو دەفرەکە یەکسان دەبێت بە پەستانی کەش $P_{atm}$ و،بە پێیّ یاسای بەشە پەستانی داڵتۆن:

$$P_{atm} = P_{gas} + P_{H_2O}$$

جا ئەگەر ویستت بەشە پەستانی گازەکە بدۆزیتەوەو (بەوشکی) بەبیّ هەڵمی ئاو، پەستانی کەش $P_{atm}$ لە ئامێری پەستانپێوی تاقیگەکەدا بخوێنەرەوە و پەستانی هەڵمی ئاوەکە لە و پلەی گەرمییە دیاریکراوەدا کە پەستانی گشتی دەربکە، هەڵمە پەستانی ئاو بە گۆڕانی پلەی گەرمی دەگۆڕدرێت، هەر ئەوەندەت لەسەرە، بەهای $P_{H_2O}$ لەو پلەگەرمییەی تاقیگەکەدا بخوێنیتەوە کە تاقیکردنەوەکەت تێدا جیّ بەجیّ کردووە لەسەر خشتەیەکی پێوانەیی وەك خشتەی (أ– 6) لاپەرە 191 ی.

## پرسی نموونەیی 6-4

**ئەو گازی ئۆکسجینەی لە لێکهەڵوەشانی کلۆراتی پۆتاسیۆم $KClO_3$ بە ڕێگەی ئاو لادان کۆ –کرایەوە، بەهای کەشە پەستان و پلەی گەرمی لە کاتی تاقیکردنەوەکەدا 731.0 torr و 20.0ºC بوون، بەشە پەستانی ئۆکسجینە کۆکراوەکە چەندە؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** $P_T = P_{atm} = 731.0$ torr .

$P_{H_2O} = 17.5$ torr (بەشە پەستانی هەڵمی ئاو لە پلەی گەرمی 20ºC ، لە خشتە (أ – 6) ی لاپەرە 191 ی).

$P_{atm} = P_{O_2} + P_{H_2O}$

**نەزانراو:** $P_{O_2}$ بە torr

**2 نەخشە بکێشە**

بەشە پەستانی ئۆکسجینە کۆکراوەکە، بەدەرکردنی بە های بەشە پەستانی هەڵمی ئاو لە بەهای کەشە پەستان دەدۆزێتەوە بە پێی یاسای بە شە پەستانی دالتۆن:

$$P_{O_2} = P_{atm} - P_{H_2O}$$

**3 بدۆزەرەوە**

بەهای $P_{atm}$ و $P_{H_2O}$ و دابنێ، بە های $P_{O_2}$ ت دەست دەکەوێت.

$$P_{O_2} = 731.0 \text{ torr} - 17.5 \text{ torr} = 713.5 \text{ torr}$$

**4 هەڵسەنگێنە**

بەشە پەستانی ئۆکسجین، وەك چاوەڕوان دەکرێت، لە کەشە پەستان کەمترە و، زۆر گەورە تریشە لە بەشە هەڵمە پەستانی ئاو لە هەمان پلەی گەرمیدا و وەڵامەکەیش. بۆ ڕەنووسی واتایی گونجاو نزیك خراوەتەوە.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** گازی هایدرۆجین لەسەر ئاو کۆکرایەوە، لە پلەی گەرمی 20.0°C دا، ئاستی ئاوی دەرو ناوی دەفرەکە یەکسان بوون و، بەشە پەستانی هایدرۆجین 742.5 torr بوو ، کەشەپەستان لە کاتی کۆکردنەوەی گازەکەدا چەندە؟

**2.** گازی هیلیۆم لە سەر ئاو کۆکرایەوە، لە پلەی گەرمی 25.0°C دا، بەشە پەستانی هیلیۆم چەندە، ئەگەر کەشە پەستان 750.0 mm Hg بێت.

وەڵامەکان:

**1.** 760.0 torr

**2.** 726.2 mm Hg

## پێداچوونەوەی کەرتی 3-4

**1.** ئەو پێوەندییە بیرکارییانەی کە یاسای بۆیڵ و یاسای شارڵ و یاسای گشتی گاز دەردەبڕن، بنووسە.

**2.** قەبارەی نموونەیەکی گازی هیلیۆم 200.0mL بوو لە ژێر پەستانی 0.960 atm ، ئەو پەستانە چەندە بە atm کە قەبارەکەی پێ بکرێت بە 50.0 mL لە هەمان پلەی گەرمی جێگیردا؟

**3.** قەبارەی بڕێکی گاز دەکاتە 0.750 L لە پلەی 298 K دا، لە چ پلەیەکی گەرمیی سەدیدا، قەبارەی ئەو بڕە گازە دەبێتە 0.500 L لە ژێر هەمان پەستاندا؟

**4.** قوتوپەکی کەش بۆ نخۆشکردن گازی تێدایە لە ژێر پەستانی 4.50 atm و پلەی گەرمی 20.0°C دا، ئەگەر قۆتووەکە لە شوێنێکی گەرمدا دانرا، وەك کەنارێکی لم بۆ نموونە، پەستانی گازەکان بەرز دەبێتەوە بۆ 4.80 atm ، ئەوا پلەی گەرمی کەنارەکە چەندە؟

**5.** گفتوگۆ دەربارەی واتای پلەی گەرمی سفری پەتی بکە.

**6.** بڕێ ئۆکسجین لەسەر ئاو کۆکرایەوە، کاتێك کلۆراتی پۆتاسیۆم بەگەرمکردن شی کرایەوە، قەبارەی ئۆکسجینە کۆکراوەکە 720. mL بوو لە پلەی گەرمیی 25.0°C و لە ژێر پەستانی 755 torr دا،قەبارەی ئۆکسجین لە بارە پێوانەییەکاندا STP چەندە؟

( ڕوونکردنەوەیەك: لە پێشدا بەشە پەستانی ئۆکسجین بدۆزەرەوە، بەبەکارهێنانی خشتە (أ – 6 ) ی لاپەرە 191 ی و یاسای گشتی گاز)

# پێداچوونەوەی بەندی 4

## کورتەی بەندەکە

**1-4**

- بیردۆزی گەردە جووڵەی ماددە لە لێکدانەوەی ڕەوشەکانی گاز و شل و ماددە ڕەقەکاندا بەکاردەهێنرێت.
- بیردۆزی گەردە جووڵەی گازەکان باسی نموونەیەکی گازی نموونەیی دەکات، ڕەفتاری زۆربەی گازەکان لە گازە نموونەییەکان نزیک دەبێتەوە تەنیا لە دووباری پەستانە بەرزەکان و پلەی گەرمییە نزمەکاندا نەبێت.
- گازەکان لە ژمارەیەکی زۆری تەنۆکە وردە جووڵۆك و بە پێی قەبارەکانیان و لێك دوور پێك دێن و، تێکرای جووڵە وزەی تەنۆکەکانی گاز، بەستراوە بەپلەی گەرمیی گازەکەوە.
- گازەکان دەکشێن و دەڕەون ، کەمچڕن و، پەستۆك و بڵاوە بوو دەرپەڕیون.

### زاراوەکان

بڵاوبوونەوە (101) diffusion
دەرپەڕین (101) effusion
جیرە پێکداکەوتن (99) elastic collision
گازی ڕاستە قینە (102) real gas
گازی نموونەیی (99) ideal gas
ڕژۆك (100) fluids
بیردۆزی گەردە جوولە
(99) kinetic-molecular theory

**2-4**

- مەرجەکانی پلەی گەرمی و پەستانی پێوانەیی STP بوار دەدەن کە قەبارەی گازە جیاوازەکان بەراورد بکرێن.
- چوار برە پێوراوەکە، بۆ ناساندنی گاز پێویستن، پەستان و قەبارە و پلەی گەرمی و ژمارەی گەردەکانە.
- کەشە پەستان، بە گۆڕانی بارودۆخی کەش و بەرز بوونەوە. دەگۆڕدرێت.
- بارۆمەتر پەستانی هەوا دەپێوێت، بەڵام مانۆمەتر، پەستانی گازی ناو دەفرە داخراوەکان دەپێوێت.

### زاراوەکان

پەستانپێو (106) barometer
پاسکاڵ (107) pascal
تۆر (107) torr
پلەی گەرمی و پەستانی پێوانەیی
(108) standard temperature and pressure
کەشە پەستان (107) atmospheric pressure.
ملیمەتر جیوە (107) milimeter of mercury
نیوتن (105) newton
پەستان (104) pressure

**3-4**

- یاسای بۆیڵ پەیوەندی پێچەوانەی نێوان قەبارەی گاز و پەستانەکەی دەردەخات.

$$VP = k$$

- یاسای شارڵ، پێوەندی ڕاستەوانە نێوان قەبارەی گاز و پلەی گەرمی بە کەڵڤن ڕوون دەکاتەوە.

$$V = Tk$$

- یاسای گایلۆساك، پەیوەندی ڕاستەوانەی نێوان پەستانی گاز و پلەی گەرمی بە کەڵڤن ڕوون دەکاتەوە.

$$P = Tk$$

- یاسای گشتی گازەکان،وەك بەناوەکەیدا دیارە، پەیوەندیی پێشینەکان لە یەك پێوەندی بیرکارییانەدا کۆ دەکاتەوە :

$$\frac{VP}{T} = k$$

- گاز بە پەستان کاردەکاتە دیواری دەفرەکەی و لە تێکەڵەگازێکی کارلێکنەکردوودا، پەستان یەکسان دەبێت بە کۆی بەشە پەستانی گازەکانی تیکەڵەکە.

### زاراوەکان

سفری پەتی (113) absolute zero
بەشە پەستان (119) partial pressure
یاسای بۆیڵ (110) Boyle's law
یاسای گایلۆساك (116) Gay-Lussac's law
یاسای بەشەپەستانی دالّتۆن
(119) Dalton's law of partial pressures
یاسای شارڵ (113) Charles's law
یاسای گشتی گازەکان (117) combined gas law
یاسای گازەکان (109) gas laws

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

1. ئەو بیرۆکەیە چییە کە بیردۆزی گەردە جووڵەی لەسەر دامەزرا؟
2. گازی نموونەیی چییە؟
3. پێنج گریمانە بنچینەییەکەی بیردۆزی گەردە جووڵە بژمێرە.
4. گاز و شل و ڕەق لە ڕووی ماوەی نێوان گەردەکانەوە بەراورد بکە.
5. جیرە پێکداکەوتن چییە؟
6. أ. ئەو پەیوەندییە بیرکارییەی تێکڕای جووڵە وزە و خێرای گەردەکانی گازێك چییە.
   ب. پەیوەندیی نێوان پلەی گەرمی و خێرایی جووڵە وزەی گەردەکان گازێك چییە؟
7. أ. بڵاوبوونەوە چییە؟
   ب. ئەو هۆکارە کاریگەرانەی، تێکرایی بڵاوبوونەوەی گاز بە گازێکی تردا چین؟
   ج. پەیوەندی نێوان بارستەی تەنۆکەیەکی گاز و تێکڕای بڵاوبوونەوەی بە گازێکی تردا؟
   ب. دەرپەڕین چییە؟
8. أ. بۆچی گازێکی قەتیس لە دەفرێکی داخراودا، پەستان پەیدا دەکات؟
   ب. پێوەندی نێوان ڕووبەری بەرهێزێك کەوتە و پەستانە لێ پەیدابووەکەی چییە؟
9. أ. کەشە پەستان چییە؟
   ب. بە های کەشەپەستان، لە ئاستی ڕووی دەریادا، چەندە؟ کە پێوراوە بە $N/cm^2$ .
10. أ. بۆچی ستوونی جیوەی ناو بۆرییەکی هەڵگەڕاوەی کە لە دەفرێکدا دانرا بێت، جیوەی تێدا بێت لە ئاستی ڕووی دەریادا، 760 mm بەرز دەبێتەوە؟
    ب. بەرزیی ستوونی ئاوی ناو بۆرییەکی هەڵگەڕاوەی کە لە دەفرێکدا دانرا بێت، ئاوی تێدابێت لە ئاستی ڕووی دەریادا، چەند دەبێت؟
    ج. چی دەبێتە هۆی جیاوازی نێوان بەرزیی ستوونی ئاو و جیوەکە؟
11. أ. سێ یەکە (ئەندازە) دیاری بکە، کە بۆ دەربرینی پەستان بەکاردێت.
    ب. یەك کەشە پەستان ( 1 atm ) بگۆڕە بۆ torr .
    ج. پاسکاڵ چییە؟
    د. بەسیستمی ( شێوازی ) SI ی نێودەوڵەتی، یەکەی (ئەندازەی) هاوتای کەشە پەستانێکی پێوانەیی چییە؟
12. أ. قەبارەی بڕێکی دیاریکراوی گازێك لەگەڵ پلەی گەرمی چۆن دەگۆڕدرێت، ئەگەر وا دابنێیت کە پەستان ناگۆڕدرێت؟
    ب. ئەمە، مەترسی پەیدا بوو لە فڕێدانە ناو ئاگری قوتووی کەش خۆشکەرە، چۆن لێك دەداتەوە؟
13. أ. پلەی گەرمی سەدی هاوتای سفری پەتی چەندە؟
    ب. گرنگی ئەم پلە گەرمییە بۆ گاز چییە؟
    ج. پەیوەندی نێوان پلەی گەرمی کەلڤن و تێکڕای جووڵە وزەی گەردەکانی گاز، چییە؟
14. أ. مەبەست لە بەشە پەستانی هەر گازێکی ناو تێکەڵەگازێك، ڕوون بکەرەوە.
    ب. بەشە پەستانی هەر گازێك ناو تێکەڵە گازێك، چۆن کاردەکاتە سەر پەستانی گازەکانی تر؟

## چەند پرسیێك

### گۆڕینی یەکەکانی پەستان و پلەی گەرمی

15. ئەگەر بەرگە هەوا بتوانی ستوونێکی بەرزی جیوە بەرزییەکەی 760 mm Hg بێت لە ئاستی ڕووی دەریادا ڕابگرێت، ئەو بەرزییە بە (mm) چەندە، کە بەرگە هەوا، ستوونی هەر یەکە لە مانەی خوارەوە ڕادەگرێت؟
    أ. ئاو، کە چڕیە نزیکەییەکەی 1/14 ی جیوەیە.
    ب. شلێکی وا دانراو کە چڕییەکەی 1.40 ئەوەندەی چڕی جیوە بێت.
16. هەریەکە لە لە مانەی خوارەوە بگۆڕە بە خوێندنەوی پەستان بە تۆر torr ، (بڕوانە پرسی نموونەیی 4-1 ) .
    أ. 1.25 atm
    ب. $2.48 \times 10^{-3}$ atm
17. هەریەکە لە مانەی خوارەوە بگۆڕە بۆ یەکە دیاریکراوەکە:
    أ. 125 mm Hg بۆ atm
    ب. 3.20 atm بۆ Pa
    ج. 5.38 kPa بۆ torr
18. ئەم دوو پلەی گەرمی یە سەدییە بگۆڕە بۆ کەلڤن:
    أ. 0°C
    ب. –273°C

**19.** ئەم دوو پلە گەرمییە، لە کەلڤنەوە بگۆڕە بۆ سەدی:

أ. 273 K

ب. 20. K

### یاسای بۆیڵ

**20.** یاسای بۆیڵ بە کاربهێنە، بۆ دۆزینەوەی بەهای نەزانراو ، لە هەر یەکەی ئەمانەی خوارەوەدا (بڕوانە پرسی نموونەیی 4-2 ):

أ. $P_1$ = 350. torr ،$V_1$ = 200. mL ،
$P_2$ = 700 torr ، $V_2$ = ؟

ب. $P_1$ = 0.75 atm ،$V_2$ = 435 mL ،
$P_2$ = 0.48 atm ، $V_1$ = ؟

**21.** ئەو پەستانەی کاردەکاتە 240. mL هایدرۆجین، زیادی کرد لە 0.428 atm وە بوو بە 0.724 atm ، قەبارەی کۆتایی نموونەکە چەند دەبێت، ئەگەر پلەی گەرمی جێگیربێت؟

**22.** شووشەیەك 155 $cm^3$ هایدرۆجینی تێدایە، لە ژێر پەستانی 22.5 kPa دا، ئەو پەستانی کە پێویستە قەبارەی گازەکە بگەێنێتە 90.0 $cm^3$ چەندە، ئەگەر وا دابنێیت کە پلەی گەرمی جێگیرە.

**23.** گازێك، قەبارەکەی 450.0 mL ، قەبارەی گازەکە دەبێ بە چەند، ئەگەر پلەی گەرمی جێگیر بوو، ئەگەر پەستانەکەی:

أ. بوو بە دوو ئەوەندەی پەستانە سەرەتاییەکە؟ ( $P_2$ بە پێی $P_1$ بگۆڕەرەوە)

ب. چواریەکی پەستان سەرەتاییەکەی؟

### یاسای شارڵ

**24.** یاسای شارڵ بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی بەها نەزانراوەکانی ئەمانەی خوارەوە (بڕوانە پرسی نموونەیی 4-3):

أ. $V_1$ = 80.0 mL ،$T_1$ = 27°C ،$T_2$ = 77°C ،$V_2$ = ؟

ب. $V_1$ = 125 L ،$V_2$ = 85.0 L ،$T_2$ = 127°C ،$T_1$ = ؟

**25.** نمونەیەك هەوا، قەبارەکەی 140.0 mL بوو، لەپلەی گەرمی 67C° دا، لە چ پلەیەکی گەرمیدا، قەبارەکەی دەبێتە 50.0 mL ، ئەگەر پەستان جێگیر بوو؟

**26.** گازێك، قەبارەکەی 275 mL بوو، لە پلەی گەرمی پێوانەییدا، پلەی گەرمییەکەی بەرزکرایەوە بۆ 130.°C ، قەبارە نوێیەکەی چەند دەبێت، ئەگەر پەستان جێگیربێت؟

### یاسای گایلۆساك

**27.** نموونەیەکی گازی هایدرۆجین، پەستانەکەی 0.239 atm بوو لە پلەی گەرمی 47°C دا، گەرم کرا تا پلەی گەرمی 77°C ، پەستانە نوێیەکەی چەند بێت، ئەگەر قەبارە جێگیر بێت؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 4-4 )

**28.** پەستانی گازێك کە لە پلەی گەرمی −73°C دا بوو، بوو بە دوو ئەوەندە، بەڵام قەبارەکەی جێگیربوو، پلەی گەرمی کۆتایی بە پلەی سەدی، چەند دەبێت؟

### یاسای گشتی گازەکان

**29.** نموونەیەکی گاز لە پلەی گەرمی 47°C و لە ژێر پەستانی 1.03 atm دا قەبارەکەی 2.20 L ، ئایا هەمان نموونە، لە 107°C و لە ژێر پەستانی 0.789 atm دا، قەبارەکەی چەند دەبێت ؟(بڕوانە پرسی نموونەیی 4-5 ) .

**30.** نموونەیەکی هەوا کە قەبارەکەی 350. mL بوو لە 35°C و لە ژێر پەستانی 550. torr دا، کۆکرایەوە، ئایا پەستانی هەوای کارتێکردوو چەند دەبێت، ئەگەر وازی لێ هێنرا کە بکشێت و قەبارەکەی ببێتە 425 mL دا لە 57°C؟

**31.** گازێك قەبارەکەی 1.75 L لە −23°C و، لەژێر پەستانی 150 kPa دا، لە چ پلەیەکی گەرمیدا، قەبارەی گازەکە دەبێتە 1.30 L ، کاتێك پەستانەکەی 210. kPa بێت؟

**32.** قەبارەی نموونەیەکی ئۆکسجین لە پلەی گەرمی 40.°C دا 820. mL بوو، ئەگەر دوای ئەوە قەبارەی نموونەکە 1250 mL بوو لە 60.°C و، لە ژێر پەستانی 1.40 atm دا ، ئایا پەستانە سەرەتاییەکەی چەند بووە؟

**33.** باڵۆنیکی چاودێری کەش 250. L هیلیۆمی تیدابوو لە 22°C و لە ژێر پەستانی 740. mm Hg دا، ئەگەر قەبارەی باڵۆنەکە بە پێی بارودۆخی دەرەکی بگۆڕدرێت، ئایا قەبارەکەی لەو بەرزییەدا کە پلەی گەرمی −52°C بێت و پەستان 0.750 atm چەند دەبێت؟

**34.** باڵۆنەکەی پرسی پێشوو، کاتێك قەبارەکی دەبێتە 400 L دەتەقێت، لە چ پلەیەکی سەدیدا، باڵۆنەکە دەتەقێت، ئەگەر پەستانەکەی 0.475 atm بێت؟

**35.** تێکرای هەناسەدانی مرۆڤی ئاسایی بۆ هەر جارە هەناسەیەك نزیك پازدە جار لەدەقیقەیەکداو، تێکرای قەبارەی هەوا بۆ هەر جارێك، 505 $cm^3$ لە پلەی گەرمی 20.°C و لە ژێر پەستانی 9.95 × $10^4$ Pa دا، قەبارەی ئەو هەوایەی مرۆڤێك لە ڕۆژێکداو لە باری STP دا هەناسەی پێ دەدات چەند دەبێت؟ با وەڵامەکەت بە مەترسێجا بێت.

### یاسای بەشە پەستانی دالتۆن

**.36** سێ پێکهێنە سەرەکییەکەی هەوا ئەمانەن: دوانۆکسیدی کاربۆن، نایترۆجین و ئۆکسجین، لە تێکەڵێکی ئەو سێ گازەدا کە لە ژێر پەستانی 1 atm دان، بەشە پەستانی هەریەکەی دوانۆکسیدی کاربۆن و نایترۆجین بەم جۆرە بوو: $P_{CO_2} = 0.285$ torr و $P_{N_2} = 593.525$ torr ، بەشە پەستانی ئۆکسجین چەند دەبێت؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 4-6 ).

**.37** بەهای بەشە پەستانی ئۆکسجین کە بە ڕێگەی ئاو لادان کۆکراوەتەوە دیاری بکە، ئەگەر پلەی گەرمی ئاو 20.0°C و گشتە پەستانی گازەکانی ناو دەفرەکە 730.0 torr بووبێت.

**.38** نموونەی گازێك لە دەفرێکی قەبارە 175 mL داو لەسەر ئاو و لە پلەی گەرمی 15°C و لە ژێر پەستانی 752.0 torr دا کۆکرایەوە، قەبارەی گازەکە لە ژێر پەستانی 770.0 torr و پلەی گەرمی 15°C دا چەندە؟

**.39** 120.0 mL ئەرگۆن لەسەر ئاو کۆکرایەوە، لە پلەی گەرمیی 25°C و لە ژێر پەستانی 780.0 torr دا، قەبارەی ئەرگۆنی وشك (بێ هەڵمی ئاو) لەبارە پێوانەییەکاندا ( STP ) چەندە؟

## پێداچونەوەی هەمەجۆر

**.40** مندالێك میزڵدانێکی (باڵۆنێکی) پڕلە 2.30 L گازی هیلیۆمی لە مامۆستاکەی وەرگرت لە قوتابخانە، ئەگەر پلەی گەرمی قوتابخانەکە 311 K بوو، قەبارەی باڵۆنەکە لە ماڵە هەوا گونجێنراوەکەیداو لە پلەی 295 K دا چەند دەبێت، ئەگەر وا دابنێین پەستان جێگیرە؟

**.41** نموونەیەکی گازی ئەرگۆن، 295 mL داگیر دەکات لە پلەی گەرمی 36°C ، قەبارەی گازەکە، لە پلەی گەرمی 55°C دا چەند دەبێت، ئەگەر پەستان جێگیربێت؟

**.42** نموونەیەکی گازی دوانۆکسیدی کاربۆن 638 mL بوو لە ژێر پەستانی 0.893 atm و پلەی گەرمی 12°C ، پەستانی گازەکە چەند دەبێت کاتێك قەبارەکەی دەبێتە 881 mL و پلەی گەرمییەکەی دەبێتە 18°C ؟

**.43** گازێك، پلەی گەرمییەکەی 84°C و پەستانەکەی 0.503 atm ، پلەی گەرمی گازەکە دەبێتە چەند، ئەگەر پەستانەکەی 1.2 atm بێ و، وا دابنێین قەبارەی دەفرەکە ناگۆڕدرێت؟

**.44** باڵۆنێکی چاودێری لە سەر ڕووی زەوی، قەبارەکەی 4.00 L بوو لە ژێر پەستانی 755 mm Hg و پلەی گەرمی 304 K دا، ئەگەر باڵۆنەکە بەرەڵاکراو قەبارەکەی بوو بە 4.08 L ، لە ژێر پەستانی 728 mm Hg دا، پلەی گەرمییەکەی چەند دەبێت؟

**.45** گازێك، پەستانەکەی 4.62 atm و کاتی قەبارەکەی 2.33 L بێت، ئەوا پەستانەکەی دەبێتە چەند، کاتێ قەبارەکەی دەبێتە 1.03 L ، ئەگەر وا دابنێین پلەی گەرمی جێگیرە؟ پەستانی کۆتایی بە torr دەربڕە.

**.46** لە وێستگەیەکی ژێر زەویدا کە قووڵییەکەی 200. m لە ژێر ڕووی دەریاوە بوو، کارمەندان لە ناوەندێکی پەستێوراودا دەژین، ژمارەی لیترەکانی گاز لە بارە پێوانەییەکاندا(STP) چەند دەبێت کە پێویستە هەڵمژرێت بۆ ڕووی ئاوەکە بۆ پڕکردنی وێستگەکە بە $2.00 \times 10^7$ L لەو گازە، لە ژێر پەستانی 20.0 atm دا، ئەگەر پلەی گەرمی بە جێگیر دابنێین؟

## بیرکردنەوەی ڕەخنەسازانە

**.47** **بەکارهێنانی چەند نموونەیەك:**

أ. بۆچی شێوە 4-10 ی لاپەرە 110 پەیوەندییەکی پێچەوانە پێشان دەدات؟

ب. زانیارییە وێنە کێشراوەکانی شێوە 4-12 ی لاپەرە 110 پێوەندییەکی ڕاستەوانە پێشان دەدات؟

**.48** **نزیك خستنەوەی بیرۆکەکان:** هۆی یەکسانی جووڵە وزەی گازە جیاوازەکانی تێکەڵێك ڕوون بکەرەوە، هەرچەندێك بارستەی تەنۆکەکانی ئەم گازانە لەگەڵ یەکتردا جیاوازبن.

**.49** **بۆ دەرکەوتنی ڕێنماییکار** : ئەگەر هەموو گازەکان لە جۆرەها باری پلەی گەرمی و پەستاندا، وەك گازی نموونەیی ڕەفتار بکەن، مادەد دۆخی شل و ڕەقی نابێت، ئەمە چۆن لێك دەدەیتەوە؟

**50. لێکدانەوەی وێنەیەکی ڕوونکەرەوە:** ئەو بۆرییە گۆچانشیوە لە پیتی $V_{gas}$ چووەی وێنەکە، کە سەری ژووروویی کراوە و سەرەکەی تری داخراوە و گازێکی تێدایە و بە $V_{gas}$ پێشان دراوە، ئەگەر $h = 60$ mm Hg ،ئەو پەستانەی گازە قەتیسەکە کاری پێ دەکات چەندە؟




## توێژینەوەو نووسین

**51.** ڕاپۆرتێك ئامادە بکە، دەربارەی گەشەکردنی ژێراوگەڕی نوێ، وردەکاری ئەو تەکنیکەی تێدابێت وا لە ژێراوگەڕ دەکات بەرگەی ئەو پەستانە زۆرانەی قووڵاییەکان بگرێت، هەروەها لە بارەی ئەو ئامێرانەوە بنووسە کە بۆ دەستە بەرکردنی بڕی پێویستی ئۆکسجین بۆ کارمەندانی ژێراوگەڕەکە، بەکاربهێنرێن.

**52.** ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەو هەولانەی کە دراون بۆ گەیشتنە سفری پەتی و، ئەو ڕەوشە جیاکارانەی کە ماددەکان لەو پلەیەدا دەری دەخەن بنووسە.

## برییە هەڵسەنگاندن

**53.** پێویستە پەستانی هەوای تایەی ئۆتۆمبیل، هەمیشە بەرێك و پێکی بپشکنرێ و چاودێری بکرێت وەك بێوەیی دەیخوازێت و، بۆ نەرووشان و داخورانی نا یەکسانی ڕووی دەرەوەی تایەکان، ئەو ئەندازانەی پێوانی، کە لە پەستان پێوی باوی تایەدا بەکاردێن بدۆزەرەوە و پێوەندی نێوان پەستانی هەوای ناو تایەکەو کەشە پەستان دیاری بکە.

بەندی 5

# گەردە پێکهاتنی گازەکان



لێکۆڵینەوەی گازەکان، دەبێتە هۆی دارشتنی ئەو یاسا و بنەمایانەی، کە بەردی بناغەی کیمیای نویٚ پێك دێنن

كەرتی 5-1

# پێوەندییەکانی قەبارە–بارستەی گازەکان

## نیشانەکانی ڕایکاری

- باسی دەقی یاسای قەبارە یەکگرتووەکان دەکات.
- باسی دەقی یاسای ئاڤۆگادرۆ دەکات.
- قەبارەی مۆڵی پێوانەیی گاز، پێدەناسێت و بەکاری دێنێت بۆ دۆزینەوەی بارستە و قەبارەی گازەکان.
- قەبارەی مۆڵی پێوانەیی گاز، پێدەناسێت و بەکاری دێنێت بۆ دۆزینەوەی بارستە و قەبارەی گازەکان.

لەم کەرتەدا، پێوەندییەکانی نێوان قەبارەی ئەو گازانەی لەگەڵ یەکتردا کارلێك دەکەن، هەروەك لە و پێوەندییانە دەکۆڵێتەوە کە قەبارە و چڕی و مۆڵە بارستە (بارستەی مۆڵی ) پێکەوە دەبەستن.

## پێوانی قەبارەی گازە کارلێککردووەکان بەراوردکردنیان

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، جۆزێف گایلۆساك ی کیمیاگەری فەرەنسایی، لە پێوەندی نێوان قەبارەی گازە بەشدارەکانی کارلێکی نێوان هایدرۆجین و ئۆکسجینی کۆڵیەوە و سەرنجی دا کە لە پلەیەکی گەرمی نەگۆڕ و لە ژێر پەستانێکی نەگۆڕدا، دەشێ دوو لیتر (2 L) هایدرۆجین و یەك لیتر (1 L) ئۆکسجین کارلێك بکەن و دوو لیتر (2 L) هەڵمی ئاو پێك بهێنن:

گازی هایدرۆجین + گازی ئۆکسجین ← هەڵمی ئاو

| 2 L | 1 L | 2 L |
|---|---|---|
| دوو قەبارە | یەك قەبارە | دوو قەبارە |

بەواتایەکی تر، ئەم کارلێکە، پێوەندییەکی دیاریکراو و سادە، لە نێوان دوو قەبارە کارلێککردووەکان و قەبارە پەیدابووەکان ڕوون دەکاتەوە کە بەم جۆرەیە: 2:1:2 دوو قەبارە هایدرۆجین، لەگەڵ قەبارەیەکی ئۆکسجین کارلێك دەکەن و دوو قەبارە هەڵمی ئاو پێك دێنن و ئەم پێوەندی 2:1:2 ە، قەبارەکان و ئەندازەی پێوان هەر چییەك بێت، کاری پێ دەکرێت بۆ نموونە: 2 mL و 1 mL و 2 mL، 600 L و 300 L و600 L، 400 $cm^3$ و 200 $c^3$ و400 $cm^3$ .

گایلۆساك، سەرەنجی دا، لە کارلێکی گازی تریشدا، وەك کارلێکی گازی هایدرۆجین لەگەڵ گازی کلۆر، هەر بە ڕێژەی دیاریکراو وسادەی نێوان قەبارە کارلێك دەکەن:

گازی هایدرۆجین + گازی کلۆر ← گازی کلۆریدی هایدرۆجین

| 1L | 1L | 2L |
|---|---|---|
| قەبارەیەك | قەبارەیەك | دوو قەبارە |

ساڵی 1808 ، گایلۆساك ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی بە دەربڕینێك کورت کردەوە، کە ئەمڕۆ بە یاسای قەبارە یەکگرتووەکانی گاز **Gay Lussac's law of combining volumes of gases** ناسرێت و ئەم یاسایە بەم جۆرە دەردەبڕدرێت: **دەتوانرێت قەبارەی گازە کارلێکردوو بەرهەمهاتووەکانی هەر کارلێککردنێکی کیمیایی، بە ڕێژەی ژمارەیی سادە دەربڕدرێت، لە کاتی جێگیری پلەی گەرمی و پەستاندا.**

## یاسای ئەڤۆگادرۆ

لە ساڵی 1811دا، ئەڤۆگادرۆی زانا، ڕێگایەکی پێشکەش کرد بۆ ڕاڤەکردنی ڕێژە ژمارەییە سادەکانی گایلۆساك، کە بە یاسای ئەڤۆگادرۆ ناسرا **Avogadro's law** و دەقەکەی ئەمەیە: **قەبارە یەکسانەکانی گازە جیاوازەکان، هەمان ژمارە گەردیان تێدایە، لەهەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا**، و شێوە 5-1 ، نموونەیەك پێشان دەدات کە یاسای ئەڤۆگادرۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەمەیش واتە، لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا، قەبارەی هەر گازێك ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ گۆڕانی ژمارەی گەردەکانیدا.




گەردی دووانە
ئۆکسیدی کاربۆن
1 mol لە $CO_2$ لە ژێر
مەرجی STP کە
قەبارەی 22.4 L
دەگرێتەوە

**شێوە 1-5** لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا، باڵۆنە قەبارە یەکسانەکان، هەمان ژمارە گەردیان تێدایە، جۆری ئەو گازەی کە پڕی کردووە هەر چییەك بێت.

بەپێی یاسای ئەڤۆگادرۆ، وەك لە شێوەی 5-2 دا ڕوون کراوەتەوە، قەبارەی گازی هایدرۆجین و کلۆر کە کارلێك دەکەن و کلۆریدی هایدرۆجین پێك دێنن، یەکسان دەبن و هەمان ژمارە گەردیان تێدایە و ئەمەیش ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەم هاوکێشە هاوسەنگەی خوارەوەی کارلێکی هایدرۆجین لەگەڵ کلۆر:

$$H_2(g) + Cl_2(g) \rightarrow 2HCl(g)$$

| $H_2(g)$ | $Cl_2(g)$ | $2HCl(g)$ |
|---|---|---|
| قەبارەیەك | قەبارەیەك | دوو قەبارە |
| گەردێك | گەردێك | دوو گەرد |

گازی هایدرۆجین + گازی کلۆر ← گازی کلۆریدی هایدرۆجین

| گازی هایدرۆجین | گازی کلۆر | گازی کلۆریدی هایدرۆجین |
|---|---|---|
| قەبارەیەك | قەبارەیەك | دوو قەبارە |
| گەردێك | گەردێك | دوو گەرد |

**شێوە 2-5** گەردەکانی هایدرۆجین لەگەڵ گەردەکانی کلۆر یەك دەگرن، بە قەبارە ڕێژەی 1:1 ، تاکو دوو قەبارە کلۆریدی هایدرۆجین پێك بێت.

ڕێنمایی هۆشی ئەڤۆگادرۆ، بواری کارپێکردنی یاساکەی دەدات لە کارلێکی قەبارەکان لە کارلێکی هایدرۆجین و ئۆکسجین کە هەڵمی ئاویان لێ پەیدا دەبێت.

بەپێی یاسای ئەڤۆگادرۆ، قەبارەی گاز، ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ بڕی گازەکەدا، بەجێگیری پلەی گەرمی و پەستان، سەرەنج بدە کە هاوکێشەی ئەو پێوەندییە بەم جۆرەیە:

$$V = kn$$

کە $n$ ژمارەی مۆڵەکانی گازە (mol) و $k$ یش جێگیرێکە و وەك لە خوارەوە دەردەکەوێت، هاوکۆلکەکانی ئەو کارلێکە کیمیاییەی گازە بەشدارەکانی تێدایە، ڕێژە ژمارەی گەردەکان و مۆڵەکان و ڕێژەی قەبارەکانیش پیشان دەدات:

| $2H_2(g)$ | + | $O_2(g)$ | $\rightarrow$ | $2H_2O(g)$ |
|---|---|---|---|---|
| دوو گەرد | | گەردێك | | دوو گەرد |
| 2 mol | | 1 mol | | 2 mol |
| دوو قەبارە | | قەبارەیەك | | دوو قەبارە |

## مۆڵە قەبارەی گازەکان

لەبیرت نەچێت کە مۆڵێکی ماددەیەکی گەردی، ژمارەی ئەو گەردانەی کە تێیدایەتی، یەکسانە بە ژمارەی ئەڤۆگادرۆ ($6.022 \times 10^{23}$)، مۆڵێك ئۆکسجین $O_2$، $6.022 \times 10^{23}$ گەرد ئۆکسجینی دوانە گەردیلەی تێدایەو، بارستەکەی دەکاتە: 31.9988 g و مۆڵێك هایدرۆجین، هەمان ژمارەی گەردی هایدرۆجینی دوانە گەردیلەی تێدایە، بەڵام بارستەکەی دەکاتە: 2.01588 g، هەروەها مۆڵێك هیلیۆم، کە گازێکی یەك گەدیلەییە، هەمان ژمارە گەردیلەی هیلیۆمی تێدایە و بارستەکەی دەکاتە: 4.002602 g.

بە پێی یاسای ئەڤۆگادرۆ، مۆڵێکی هەر گازێك، هەمان ئەو قەبارەیە داگیردەکات کە هەر گازێکی تر داگیری دەکات، لە ژێر هەمان باری پەستان و پلەی گەرمییدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بارستاییەکانیان جیاوازن، **جا بەو قەبارەیەی مۆڵێکی گازێك لەبارە پێوانەییەکاندا *STP* هەیەتی دەڵێن قەبارەی مۆڵی (مۆڵە قەبارەی) پێوانەیی گاز standard molar volume of a gas** و دەکاتە *22.41410 L*. و هەموو ئەو ژمارکارییانەی لەم کتێبەدا هاتوون، قەبارەی مۆڵی پێوانەییان تێدا بەکاردێت (واتە 22.4 L).

شێوە 5-3، دەری دەخات کە 22.4 L هەر گازێك هەمان ژمارە گەردی تێدایە، بەڵام بارستەی ئەو قەبارەیە، لە گازێکەوە بۆ گازێکی تر جیاوازە و بارستەی هەر گازە یەکسانە بە مۆڵە بارستە (بارستە مۆڵی) ی گازەکە.




**شێوە 3-5** بڕی مۆڵێکی دوو گازی جیاواز کە هەریەکە یان لە بارە پێوانەییەکاندا STP، 22.4 L داگیر دەکات و، هەمان ژمارە گەردیان تێدایە، بەڵام بارستەیان جیاوازە

**پرسی نموونەیی 1-5**

**کارلێکی کیمیایی 0.0680 mol گازی ئۆکسجین بەرهەم دێنێت، ئەو قەبارەیە بە لیتر کە نموونەیەکی ئەم گازە داگیری دەکات لە بارە پێوانەییەکاندا چەندە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** ژمارەی مۆڵەکانی $O_2$ = 0.0680 mol

**نەزانراو:** قەبارەی $O_2$ بە لیتر لە بارە پێوانەییەکاندا STP

**2 نەخشە بکێشە**

ژمارەی مۆڵەکانی $O_2$ ← قەبارەی $O_2$ بە لیتر لەبارە پێوانەییەکاندا STP

دەتوانین مۆڵە قەبارەی پێوانەیی بەکاربهێنن، بۆ دۆزینەوەی قەبارەی مۆڵە بڕە زانراوەکەی گاز لە STP دا.

$$\text{mol } O_2 \times \frac{22.4\ \text{L}}{\text{mol}} = \text{قەبارەی } O_2 \text{ بەلیتر}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$0.0680\ \text{mol } O_2 \times \frac{22.4\ \text{L}}{\text{mol}} = 1.52\ \text{L } O_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

یەکەکان کورت کراونەتەوە، بۆ ئەوەی ئەنجام بە لیتر بێت، بەڵام ئەنجامە دۆزراوەکە، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بەسێ ڕەنووسی واتایی دەربڕدراوە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**1.** قەبارەی 7.08 mol گازی نایترۆجین لە بارە پێوانەییەکاندا STP چەندە؟

**2.** نموونەیەکی گازی هایدرۆجین قەبارەی 14.1 L داگیردەکات لە STP دا، ژمارەی مۆڵەکانی ئەو گازە چەندە؟

**3.** نموونەیەکی گازی نیۆن، قەبارەی $550.\ cm^3$ داگیر دەکات لە STP دا، ژمارەی مۆڵەکانی گازی نیۆنەکە چەندە؟

وەڵامەکان:

1. $159\ L\ N_2$
2. $0.629\ mol\ H_2$
3. $0.0246\ mol\ Ne$

**پرسی نموونەیی 2-5**

**لە ئەنجامی کارلێکێکی کیمیاییدا، 98.0 mL گازی دوانۆکسیدی گۆگرد $SO_2$ پێك دێت لە ب . پ دا STP ، بارستەی گازە پەیدابووەکە چەند گرامە؟**

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** قەبارەی $SO_2$ = 98.0 mL لە ب . پ دا STP .

**نەزانراو:** بارستەی $SO_2$ بە گرام.

**2 نەخشە بکێشە**

لیترەکانی $SO_2$ لە ب . پ STP دا ← مۆڵەکانی $SO_2$ ← بارستەی $SO_2$ بە گرام.

دەتوانرێت مۆڵە قەبارەی پێوانەیی بەکاربهێنرێت، بۆ دۆزینەوەی قەبارەی بڕە مۆڵییە زانراوەکەی گاز لە ب . پ STP دا .

$$\text{mL} \times \frac{1\ \text{L}}{1000\ \text{mL}} \times \frac{1\ \text{mol } SO_2}{22.4\ \text{L}} \times \frac{\text{g } SO_2}{\text{mol } SO_2} = \text{g } SO_2$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$98.0\ \text{mL} \times \frac{1\ \text{L}}{1000\ \text{mL}} \times \frac{\text{mol SO}_2}{22.4\ \text{L}} \times \frac{64.07\ \text{g SO}_2}{\text{mol SO}_2} = 0.280\ \text{g SO}_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

ئەنجامی بەسێ واتا ڕەنووسی ڕێك و پێك دراوەو، یەکەکان کورت کراونەتەوە بۆ ئەوەی وەڵامەکان تەنیا بەگرام بێت.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**.1** بارستەی $1.33 \times 10^4$ mL گازی ئۆکسجین لە ب . پ STP دا بەگرام چەندە؟

**.2** قەبارەی 77.0 g گازی دوانۆکسیدی نایترۆجین لە ب . پ STP دا چەندە؟

**.3** 3 L کلۆر بە کارلێکی کیمیایی لە ب . پ STP دا پێك دێت، بارستەی ئەم گازە چەندە؟

وەڵامەکان:

**.1** $19.0\ g\ O_2$

**.2** $37.5\ L\ NO_2$

**.3** $9\ g\ Cl_2$

## پێداچوونەوەی کەرتی 1-5

**.1** دەقی یاسای گایلۆساك دەربارەی قەبارەی گازە یەکگرتووەکان بڵێ.

**.2** دەقی یاسای ئەڤۆگادرۆ بڵێ.

**.3** مۆڵە قەبارە (قەبارەی مۆڵی) پێ بناسە.

**.4** چەند مۆڵ گازی ئۆکسجین لە 135 L ئۆکسجیندا چەندە لە STP دا؟

**.5** ئەو قەبارە بە ( mL ) ی 0.0035 mol میثان $CH_4$ ، لە STP دا داگیری دەکات چەندە؟

# هەڵکشان بۆ بۆشایی

نووسینی مامۆستا کارم غنێم، سەرۆکی کۆمەڵەی زانستیی قورئان لە قاهیرە.

خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ

لەم ئایەتە قورئانییەدا « 125/ سوورەتی ئەنعام» فەرموودەیەکی زانستی تێدایە، لەم دواییانەدا ڕاستییەکەی ڕوون بۆتەوە، ئەویش نزمبوونەوەی پەستانی هەوایە، بە هەڵکشان بە چینەکانی کەشدا، کە دەبێتە هۆی تەنگە نەفەسی سنگی هەڵکشاو، تا دەگاتە پلەی خنکان، بە –وێنە ئایەتەکە لێکچواندنێکی بارێکی واتاییە، بەم بارە هەستییەی لەم سەدانەی دواییدا زانرا.

مرۆڤ گەیشتە ئەوەی کە تا لە ئاستی ڕووی دەریا بەرز بێتەوە کێشی هەواکەم دەکات، لە ئەنجامی کەمبوونەوەی ئەستووراییی بەرگە هەوا لە لایەکەوە و کەلێن تێکەوتنی هەوا لە ئەنجامی کەمبوونەوەی چڕییەکەیەوە، لە لایەکی ترەوە و، ئەمیش بە جیاوازیی پلەی گەرمی کاری تێ دەکرێت، مرۆڤ ئەم دیاردەیەی نە دەزانی تا سەدەی نۆزدەیەم 1804 م ، کاتێك بە باڵۆن بۆ یەکەم جار هەڵکشا بۆ چینەکانی کەش و، وای دەزانی کە هەوا تا ناکۆتا بەردەوام دەبێت.

لێکدانەوەی زانستی دیاردەی تەنگەنەفەسی گۆڕدران لە کاتی هەڵکشان بە چیینە باڵاکانی کەشدا ئێستا زانراوە، پاش زنجیرەیەکی دوور و درێژی ئەو تاقیکردنەوانەی زانایان جێبەجێیان کرد بۆ زانینی پێکهێنەکانی هەوا و ڕەوشتەکانی، بە تایبەتی پاشان گەشەکردنی ئامێرەکانی ڕوانین و شیکاری کە بۆ بەرزاییەکەمەکان یان بە مووشەك هەڵگیراو و هەیڤە دەستکردەکان کە بۆ لێکۆڵینەوەی چینە بەرزەکانی کەش بەکاردەهێنرێن و، ئەو پێوانانە دەریان خستووە، کە بەرگە هەوا (گاز) ی زەوی پێکهاتن چونیەکە بە هۆی ئەو جووڵەیەی هەوا کە دەبێتە هۆی ڕوودانی تێکەڵکردنە سەرەکی و ئاسۆییەکان و (بەتایبەتی لە بەرزاییە کەمەکاندا) ڕێژەی پێکهێنانی هەوا بەنزیکە جێگیری دەمێنێتەوە تا بەرزایی 80 کیلۆ مەتر.سەلمێنراوە کە کەشە پەستان بە، بەرزبوونەوە لە ڕووی زەوییەوە، کەم دەکات، بە جۆرێك دەبێتە نزیکەی نیوەی بەهاکەی هەرچەند ماوەی 5 km لە ڕووی دەریا بەرز ببینەوە، بەشێوەیەکی ڕاستەوانە، بەوپێە، پەستانی هەوا (کەشەپەستان) کەم دەکات و دەگاتە چواریەکی بەها بنچینەییەکەی، لە بەرزایی 10 km دا و دەگاتە 1% ی بەها بنچیینەکەی لە بەرزایی 30 km دا. هەروەك چڕیی هەوایش لەگەڵ بەرزبوونەوەدا زۆر کەم دەکات تا لە نەمان نزیك دەبێتەوە، لە بەرزایی نزیکەی 1000 km لە ڕووی زەوییەوە لە لایەکی ترەوە، تا بەرەو ژوور بێینەوە ئۆکسجین لە هەوا دا کەم دەکات، بە هۆی کەمبوونەوەی بڕەکانی هەواوە، بۆ نموونە ئەگەر ئۆکسجین لە نزیکی ڕووی زەوییەوە 200 یەك بوو، ئەوا لە بەرزایی 10 km دا، زۆرترکەم دەکات و بەهاکەی دەبێتە تەنیا 40 یەکە، دواتر لە بەرزایی 20 km دا بەهاکەی دەبێتە تەنیا 10 دواتر لە بەرزایی 30 km دا ، بەهاکەی دەبێتە تەنیا دوودانە. بەو جۆرە دەشێ سنگی مرۆڤ تەنگ بێت و ئەگەر 10 km بەرزتر بووەوە، دەخنکێت ئەگەر لە ڕۆژێکی هەوا گونجێنراودا خۆی نەپاراستبێت، بەهۆی کەمی کەشە پەستانەوەو کەمی گازی ئۆکسجینی بۆ



هەناسەدان پێویست و بەبێ ئەو ژوورە گونجێنراوە، مرۆڤ تووشی تەمەڵی و کەودەنی دەبێت و دەچێتە بارێکی سڕی و شت بیرچوونەوەو دەکەوێتە بەر زیانەکانی ئەو تیشکەی لە بەرگە هەواوە دەکەوێتە سەری و دووچاری باری ناهاوسەنگی دەبێت «دیسپارێزم» و سك و و بۆشاییەکانی هەڵدەئاوسێن و پێستەکەی خوێنی لێدێت وهەناسەی دەوەستێ و مێشکی وێران دەبێت و دەچێتە بێهۆشی مردنەوە.

پزیشکیزانی بۆشایی (طب الفضاء) سەلماندوویەتی، ئەوەی بە چینە بەرزەکانی کەشدا هەڵکشاودا بەبێ ئەوەی خۆی لە ژوورێکی هەوا گونجێنراودا بپارێزێت، تووشی شەکەتیی توندو ئاودەڵاندنی سی و ئۆدیمای مێشك و پشێوی ئاڕاستەی جووڵانی لە بۆشاییدا و سووربینی یان ڕەشبینی کە باڵاترین تێکچوونی پشێوی بینایییە، کە چاو هەیە فرمانیانە دروستە، بەڵام بێ ڕووناکییە، چونکە لە چینە باڵاکانی کەشدا، تەنیا تاریکی و نووتەکی هەیەو، ئەوەی بەو چینانەدا هەڵدەکشێت، وەك جادووی لێ کرابێ، ناتوانێ ببینێ..!

## کەرتی 2-5

# یاسای گازی نموونەیی

### نیشانەکانی ڕاپیکاری

- لە دەقی یاسای گازی نموونەیی دەدوێت.
- جێگیری گازی نموونەیی وەردەگرێت و ئەندازەکانی ( یەکەکانی ) جیادەکاتەوە.
- پەستان یان قەبارە یان پلەی گەرمی یان بڕی گاز دەدۆزینەوە کاتێك سیانیان ( لەو چوارە ) زانراو بێت، بە بەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی.
- مۆڵە بارستە، یان چری گاز، بەبەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی دەدۆزێتەوە.
- یاسای گازی نموونەیی دەگۆڕدرێت بۆ یاسای بۆیڵ، یا شارڵ، یان ئەڤۆگادرۆو باسی ئەو مەرجانە دەکات کە هەر یاسایەکیانی پێ جیبەجێ دەکرێت.

لەکەرتی 4-3 ەوە فێری ئەوە بوویت، کە بۆ باسی نموونەیەکی گاز، پێویستیت بە سێ بڕ دەبێت، پەستان و قەبارە و پلەی گەرمی و دەشێ نموونە گازەکە، زۆرتر جیا بکرێتەوە بە بەکارهێنانی بڕی چوارەم کە ژمارەی مۆڵەکانە، ژمارەی یان ئەو مۆڵانەی کە هەن، یەکبیینە کاردەکەنە بڕێك لە سێ بڕەکەی تر، بەلایەنی کەمەوە ڕێژەی پێکداکەوتنی گەردەکان بەیەکەیەکی ڕووبەردا، بەستراوە بە ژمارەی ئەو گەردانەوە کە هەن، جا ئەگەر ژمارەی گەردەکان لە قەبارە و پلەی گەرمی جێگیردا زۆر بوون، ڕێژەی پێکداکەوتن زۆرتر دەبێت و، ئەمەیش دەبێتە هۆی زۆربوونی پەستان وەك لە شێوە 5-4 (أ) دا دەردەکەوێت ، بەلام، ئەگەر پەستان و پلەی گەرمی جێگیر بوون و ژمارەی گەردەکان زیادی کرد، چی ڕوودەدات؟، بەپێی یاسای ئەڤۆگادرۆ قەبارە زیاد دەکات، شێوەی 5-4 (ب) ڕوونی دەکاتەوە کە زۆربوونی قەبارە، پەستان بە جێگیری دەهێڵێتەوە لە پلەیەکی گەرمی جێگیردا هەر وەك بوونی زۆربوونی قەبارە، ڕێژەی پێکداکەوتنی لەسەر یەکەیەکی ڕووبەری دیوارەکە بە جێگیری دەهێڵێتەوە.

لەمانەی پێشوو بۆمان دەردەکەوێت کە : **پەستانی گاز و قەبارە و پلەی گەرمی و ژمارەی مۆڵەکانی، هەموویان بە پێوەندییەکی بیرکاری پێکەوە بەستراون ، پێی دەڵێن: یاسای گازی نموونەیی ideal gas law** .




**شێوە5-4** (أ) ئەگەر قەبارە و پلەی گەرمی جێگیربوون، پەستان، بە زۆربوونی ژمارەی گەردەکان، زۆر دەبێت. (ب) ئەگەر پەستان و پلەی گەرمی جێگیربوون، ئەوا بەزۆر بوونی ژمارەی گەردەکان قەبارەی گازەکە زۆر دەبێت.

# وەرگرتنی یاسای گازی نموونەیی

دەتوانرێت ئەو هاوکێشە گشتییەی بۆ دۆزینەوەی زانیاریی نادیاری پەیوەندیدار بە نموونەکانی گازەوە بەکاردەهینرێت، بە تێکەڵکردنی یاسای بۆیڵ و شارڵ و ئاڤۆگادرۆ وەربگیرێت:

یاسای بۆیڵ: قەبارەی بارستەیەکی گاز، پێچەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ پەستان، لەکاتی جێگیریی پلەی گەرمیدا..

$$V \propto \frac{1}{P}$$

یاسای شارڵ: قەبارەی بارستەیەکی گاز، راستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ پلەی گەرمی پەتی (کەلڤن)، لەکاتی جێگیری پەستاندا.

$$V \propto T$$

یاسای ئەڤۆگادرۆ: قەبارەی گاز، ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ ژمارەی مۆڵەکاندا، لەکاتی جێگیری پەستان و پلەی گەرمیدا:

$$V \propto n$$

کەواتە هەر برێك، لەم بارەدا قەبارە، لەگەڵ چەند برێکداو لەگەڵ ئەنجامی لێکدانیشیاندا دەگۆڕدرێت، بۆمان دەردەکەوێت کە تێکەڵکردنی ئەو سێ پێوەندییەی پێشوو، دەبێتە هۆی ئەمەی خوارەوە:

$$V \propto \frac{1}{P} \times T \times n$$

دەتوانیت، بیرکارییانە هەر هاوڕێژەیەك بگۆڕیت بۆ هاوکێشە، بەهێنانە ناوەوەی جێگرێك و لەمبارەدا هێمای $R$ بۆ ئەو جێگیرە دادەنێین:

$$V = R \times \frac{1}{P} \times T \times n$$

$R$ ، بەهای ئەو بڕە پیشان دەدات کە نزیکە لە Pv/nT ی هەر گازێك کە ڕەفتاری لە ڕەفتاری گازی نموونەییەوە نزیك بێت، هاوکێشەی گازی نموونەیی وەك خوارەوە، وەردەگیرێت:

$$V = \frac{TRn}{P} \text{ یان } VP = nRT$$

دەقی ئەم هاوکێشەیە، ئەوە دەگەینێت کە قەبارەی هەر گازێك ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ ژمارەی مۆڵەکان (یان گەردەکان)ی ئەو گازە و پلەی گەرمی کەلڤن، هەروەك قەبارە پێچەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ پەستانداو، لەبەرئەوەی زۆربەی گازەکان ڕەفتارێکی نزیکی ڕەفتاری گازی نموونەیی پیشان دەدەن، لە بارودۆخی ئاساییدا، ئەوا دەتوانرێ هاوکێشەکە بە وردییەکی دروست کارپێ بکرێت.

دەیشتوانرێت یاسای گازی نموونەیی بگۆڕدرێت بۆ یاسای بۆیڵ، یان شارڵ، یان گایلۆساك، یان ئەڤۆگادرۆ، کاتێك گۆڕۆکە گونجاوەکان جێگیر دەبن، بۆ نموونە ئەگەر $n$ و $T$ جێگیربن، ئەوا $nRT$ جێگیردەبێت، چونکە $R$ لە بنچینەدا جێگیرو یاسای گازی نموونەیی لەم بارەدا دەگۆڕێت بۆ ( $PV =$ جێگیر )، ئەوەیش یاسای (بۆیڵ)ە.




جێگیری گاز ($R$) = 0.0821 $\frac{\text{L•atm}}{\text{mol•K}}$

**شێوە 5-5** یاسای گازی نموونەیی، پەستان و قەبارە و ژمارەی مۆڵ و پلەی گەرمی گازی نموونەیی پێکەوە دەبەستێ.

## جێگیری گازی نموونەیی

لە هاوکێشەیەدا کە یاسای گازی نموونەیی پێشان دەدات، جێگیری $R$ بەناوی **جێگیری گازی نموونەیی** **ideal gas constant** ناسراوە و بڕەکەی پشت بە یەکە بەکارهێنراوەکانی پەستان و قەبارە و پلەی گەرمی دەبەستێ، شێوە 5-5 ، بەها پێوراوەکانی $P$، $V$، $T$، $n$ ی گازێکی نزیك لە مەرجە نموونەییەکانە و ئەو بەهایانە، دەتوانین بۆ دۆزینەوەی بەهای $R$ بەکاربهێنین، بیرتە، لەوەوە کە لەکەرتی 1-5 دا خوێندووتە کە قەبارەی مۆڵێکی گازی نموونەیی لە بارە پێوانەییەکدا STP (1 atm و 273.15 K) دەکاتە 22.41410 L جا ئەگەر ئەو هێمایانەمان گۆڕییەوە بەو بەهایانە، لە هاوکێشەی یاسای گازی نموونەییدا، وەك خوارەوە بەهای $R$ مان دەست دەکەوێت: L•atm (1 atm)(22.414 10 L)

$$R = \frac{PV}{nT} = \frac{(1\text{ atm})(22.414\ 10\text{ L})}{(1\text{ mol})(273.15\text{ K})} = 0.082\ 057\ 84\ \frac{\text{L•mta}}{\text{mol•K}}$$

بەهای جێگیری گاز $R$ ، نزیك دەخرێتەوە لە 0.0821 L•atm/(mol•K). و ئەم بەهایە، لە ژمارکارییەکانی یاسای گازی نموونەییدا بەکاردەهێنرێت، کاتێك قەبارە بە L و، پەستان بە atm و پلەی گەرمی بە K دەبن، بڕوانە خشتە 1-5 ، کە بەهای R دەردەخات لەکاتی بەکارهێنانی ئەندازەی (یەکەی) تری $n$، $P$، $V$، $T$ دا.

### دۆزینەوەی $P$ یان $V$ یان $T$ یان $n$ بەبەکارهێنانی یاسای گازی نموونەی

بە بەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی دەتوانرێت، یاسای گازی نموونەیی کاریپێبکرێت بۆ دیارکردنی مەرجەکانی نموونەی گازێك، کاتێك سیانی لە چوار گۆڕۆکەکەی: $P$، $V$، $T$، $n$ زانراوبن، دەتوانرێت ئەم پێوەندییەیش بۆ دۆزینەوەی مۆڵە بارستە یان چڕی نموونە گازەکە بەکاربهێنرێت، دڵنیاببە لە گونجاویی یەکەی بڕە زانراوەکانی یەکەی $R$ و لەم کتێبەدا $R$ = 0.0821 L•atm/(mol•K) بەکاردێنین، یەکەم قۆناغی شیکاری هەر پرسێك لە پرسەکانی گازی نموونەیی، نووسینی بەها زانراوەکانە، ئەویش بۆ دڵنیابوون لەوەی کە لەگەڵ یەکە دروستەکان ڕەفتار دەکەیت و ڕەنگە پێویست بکات کە قەبارە بگۆڕێت بۆ L و پەستان بۆ atm و پلەی گەرمی بۆ K و بارستە بۆ ژمارەی مۆڵ،پێش بەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی.

**خشتە 1-5** بەها ژمارەییەکانی جێگیری گاز: $R$

| ئەندازە (یەکە) $R$ | ژمارەی بەهای $R$ | یەکەی $P$ | یەکەی $V$ | یەکەی $T$ | یەکەی $n$ |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{\text{l•mmHg}}{\text{mol•k}}$ | 62.4 | mm Hg | L | K | mol |
| $\frac{\text{L•atm}}{\text{mol•k}}$ | 0.0821 | atm | L | K | mol |
| $\frac{\text{J}}{\text{mol•k}}$ | 8.314 * | Pa | $m^3$ | K | mol |
| $\frac{\text{L•KPa}}{\text{mol•k}}$ | 8.314 | kPa | L | K | mol |

تێبینی : 1 L•atm = 101.325 J ، 1J = 1 Pa•m$^3$

*یەکەی SI

## پرسی نموونەیی 3-5

**بڕی پەستان بە atm پێوراوکە نموونەیەك پەیدای دەکات بڕەکەی 0.500 mol گازی نایترۆجینە، لە دەفرێکدا قەبارەکەی 10.0 L ، لە پلەی گەرمی 298 K ؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** قەبارە $(V)$ $N_2$ = 10.0 L

ژمارەی مۆڵەکانی $(n)$ $N_2$ = 0.500 mol

پلەی گەرمی $(T)$ $N_2$ = 298 K

**نەزانراو:** پەستانی نایترۆجین $P$ بە atm

**2 نەخشە بکێشە**

$n, V, T \longrightarrow P$

نموونە گازەکە؛ ناکەوێتە بەر هیچ گۆڕانێك لە مەرجەکان بۆیە دەتوانرێت یاسای گازی نموونەیی ڕیز بکرێتەوە و بۆ دۆزینەوەی پەستان بەم جۆرە بەکاربهێنرێت:

$$P = \frac{TRn}{V}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$P = \frac{(0.500\ \cancel{mol})\left(\frac{0.0821\ \cancel{L} \cdot atm}{\cancel{mol} \cdot \cancel{K}}\right)(298\ \cancel{K})}{10.0\ \cancel{L}} = 1.22\ atm$$

**4 هەڵسەنگێنە**

هەموو یەکەکان، بەڕاستی کورت دەکرێنەوە ووەڵامەکە نزیك دەکرێتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی.

### ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

1. پەستان بە atm چەندە کە لە 0.325 mol گازی هایدرۆجین لە دەفرێکدا پەیدا دەبێت، کە قەبارەکەی 4.08 L لە 35°C دا؟
2. نموونەیەکی گاز، بڕەکەی 1.45 mol بوو، کرایە دەفرێکەوە کە قەبارەکەی L 8.77 بوو لە 20°C دا، ئەوا پەستانی ئەم نموونەیە پەیدای دەکات بە atm چەندە؟

**وەڵامەکان:**

1. 2.01 atm
2. 3.98 atm

## پرسی نموونەیی 4-5

**قەبارەی 0.250 mol گازی ئۆکسجین داگیری دەکات لە 20.0°C و پەستانی 0.974 atm دا چەند لیترە؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پەستان $(P)$ $O_2$ = 0.974 atm

ژمارەی مۆڵ $(n)$ $O_2$ = 0.250 mol

بۆ بەکارهێنانی $R = 0.0821$ L • atm/(mol • K) ، پێویستە پلەی گەرمی لە °C یەوە بگۆڕین بۆ کەڵفن K .

پلەی گەرمی $(T)$ $O_2$ = 20.0°C + 273.2 = 293.2 K

**نەزانراو:** قەبارەی ئۆکسجین $V$، بەلیتر L ؟

**2 نەخشە بکێشە**

$P ، n ، T \rightarrow V$

دەتوانین یاسای گازی نموونەیی بەشێوەیەکی تر بنووسینەوە، بۆ شیکاریی پرسەکە، بارودۆخی نموونەکە نەگۆڕاوە:

$$V = \frac{TRn}{P}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$V = \frac{(0.250\ \cancel{\text{mol}}\ O_2)\left(\frac{0.0821\ \text{L} \cdot \cancel{\text{atm}}}{\cancel{\text{mol}} \cdot \cancel{\text{K}}}\right)(293.2\ \cancel{\text{K}})}{0.974\ \text{atm}} = 6.17\ \text{L}\ O_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

یەکەکان کورت کراونەتەوە، بۆ ئەوەی یەکەی لیتر بمێنێتەوە وەك داواکراوە و وەڵامەکە نزیك دەکرێتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** نموونەیەکی گاز، 4.38 mol تێدایە لە 250. K و پەستانی 0.857 atm دا، قەبارەکەی چەندە؟

**2.** ئەو قەبارەیەی 0.909 mol نایترۆجین لە 125°C و پەستانی 0.901 atm دا، داگیری دەکات چەندە؟

وەڵامەکان:

1. 105 L
2. 33.0 L $N_2$

## پرسی نموونەیی 5-5

**بارستەی گازی کلۆر $Cl_2$ لە دەفرێکی قەبارە 10.0 L یدا بێت، لە پلەی گەرمی 27°C و لە ژێر پەستانی 3.50 atm دا چەندە؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پەستان $(P)$ $Cl_2$ = 3.50 atm

قەبارە $(V)$ $Cl_2$ = 10.0 L

پلەی گەرمی $(T)$ $Cl_2$ = 27°C + 273. = 300. K

**نەزانراو:** بارستەی $Cl_2$ بەگرام

**2 نەخشە بکێشە**

دەتوانرێت یاسای گازی نموونەیی بەم جۆرە بنووسرێت:

$$n = \frac{VP}{TR}$$

ئەوجا، ژمارەی مۆڵەکان دەگۆڕدرێت بۆ گرام:

$$m\ (\text{g}) = n\ (\text{mol}) \times \frac{\text{g}}{\text{mol}}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$n = \frac{(3.50\ \cancel{\text{atm}})(10.0\ \cancel{\text{L}}\ Cl_2)}{\left(\frac{0.0821\ \cancel{\text{L}} \cdot \cancel{\text{atm}}}{\text{mol} \cdot \cancel{\text{K}}}\right)(300.\ \cancel{\text{K}})} = 1.42\ \text{mol}\ Cl_2$$

بارستایی $Cl_2$ : $m = 1.42\ \text{mol} \times \frac{70.90\ \text{g}\ Cl_2}{\text{mol}} = 101\ \text{g}\ Cl_2$

**4 هەڵسەنگێنە**

پاش کورتکردنەوەی ئەندازە(یەکە) کان، تەنیا یەکە داواکراوەکە دەمێنێتەوە و ئەنجام نزیك دەخرێتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** چەند گرام دوانۆکسیدی کاربۆن لە دەفرێکی $45.1\ L$ یدا هەیە و لە پلەی گەرمی $34^{o}C$ و پەستانی $1.04\ atm$ دا؟

**2.** بارستە بە گرامی، گازی ئۆکسجین کە لە دەفرێکی $12.5\ L$ ی و لە پلەی گەرمی $45^{o}C$ و پەستانی $7.22\ atm$ دا هەیە چەندە؟

**3.** نموونەیەکی گازی دوانۆکسیدی کاربۆن کە بارستەکەی $0.30\ g$ بوو کرایە دەفرێکەوە کە قەبارەکەی $250\ mL$ بوو لە پلەی گەرمی $400.\ K$ دا، ئەو پەستانەی ئەم گازە پەیدای دەکات چەندە؟

**وەڵامەکان:**

.1 $81.9\ g\ CO_2$

.2 $111\ g\ O_2$

.3 $0.90\ atm$

## دۆزینەوەی مۆڵە بارستە یان چڕی، بە دەستپێکردن لە یاسای گازی نموونەییەوە

ئەگەر پەستان و قەبارە و بارستە و پلەی گەرمیی نموونەی گازێکت زانی، دەتوانی بەبەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی ژمارەی مۆڵەکانی $n$ ی ئەو نموونە گازە بزانیت، ئەوسایش دەتوانیت مۆڵە بارستە (بارستەی مۆڵی) (ژمارەی گرامەکان لە مۆڵێکدا) بزانیت بەدابەشکردنی بارستەی زانراو بەسەر ژمارەی مۆڵەکاندا. دەتوانرێت، بەهۆی یاسای گازی نموونەییەوە، هاوکێشەیەك دەربهێنین کە پەیوەندی نێوان چڕی و پەستان و پلەی گەرمی و بارستەی مۆڵی ڕوون بکاتەوە، ژمارەی مۆڵەکان $n$ یەکسانە بە بارستەی (m)، دابەش کرابێت بەسەر مۆڵە بارستەدا $(M)$، $n = m/M$ جا ئەگەر n مان لە هاوکێشە $PV = nRT$ دا، گۆڕییەوە بەبەهاکەی، ئەمەمان دەست دەکەوێت:

$$PV = \frac{TRm}{M} \quad \text{یان} \quad M = \frac{TRm}{PV}$$

بەڵام چڕی $(D)$ ، یەکسانە بە بارستە $(m)$ ، دابەش بەسەر قەبارە $(V)$ دا، $D = m/V$ و، ئەگەر $D$ یمان گۆڕییەوە بەبەهاکەی $(V/m)$ لەو پێوەندییەی پێشوودا، ئەمەمان دەست دەکەوێت:

$$M = \frac{TRm}{PV} = \frac{TRD}{P}$$

لەمەیشەوە ئەم هاوکێشەمان دەست دەکەوێت :

$$D = \frac{PM}{RT}$$

بەوجۆرە ڕوون دەبێتەوە کە چڕی گازێك ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ بارستەی مۆڵی و پەستان و پێچەوانەیش دەگۆڕدرێت لەگەڵ پلەی گەرمی پەتی (کەلفن) دا.

### پرسی نموونەیی 5-6

**مۆڵە بارستەی نموونەیەکی گاز چەندە، ئەگەر بارستەکەی $5.16\ g$ و قەبارەکەی $1.00\ L$ و لە ژێر پەستانی $0.974\ atm$ و لە پلەی گەرمی $28^{o}C$ دا؟**

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پەستانی گاز $(P) = 0.974\ atm$

قەبارەی گاز $(V) = 1.00\ L$

پلەی گەرمی گاز $(T) = 28^{o}C + 273 = 301\ K$

بارستەی گاز $(m) = 5.16\ g$

**نەزانراو:** مۆڵە بارستە $M$ بە $g/mol$

**2 نەخشە بکێشە** $P$ ،$V$ ،$T$ ،$m \longrightarrow M$

دەتوانیت ئەو پەیوەندییە بەکاربهێنییت کە لە یاسای گازی نموونەییەوە وەرگیراوە:

$$M = \frac{TRm}{VP}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$M = \frac{(5.16\ g)\left(\frac{0.0821\ \cancel{L} \cdot \cancel{atm}}{mol \cdot \cancel{K}}\right)(301\ \cancel{K})}{(0.974\ \cancel{atm})(1.00\ \cancel{L})} = 131\ g/mol$$

**4 هەڵسەنگێنە** یەکەکان، وەك پێویست کورت کراونەتەوە وەڵامەکە بەدروستی دراوە و نزیکخراوەتەوە بۆ سێ ڕەنوسی واتایی.

## ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

**1.** مۆڵە بارستەی گازێك کە بارستەی 0.427 g بێت و قەبارەکەی 125mL بێت لە پلەی گەرمیی 20.0°C و لەژێر پەستانی 0.980 atm دا، چەندە؟

**2.** چڕی نموونەیەکی گازی ئەمۆنیا $NH_3$ چەندە، ئەگەر پەستان 0.928 atm و پلەی گەرمی 63.0°C بێت؟

**3.** گازێك چڕییەکەی 2.0 g/L بوو لەژێر پەستانی 1.50 atm پلەی گەرمی 27°C دا، مۆڵە بارستەی ئەو گازە چەندە؟

**4.** چڕی گازی ئەرگۆن Ar ، لەژێر پەستانی 551 torr و پلەی گەرمی 25°Cدا چەندە؟

وەڵامەکان:

**1.** 83.8 g/mol

**2.** 0.572 g/L $NH_3$

**3.** 33 g/mol

**4.** 1.18 g/L Ar

## پێداچوونەوەی کەرتی 2-5

**1.** بە بەکارهێنانی پێوەندییە بیرکارییەکان، ڕوونی بکەوە، چۆن یاسای گازی نموونەیی دەگۆڕێت بۆ:

أ. یاسای بۆیل

ب. یاسای شارڵ

ج. یاسای گایلۆساك

د. یاسای ئەڤۆگادرۆ

**2.** قەبارەی 0.100 g هەڵمی $C_2H_2F_4$ لەژێر پەستانی 0.0928 atm پلەی گەرمی 22.3°C دا بە لیتر چەندە؟

**3.** مۆڵە بارستەی نموونەیەکی گاز چەندە، کە بارستەکەی 1.25 g بێت و، قەبارەکەی 1.00 L و لەژێر پەستانی 0.961 atm و پلەی گەرمی 27.0°C دا؟

**4.** ناوی دوو بڕ بڵێ، جگە لە پەستان و بارستەو قەبارەو ژمارەی مۆڵەکان، کە بتوانرێت بە بەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی بدۆزرێتەوە.

## کەرتی 3-5

# ژمارکارییە کیمیاییەکانی گازەکان

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- یاسای قەبارە گازە کارلێککردووەکانی گایلۆساك و یاسای دۆزینەوەی قەبارەی گازەکان، لە کارلێککردنە کیمیاییەکانی ئەڤۆگادرۆ کارپێدەکات.
- لە هاوکێشە کیمیاییەکان بەکاردێنێت بۆ دیاریکردنی قەبارە ڕێژەی کارلێککردووە گازییەکان، یان بەرهەمهاتووەکان یان هەردووکیان.
- قەبارە ڕێژەکان و یاساکانی گاز بەکاردێنێت بۆ دۆزینەوەی قەبارەی کارلێککردوو، و بەرهەمهاتووە گازییەکان و بارستە و مۆڵە برەکانیان.

دەتوانرێت هەردوو یاسای قەبارە یەکگرتووەکانی گایلۆساك و ئەڤۆگادرۆ بۆ گازەکان لە ژمارکاریی کیمیاییدا کارپێ بکرێت، لە گازە کارلێکە کیمیاییەکاندا، هاوکۆلکەی کارلێککردووەکان بەرهەمهاتووەکان بڕی مۆڵەکان و ڕێژەو قەبارە و ڕێژەی ئەو ماددانە دیاری دەکات، بۆ نموونە سەرنجی کارلێکی یەکۆکسیدی کاربۆن لەگەڵ ئۆکسجین بۆ پێکهێنانی دوانۆکسیدی کاربۆن بدە:

| $2CO_2(g)$ | $\rightarrow$ | $O_2(g)$ | + | $2CO(g)$ |
|---|---|---|---|---|
| دوو گەرد | | گەردێك | | دوو گەرد |
| 2 mol | | 1 mol | | 2 mol |
| دوو قەبارە | | قەبارەیەك | | دوو قەبارە |

دەتوانرێت، قەبارە ڕێژە (ڕێژە قەبارەییە) پێشبینیکراوەکان بەم ڕێگایانەی خوارەوە دەربڕدرێت.

أ. $\frac{\text{CO دوو قەبارە}}{\text{O}_2 \text{ قەبارەیەك}}$

ب. $\frac{\text{CO دوو قەبارە}}{\text{CO}_2 \text{ دوو قەبارە}}$

ج. $\frac{\text{O}_2 \text{ قەبارەیەك}}{\text{CO}_2 \text{ دوو قەبارە}}$

تەنیا بەم ڕێگەیە، دەتوانرێت قەبارەکان بەراورد بکرێن، ئەگەر هەموویان لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا پێورابن

## ژمارکاری قەبارە– قەبارە

وادابنێ، قەبارەی یەکێك لە گازەکان لە کارلێکێکدا زانراوەو، داوایان لێ کردیت، قەبارەی گازێکی تری کارلێککردوو بزانیت، لەگەڵ گریمانی بوونی کارلێککردوو و بەرهەمهاتوو لەهەمان پەستان و پلەی گەرمیدا بوون، قەبارە ڕێژە لێکچووەکانی سەرەوە بەکاربێنەو بەهەمان ئەو ڕێگەیەی مۆڵە ڕێژەی تێدا کار پێ دەکرێت.

**پرسی نموونەیی 7-5**

**گازی پرۆپان $C_3H_8$ جاروبار وەك سووتەمەنی و گەرمکەرەوە بەکاردەهێنرێت و، پرۆپان بەپێی ئەو هاوکێشەیەی خوارەوە بە تەواوی دەسووتێ:**

$$C_3H_8(g) + 5O_2(g) \rightarrow 3\,CO_2(g) + 4H_2O(g)$$

(أ) قەبارەی ئۆكسجينی پێويست (بە L ) بۆ تەواو سووتانی 0.350 L ی پرۆپان چەندە؟ (ب) قەبارەی دوانۆكسيدی كاربۆنی پەيدابوو لە كارلێكەكە چەندە؟ وادابنێ كە هەموو قەبارەكان، لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرميدا پێوراون.

**شيكاری**

**1 شی بكەرەوە**

دراو: هاوكێشەی كيميايی هاوسەنگ

قەبارەی پرۆپان $V = 0.350\ L$

نەزانراو: أ. قەبارەی $V$ ی $O_2$ بەليتر — ب. قەبارەی $V$ ی $CO_2$ بەليتر

**2 نەخشە بكێشە**

أ. $(V)\ C_3H_8 \rightarrow (V)\ O_2$ — ب. $(V)\ C_3H_8 \rightarrow (V)\ CO_2$

هەموو قەبارەكان، لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرميدا، بەراورد دەكرێن، بەوەيش دەتوانرێت رێژەی قەبارەييەكان وەك رێژەی مۆڵی لە دۆزينەوەی بەها داواكراوەكان.

**3 بدۆزەرەوە**

أ. $$0.350\ L\ C_3H_8 \times \frac{5\ L\ O_2}{1\ L\ C_3H_8} = 1.75\ L\ O_2$$

ب. $$0.350\ L\ C_3H_8 \times \frac{3\ L\ CO_2}{1\ L\ C_3H_8} = 1.05\ L\ CO_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

ئەنجامەكانی راستەو، نزێكخراوەتەوە بۆ سێ رەنووسی واتايی.

**راهێنانە كارپێكەرييەكان**

**1.** قەبارەی گازی هايدرۆجينی پێويست چەندە بۆ تەواو كارلێككردن لەگەڵ 4.55 L گازی ئۆكسجينی، بۆ پێكهاتنی هەڵمی ئاو؟ ئەگەر وادابنێيت كە هەموو پێوانەی قەبارەكان، لەهەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا روويان داوە.

**2.** قەبارەی گازی ئۆكسجينی پێويست چەندە بۆ تەواو كارلێككردن لەگەڵ 0.626 L لە گازی يەكەم ئۆكسيدی كاربۆن بۆ پێكهێنانی گازی دوانۆكسيدی كاربۆن؟ ئەگەر وا دابنێيت كە هەموو پێوانەی قەبارەكان، لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا روويان داوە.

**وەڵامەكان:**

1. $9.10\ L\ H_2$
2. $0.313\ L\ O_2$

## ژماركارييەكانی قەبارە- بارستەو بارستە- قەبارە

رەنگە ژماركارييە كيمياييەكانی گازەكان، دۆزينەوەی قەبارەو بارستەی گازەكان بگرێتەوەو رەنگە هەندێ جار، قەبارەی كارلێككردوويان بەرهەمهاتوويەك بدات و بارستە زانراوو قەبارە نەزانراو دەبێت، بۆيە ژماركارييەكان ئەم رێگەيانەی پێويستە:

قەبارەی گازی أ ← مۆڵەكانی أ ← مۆڵەكانی ب ← بارستە يان

بارستەی گاز أ ← مۆڵەكانی أ ← مۆڵەكانی ب ← قەبارەی گازی ب

بۆ دۆزينەوەی نەزانراوەكە لەم بارانەدا، پێويستە ئەو بارودۆخەی كە بەپێی ئەو قەبارەی گازە زانراوو نەزانراوەكانی پێ پێوراون بزانين، ياسای گازی نموونەيی لێرەدا گونجاو دەبێت بۆ دۆزينەوەی بەها پێوراوەكان لەهەمان باری پێوانەيی يان ناپێوانەييدا.

**پرسی نموونەیی 5-8**

دەتوانرێت، کاربۆناتی کالیسۆم $CaCO_3$ کە پێیشی دەڵێن بەردە قسڵ گەرم بکرێت، بۆ بەرهەمهێنانی ئۆکسیدی کالسیۆم، کە بەرهەمێکی دەستکردی فرە بەکارهێنراوە هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگی ئەم کارلێکە وەك خوارەوە دەنووسرێت:

$$CaCO_3(s) \xrightarrow{\Delta} CaO(s) + CO_2(g)$$

پێویستە، چەند گرام کاربۆناتی کالیسیۆم لێك هەڵبوەشێت، بۆ بەرهەمهێنانی 5.0 L دوانۆکسیدی کاربۆن لە ب . پ . STP دا؟

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

دراو: هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ

بەرهەمهێنانی قەبارەی 5.0 L دوانۆکسیدی کاربۆن لە STP دا؟

نەزانراو: بارستەی $CaCO_3$ بەگرام.

**2 نەخشە بکێشە**

قەبارە دراوەکە لە ب . پ . STP دا پێوراوە، واتە پەستان و پلەی گەرمی، دەتوانرێت یاسای گازی نموونەیی بەکاربهێنرێت، بۆ دۆزینەوەی ژمارەی مۆڵەکانی $CO_2$ ، دوای ئەوە دەتوانرێت ئەو رێژە مۆڵییانە بەکاربهێنرێت کە لە هاوکێشە هاوسەنگەکەوە دەرهێنراوە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی مۆڵەکانی $CaCO_3$ ی پێویست (تێبینی: لێرەدا، ناتوانرێت کار بە قەبارە رێژە، بکەین چونکە $CaCO_3$ ماددەیەکی رەقە).

**3 بدۆزەرەوە**

$$n = \frac{PV}{RT} = \frac{(1\ \cancel{atm})(5.00\ \cancel{L}\ CO_2)}{\left(\frac{0.0821\ \cancel{L}\cdot\cancel{atm}}{mol\cdot\cancel{K}}\right)(273\ \cancel{K})} = 0.223\ mol\ CO_2$$

$$0.223\ \cancel{mol\ CO_2} \times \frac{1\ \cancel{mol\ CaCO_3}}{1\ \cancel{mol\ CO_2}} \times \frac{100.09\ g\ CaCO_3}{1\ \cancel{mol\ CaCO_3}} = 22.3\ g\ CaCO_3$$

**4 هەڵسەنگێنە**

ئەندازە(یەکە) کان بەراستی کورت کراونەتەوە و وەڵامە دراوەکە راستەکە وتاسێ رەنووسی واتایی نزیک خراوەتەوە.

**راهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. بارستەی گۆگردی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی 12.61 L گازی دوانۆکسیدی گۆگرد لە ب . پ . STP داو بەپێی ئەم هاوکێشەیە چەندە؟

$$S_8(s) + 8O_2(g) \rightarrow 8SO_2(g)$$

2. چەند گرام ئاو پەیدا دەبێت، لە کارلێکی تەواوی 3.44 L گازی ئۆکسجین لەگەڵ گازی هایدرۆجین، لە ب . پ STP دا؟

وەڵامەکان:

1. $18.0\ g\ S_8$

2. $5.51\ g\ H_2O$

**پرسی نموونەیی 5-9**

تەنگستن W لە پلیتەی گلۆپی کارەبادا بەکاردەهێنرێت و، پیشەسازییانە لە کارلێکی ئۆکسیدی تەنگستن لەگەڵ هایدرۆجین ئامادەدەکرێت.

$$WO_3(s) + 3H_2(g) \rightarrow W(s) + 3H_2O(l)$$

چەند لیتر گازی هایدرۆجین لە پلەی گەرمی 35°C و لە ژێر پەستانی 0.980 atm دا بۆ تەواوکارلێکردن لەگەڵ 875 g ئۆکسیدی تەنگستن پێویستە؟

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** هاوکێشەی کیمیایی هاوسەنگ

بارستەی $WO_3$ ی کارلێککردووی $_3$= 875 g

پەستانی $(P)$ ی $H_2$ = 0.980 atm

پلەی گەرمی $(T)$ ی $H_2$ = 308 K = 35°C + 273

**نەزانراو:** قەبارەی هایدرۆجین بە لیتر $(V)$ ، لە بارودۆخێکی زانراو نا پێوانەییدا.

**2 نەخشە بکێشە**

ژمارەی مۆڵەکانی $H_2$ دەدۆزیتەوە، بە گۆڕینی بارستەی $WO_3$ بۆ مۆڵ و ئەوجا بەکارهێنانی مۆڵە ڕێژە، دوای ئەوە یاسای گازی نموونەیی بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی قەبارە، لە ژمارەی مۆڵە $H_2$ ە دۆزراوەکەوە.

**3 بدۆزەرەوە**

$$875\ \text{g WO}_3 \times \frac{1\ \text{mol WO}_3}{231.84\ \text{g WO}_3} \times \frac{3\ \text{mol H}_2}{1\ \text{mol WO}_3} = 11.3\ \text{mol H}_2$$

$$V = \frac{TRn}{P} = \frac{(11.3\ \text{mol H}_2)\left(\frac{0.0821\ \text{L}\cdot\text{atm}}{\text{mol}\cdot\text{K}}\right)(308\ \text{K})}{0.980\ \text{atm}} = 292\ \text{L H}_2$$

**4 هەڵسەنگێنە**

ئەندازەکان (یەکەکان) بەڕاستی کورت کراونەتەوە و نزیکخراوەتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتای.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

**.1** ئەو قەبارەی گازی کلۆری پێویست چەندە، لە پلەی گەرمی 38°C و لە ژێر پەستانی 1.63 atm دا، کە بۆ تەواو کارلێککردنی لەگەڵ 10.4 g سۆدیۆم بۆ بەرهەمهێنانی NaCl ؟

**.2** چەند لیتر گازی یەکۆکسیدی کاربۆن، لە پلەی گەرمی 27°C و لەژێر پەستانی 0.247 atm دا، دەتوانرێت بەرهەم بهێنرێت لە سووتاندنی 65.5 g کاربۆن، بە پێی ئەم هاوکێشەی خوارەوە:

$$2C(s) + O_2(g) \rightarrow 2CO(g)$$

وەڵامەکان:

**.1** $3.54\ \text{L Cl}_2$

**.2** 544 L CO

## پێداچوونەوەی کەرتی 3-5

**.1** چەند لیتر گازی ئەمۆنیا دەتوانرێت لە کارلێکی 150. L گازی هایدرۆجین بەرهەم بهێنریت، وادابنێ کارلێکی هایدرۆجین لەگەڵ فرەیەك گازی نایترۆجین تەواو بووە و هەموو پێوانەکانیش لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا بوون.

**.2** چەند لیتر گازی $H_2$ لە ب . پ . STP دا دەتوانرێت بەرهەم بهێنرێت لە کارلێکی نێوان 4.60 g سۆدیۆم و فرەیەك ئاو، بە پێی ئەم هاوکێشەیە

$$2Na(s) + 2H_2O(l) \rightarrow H_2(g) + 2NaOH(aq)$$

**.3** چەند گرام Na پێویستە بۆ ئەوەی لەگەڵ $H_2O$ کارلێك بکات بۆ پەیدا کردنی $4.00 \times 10^2$ mL لە گازی $H_2$ لە ب . پ STP دا؟

**.4** چەند لیتر گازی ئۆکسجین دەتوانرێ لە پلەی گەرمی 25.0°C دا و لە ژێر پەستانی 0.987 atm دا کۆ بکرێتەوە، کاتێك 30.6 g لە $KClO_3$ بە گەرمکردن بە پێی ئەم هاوکێشەیە لێك هەڵدەوەشێت.

$$2KClO_3(s) \xrightarrow[MnO_2]{\Delta} 2KCl(s) + 3O_2(g)$$

## بەشی 4-5

# دەرپەڕین و بڵاوبوونەوە

### نیشانەکانی ڕاپیکاری

- لە دەقی یاسای دەرپەڕینی گراهام دەدوێت.
- تێکرا ڕێژەییەکانی دەرپەڕینی دوو گاز کە دوو مۆڵە بارستەی زانراویان هەیە دیاری دەکات.
- لە پێوەندیی نێوان خێرایی گەردی گازە دیاریکراوەکان و مۆڵە بارستەکانیان دەدوێت.

یەکبینە جوولانی گەردەکانی گاز، دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەیان، بە جۆرێك ئەو دەفرەی گازەکەی تێدایە پڕ دەکاتەوە و، بە کردەی وردە وردە تێکەڵبوونی دوو گاز، بە هۆی یەکبینە بە هەموولایەکدا جوولانی گەردەکانیانەوە، پێی دەڵێن بڵاوبوونەوە diffusion ،بەبەندی 4 دا بچۆرەوە و بڕوانە شێوە 6-5 بەڵام دەرپەڕین effusion ، کردەی تێپەڕینی کوێرانەی گەردەکانی گازێکی قەتیسە لە دەفرێکدا لە کونە وردەکانی دیواری دەفرەکەوە، لەم کەرتەدا فێردەبین چۆن دەپەڕین بۆ دۆزینەوەی مۆڵە بارستەی گازبەکاردەهێنین.

## یاسای دەرپەڕینی ، گراهام

تێکرای دەرپەڕین و بڵاوبوونەوە، بەستراوە بە ڕێژە خێرایی گازەکەوە و خێرایی گەردەکانی گاز پێچەوانە هاوڕێژەیە لەگەڵ بارستەکەیاندا و، هەرچەندێك گازەکە سووکتر بێت، جووڵەی گەردەکانی خێراتر دەبێت لە هی گەردەکانی گازی قورس، لە هەمان پلەی گەرمی دوو گازەکەدا.

لە بیرت نەچێت، تێکڕای وزەی جووڵەی گەردەکانی گاز، تەنیا بەستراوە بە پلەی گەرمییەکەیەوە و دەکاتە $\frac{1}{2}mv^2$ و ئەگەر دوو گازی جیاوازمان هەبوو A و B هەردووکیان لە هەمان پلەی گەرمیدابوون، ئەم پێوەندییەی خوارەوە لە نێوانیاندا دەبێت:

$$\frac{1}{2}M_A{v_A}^2 = \frac{1}{2}M_B{v_B}^2$$




**شێوە6-5** کە سەری شووشە بۆنێك دەکەینەوە، هەندێ لەگەردەکانی بڵاودەبێتەوە، لەگەڵ گەردەکانی هەوای دەری شووشەکە تیکەڵ دەبن، لەهەمان کاتدا ، گەردەکانی هەوا وەك نایترۆجین و ئۆکسجین و هی تریش بڵاودەبنەوە و لەگەڵ گەردەکانی بۆنەکەی ناوشووشەکە تێکەڵ دەبن.



**شێوە 7-5** کە بۆنی پیاز هەڵدەمژێت، تەنانەت ئەگەر لە ناو توورەکەیەکی توند داخراویشدا بێت ئەو گەردی ماددە هەڵفڕیوانەی بۆنی پیازەکەی لێ پێك دێت، بەکۆنەکانی توورەکەکەدا دەرپەڕیونەتە دەرەوە.

$M_A$ و $M_B$ مۆڵە بارستەی دووگازی A و B پێشان دەدەن و $v_A$ و $v_B$ خێرایی گەردەکانی دوو گازەکەت و بە لێکدانی هاوکێشەکە لەگەڵ 2 دا، ئەمەمان دەست دەکەوێت:

$$M_A {v_A}^2 = M_B {v_B}^2$$

ئەگەر ویستمان خێرایی دووگازەکە بەراوردبکەین، دەبێت لە پێشدا هاوکێشەکەی پێشوو ڕیزبکەینەوە، بۆ دانانی دوو خێراییەکە بەشێوە ڕێژە:

$$\frac{{v_A}^2}{{v_B}^2} = \frac{M_B}{M_A}$$

ئەوسا ڕەگی دووجای هەردوولای هاوکێشەکە وەردەگرین:

$$\frac{v_A}{v_B} = \frac{\sqrt{M_B}}{\sqrt{M_A}}$$

ئەم هاوکێشەیە دەری دەخات کە خێرایی دوو گازی جیاواز پێچەوانە هاوڕێژەن لەگەڵ ڕەگی دووجای مۆڵە بارستەی هەر یەکەیان و، لەبەر ئەوەی تێکڕای دەرپەڕین ڕاستەوانە دەگۆڕدرێن لەگەڵ خێرایی گەردەکاندا دەتوانین هاوکێشەکە وەك خوارەوەی لێ دێت:

$$\frac{\sqrt{M_B}}{\sqrt{M_A}} = \frac{\text{تێکڕای دەرپەڕینی A}}{\text{تێکڕای دەرپەڕینی B}}$$

ساڵی 1880 ، کیمیا گەری سکۆتلەندی، تۆماس گراهام، لە دوو دیاردەی دەرپەڕین و بڵاوبوونەوەی گازەکان کۆڵییەوە، شێوە 7-5 ، دەرپەڕین ڕوون دەکاتەوە، ئەم کردەی دەرپەڕینەو، کردەی بڵاوبوونەوە پێك بەراورد بکە، هاوکێشە وەرگیراوەکەی پێشوو، دەقی بیرکاری یەکێك لە بۆ دەرکەوتنەکانی گراهام پێشان دەدات، کە باسی تێکڕاکانی دەرپەڕین دەکات، دەقی یاسای دەرپەڕینی، گراهام **Graham's law of effusion** ئەمەیە: **تێکڕای دەرپەڕینی گازەکان، پێچەوانە هاوڕێژەن، لەگەڵ ڕەگی دووجای مۆڵە بارستەکانیاندا، لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا.**



چالاکی کردەیی

# خێـــــرا

## بڵاوبوونەوە

دەستکێشی فڕن لە دەست بکە لەکاتی ڕەفتار لەگەڵ کردنی دەفرە گەرمەکەدا



### ماددەکان

- ئەمۆنیا
- عەتر (بۆن)
- دوو بیکەر، فراوانی.(قەبارە)ی هەریەکەیان 250 mL .
- دەفرێکی پلە کراوی 10 mL ی.
- کاتژمێرێکی وەستاندن.

### پرس

ئایا گازە جیاوازەکان بە خێرایی جیاواز بڵاودەبنەوە؟

### ڕێگا

هەموو ئەنجامەکانت لە خشتەیەکی زانیاریدا بنووسە.

1. لە هەوای کراوەدا کاربکە، یان لە ژوورێکی جیا لەوەی مادەی تاقیکردنەوەکەتی تێدا جێبەجێ دەکەیت، نزیکەی 10 mL ئەمۆنیا بکەرە یەکێك لە دوو دەفرە 250 mL یەکەوە و دەمەکەی بەشووشەیەکی کاتژمێردا بپۆشە، هەمان بڕ بۆن (عەتر) بکەرە دەفری دووەمەوە و دەمەکەی بە شووشەیەکی کاتژمێردا بپۆشە.
2. دوو دەفرەکە بگوێزەرەوە بۆ ژوورێکی گەورەی بێ تەوژمی هەوا، دوو بیکەرەکە (دەفرەکە) لە هەمان بەرزاییدا دابنێ و با 4 بۆ 5 مەتر لێك دوور بن بافێرخوازێك لە نێوان دوو دەفرەکە دا بوەستێ لەیەك کاتدا سەرپۆشەکانیان لابەرە.
3. لە فێرخوازەکە بپرسە یەکەم جار کامیانی (ئەمۆنیا یان عەترەکە) بۆن کردووە، ئەو کاتەی بۆنەکەی کردووە، بنووسە و ئەوماوەیەیش (کاتەیش) کە بۆنی ماددەی دووەم دەکات هەر بنووسە، کە لە تاقیکردنەوەکە بوویتەوە هەوای ژوورەکە بگۆڕە.

### گفتوگۆ

1. دوو گازەکە، چەندیان پێ چوو تا گەیشتوونەتە لووتی فێرخوازەکە بۆنی کردوون؟
2. سەرباری گەردە بارستە (بارستەی گەردی) کە خێرایی بڵاوبوونەوەی دیاری دەکات، ئەو هۆکارانەی تر چین کە ڕەنگە کاربکەنە خێرایی بۆنکردنی هەریەکە لە دوو گازەکە بە جیا، لە لایەن فێرخوازەکەوە؟




## کارپێکردنەکانی یاسای گراهام

تاقیکردنەوەکانی گراهام دەریان خست کە چڕی گاز، ڕاستەوانە هاوڕێژەیە لەگەڵ مۆڵە بارستەکەیدا، لەبەرئەوە دەتوانرێت ڕەگی دووجای بگۆڕدرێتەوە بە ڕەگی دووجای مۆڵە بارستە لەو هاوکێشەیەداکە لە لاپەڕەی پێشوودا هاتووە و بەوەیش ئەم هاوکێشەیەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:

$$\frac{\text{A خێرایی دەرپەڕین}}{\text{B خێرایی دەرپەڕین}} = \frac{\sqrt{M_B}}{\sqrt{M_A}} = \frac{\sqrt{\text{B چڕی}}}{\sqrt{\text{A چڕی}}}$$

لەو تاقیکردنەوەیەی لە شێوەی 5-8 دا پێشان دراوە، لە هەردوو سەری بۆرییە شووشەکەوە، گازی ئەمۆنیا و گازی کلۆریدی هایدرۆجین هەر یەکەیان بەرەو ئەوەی تریان بڵاودەبێتەوە و لە شوێنی پێك گەیشتنی دوو گازەکە و کیمیاییانە یەکگرتنیان ئەلقەیەکی سپی کلۆریدی ئەمۆنیۆم $NH_4Cl$ ی ڕەق پێك دێت، سەرنج بدەکە ئەڵقەکە، لە ناو بۆرییەکەدا لە نزیك سەری $HCl$ مکەوە پێك دێت.

ئەگەر هەردوو گازەکە هەمان هەڵمەپەستانیان هەبوایە، (کە لەدوو خەستی یەکسان پەیدا دەبێت) ، ئەو ئەنجامە وا لێك دەدرایەوە کە بەتەواوی بە هۆی جیاوازی مۆڵە بارستەوەیە، چونکە گەردەکانی $NH_3$ ی سووکترن ( مۆڵە بارستەکەی = 17.04 g ) لە گەردەکانی $HCl$ ی قورستر (مۆڵە بارستەکەی = 36.46 g ) ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیەکە خێرایی بڵاوبوونەوە، پشت بە مۆڵە بارستەی گەردەکان و خەستییەکەی دەبەستێت.

هەروەها، یاسای گراهام ڕێگەیەکمان فێردەکات بۆ دیاریکردنی مۆڵە بارستەی گازەکان و بەهۆی ئەم یاسایەوە دەتوانرێت خێرایی دەرپەڕینی گازە مۆڵە بارستە زانراو و نەزانراوەکان بدۆزرێتەوە کە لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندابن ، دوای ئەوە، مۆڵە بارستە نەزانراوەکان بە بەکارهێنانی یاسای گراهام بدۆزرێتەوە و یەکێك لە بەکارهێنانی یاسای گراهام لە جیاکردنەوەی هاوتای یورانیۆمی قورس $^{238}_{92}U$ لە هاوتای یورانیۆمی سووکتر $^{235}_{92}U$ دا خۆی دەنوێنێت، ئەویش بە گۆڕینی یورانیۆم دەبێت بۆ ئاوێتەی گازی و بە بەرگی کونیلەداردا دەبرێت و، گازە جیاوازەکان بە پێی چڕییە جۆراوجۆرەکانیان بڵاودەبنەوە، ئەویش دەبێتە هۆی کردەی جیاکردنەوە.

**شێوە 5-8** دەمەوانەیەکی لۆکەی بە گیراوەی ئەمۆنیا تەرکراو لە سەرێکی بۆرییەکی شووشەدا دادەنرێت و لەسەرەکەی تر دەمەوانەیەکی لۆکەی تری بە گیراوەی کلۆریدی هایدرۆجین تەڕکراو، پێش چەند دەقیقەیەك لە گرتنی وێنەکە بۆچی ئەلقەیەکی سپی پێك دێت لە ماددەی $NH_4Cl$ لە نزیك ئەو سەرەوە کە کەوتۆتە لای ڕاست و دوور لە لای چەپ.

## پرسی نموونەیی 10-5

خێرایی دەرپەڕینی هایدرۆجین و ئۆکسجین پێك بەراورد بکە لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا.

### شیکاری

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** پێناسی گازی $H_2$ و $O_2$

**نەزانراو:** ڕێژە خێرایی دەرپەڕین

**2 نەخشە بکێشە**

ڕێژەی مۆلی بارستە ← ڕێژەی خێرایی یەکانی دەرپەڕین دەتوانرێت ڕێژەی خێرایی دەرپەڕینی دوو گاز بدۆزیتەوە کە لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدان، بە بەکارهێنانی یاسای گراهام وەك خوارەوە:

$$\frac{\text{خێرایی دەرپەڕینی A}}{\text{خێرایی دەرپەڕینی B}} = \frac{\sqrt{M_B}}{\sqrt{M_A}}$$

**3 بدۆزەرەوە**

$$\frac{\text{خێرایی دەرپەڕینی } H_2}{\text{خێرایی دەرپەڕینی } O_2} = \frac{\sqrt{M_{O_2}}}{\sqrt{M_{H_2}}} = \sqrt{\frac{32.00\ /\text{gmol}}{2.02\ \text{g/mol}}} = \sqrt{\frac{32.00\ \text{g/mol}}{2.02\ \text{g/mol}}} = 3.98$$

خێرایی دەرپەڕینی هایدرۆجین 3.98 ئەوەندەی خێرایی دەرپەڕینی ئۆکسجین ە.

**4 هەڵسەنگێنە**

ئەنجامەکان بەڕاستی خەمڵێنراون و نزیك خراونەتەوە بۆ سێ ڕەنووسی واتایی.

### ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان

1. تێپەڕینی نموونەیەکی هایدرۆجین بە دەفرێکی کونیلەداردا بە خێرایی 9 ئەوەندەی خێرایی گازێکی نەزانراو، مۆڵە بارستەی ئەم گازە بدۆزەرەوە.
2. خێرایی دەرپەڕینی دوانۆکسیدی کاربۆن و کلۆریدی هایدرۆجین پێك بەراورد بکە، ئەگەر هەردووکیان لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا بن.
3. گەردیلەیەکی گازی نیۆن، بەخێرایی 400 m/s دەجووڵێت لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا، تێکڕای خێرایی گەردێکی گازی بیوتان $C_4H_{10}$ بدۆزەرەوە لە هەمان پلەی گەرمیدا.

**وەڵامەکان:**

1. 160 g/mol
2. دەرپەڕینی $CO_2$ بەنزیکەی 0.9 ئەوەندەی HCl دەبێت.
3. 235 m/s

## پێداچوونەوەی کەرتی 4-5

1. بەراورد بکە لە نێوان بڵاوبوونەوە و دەرپەڕیندا.
2. بەهای نزیکەیی مۆڵە بارستەی گازێك بدۆزەرەوە کە بەخێرایی 1.6 ئەوەندەی دەرپەڕینی دوانۆکسیدی کاربۆن دەردەپەڕێت.
3. ئەم گازانەی خوارەوە بەرەو ژوور ریز بکە، بە پێی تێکڕای خێرایی گەردەکانیان لە پلەی گەرمی 25°C دا، گازەکان ئەمانەن: $H_2O$، He، HCl، BrF، $NO_2$

## کورتەی بەندەکە

**1-5**

- یاسای گازە یەکگرتووەکانی گایلۆساک دەڵێت: دەتوانرێت، قەبارەی گازە کارلێککردووە وە بەرهەمهاتووەکان بە ڕێژەی ژمارەیی سادە دەرببڕین، بە جێگیری پلەی گەرمی و پەستان.
- یاسای ئەڤۆگادرۆ دەڵێت: قەبارەی یەکسانەکانی گازە جیاوازەکان کە هەمان ژمارە گەردیان تێدایە، لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا، بۆیە: قەبارەی گاز، ڕاستەوانە دەگۆڕدرێت لەگەڵ ژمارەی مۆڵەکانیدا، بە جێگیری پلەی گەرمی وپەستان
- بەو قەبارەیەی مۆڵێکی گازی نموونەیی داگیری دەکات لە ب . پ . STP دا دەڵێن قەبارەی مۆڵی پێوانەیی و دەکاتە 22.4 L لە و بارودۆخەدا.

**زاراوەکان**

قەبارەی مۆڵی پێوانەیی گازی
(131) standard molar volume of gas

(130) Avogadro's law یاسای ئەڤۆگادرۆ

یاسای قەبارەی گازە یەکگرتووەکانی گایلۆساک
(129) Gay-Lussac's law of combining volumes of gases

**2-5**

- دەتوانرێت یاساکانی شارڵ، بۆیڵ و ئەڤۆگادرۆ، کۆبکرێنەوە بۆ پێکهێنانی یاسایەك بۆ گازەکان، پێی دەڵێن یاسای گازی نموونەیی و بیرکارییانە بەم جۆرە دەردەبڕدرێت: $PV = nRT$
- بەهای جێگیری گازی نموونەیی و یەکەکانی پشت بە یەکەکانی ئەو گۆڕۆکانە دەبەستن کە لە یاسای گازی نموونەییدا بەکاردێن.
- یاسای گازی نموونەیی، بۆ دۆزینەوەی پەستانی گاز یان قەبارەکەی یان پلەی گەرمییەکەی یان ژمارەی مۆڵەکانی بەکاردەهێنرێت، هەر کاتێك سیان لەم چوار گۆڕۆکە بزانرێن، بەمەرجێك بارودۆخی نموونەی گازەکە جێگیر بێت.
- دەشتوانرێت یاسای گازی نموونەیی بۆ دۆزینەوەی چڕی گاز یان مۆڵە بارستەکەی بەکاربهێنرێت.

**زاراوەکان**

(137) ideal gas constant جێگیری گازی نموونەیی

(135) ideal gas law یاسای گازی نموونەیی

**3-5**

- لە کاتی زانینی قەبارەی گازی کارلێککردوو لە هاوکێشەیەکی هاوسەنگدا، دەتوانرێت قەبارەی گازە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان بدۆزرێتەوە بەبەکارهێنانی ڕێژە قەبارەییەکان لە ژێر هەمان باری پەستان و پلەی گەرمییدا.
- کاتێك قەبارەی گازی کارلێککردوو یان بەرهەمهاتوو زانراوبن،دەتوانرێت بارستەی کارلێککردووەکەی تر یان بەرهەمهاتوو بدۆزرەوە بەبەکارهێنانی یاسای گازی نموونەیی و هاوکۆلکەکانی گۆڕین لە مۆڵەوە بۆ بارستە.
- کاتێك بارستەی ماددەیەك زانراوبێت، دەتوانرێت یاسای گازی نموونەیی و هاوکۆلکەکانی گۆڕین لە بارستەوە بۆ مۆڵ بەکاربهێنرێت، بۆ دۆزینەوەی قەبارەی گاز

**4-5**

- دەقی یاسای دەرپەڕینی گراهام، دەڵێت: تێکرای دەرپەڕینی گازەکان، پێچەوانە دەگۆڕدرێت، لەگەڵ ڕەگی دووجای مۆڵە بارستەکەیدا، لە ژێر هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا.
- یاسای گراهام ڕاستییەك دەداتەوە کە گەردە بارستە بچووکترەکان خێرا تر دەردەپەڕێت لە گەردە بارستە گەورەترەکان.
- دەتوانرێت یاسای گراهام بۆ بەراوردکردنی تێکڕای دەرپەڕینی گازەکان بەکاربهێنرێت، لە ژێر هەمان پلەی گەرمی و پەستاندا.
- کاتێك، تێکڕای دەرپەڕینی ڕێژەیی دوو گاز و پێناسی یەکێکیان زانراو بێت، دەتوانرێت یاسای خەملاندنی مۆڵە بارستەی گازەکەی تری گراهام بەکاربهێنرێت.

**زاراوەکان** یاسای گراهام بۆ دەرپەڕین (147) Graham's law of effusion

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

**1.** أ. ئەو دابینکەرانە چین، کە ڕەچاودەکرێن لە کاتی کارپێکردنی یاسای قەبارەی گازە یەکگرتووەکانی گایلۆساکدا؟

ب. کاتێک پلەی گەرمی و پەستان جێگیر دەبێت، پێوەندی نێوان قەبارەی گاز و ژمارەی گەردەکانی چییە؟

**2.** بەپێی یاسای ئەڤۆگادرۆ:

أ. پێوەندی نێوان قەبارەی گاز و ژمارەی مۆڵەکانی چییە، لە کاتی جێگیری پلەی گەرمی و پەستاندا؟

ب. ئەو دەربڕینە بیرکارییەی باسی ئەو پێوەندییە دەکات چییە؟

**3.** پێوەندی نێوان ژمارەی گەردەکان و بارستەی 22.4 L ی چەند گازێکی جیاواز لە ب . پ .STP چییە؟

**4.** بۆچی پێویستە پلەی گەرمی و پەستان دیاری بکرێن کە باسی بەهاکانی چڕی گاز دەکەیت؟

**5.** ئەو هاوکێشەیە بنووسە، کە یاسای گازی نموونەیی دەری دەبڕێت.

**6.** أ. کەی یاسای گازی نموونەیی کاری پێ دەکرێت؟

ب. بۆچی لە یەکە بەکارهێنراوەکان لەکاتی کارپێکردنی ئەم یاسایەدا بایەخی پێ دەدەین؟

**7.** أ. پێوەندیی نێوان مۆڵە ڕێژە و قەبارە ڕێژەی کارلێککردوو بەرهەمهاتووە گازییەکان چییە لە هاوکێشەیەکی هاوسەنگدا؟

ب. دابینکردنی کارپێکراوەکان لە بەکارهێنانی قەبارە ڕێژەکان. چییە، بۆ شیکاریی پرسەکانی ژمارەکارییە کیمیاییەکانی گاز؟

**8.** أ. دیاردەی بڵاوبوونەوە و دەرپەڕین بەراورد بکە.

ب. کام لەم هۆکارانە، ئەو تێکرایانە دیاری دەکات کە بە پێی ئەوان گەردە جیاوازەکان ملکەچی ئەو دوو دیاردەیە دەبن، لە کاتی جێگیری پلەی گەرمیدا؟

## پرسەکان

### قەبارەی مۆڵی و چڕی گاز

**9.** وادابنێ کە نموونەیەکی گازی $O_2$ ، قەبارەکەی 5.00 L لە پلەی گەرمی و پەستانێکی دیاریکراوداو، $1.08 \times 10^{23}$ گەردی تێدایە، ئایا ئەم دوو قەبارە گازە لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا چەند گەردیان تێدایە؟

أ. 5.00 L لە $H_2$     ب. 5.00 L لە $CO_2$

**10.** چەند گەرد، لەهەریەکەی ئەمانەدا هەیە؟

أ. 1.00 mol لە $O_2$     ب. 11.5 g لە $NO_2$

**11.** بارستەی هەریەك لەمانەی خوارەوە بدۆزەرەوە:

أ. 2.25 molلە $Cl_2$

ب. $3.01 \times 10^{23}$ گەرد $H_2S$

**12.** قەبارەی هەرهەریەك لەمانەی خوارەوە چەند لیترە لە ب . پ . STP دا (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-1 ):

أ. 3.50 mol لە $F_2$     ب. $1.20 \times 10^{-6}$ mol لە He

**13.** چەند مۆڵ لە هەریەکەی ئەمانەدا هەیە لە ب. پ. STP دا:

أ. 22.4 L لە $N_2$

ب. 5.60 L لە $Cl_2$

ج. 70.0 mL لە $NH_3$

**14.** بارستەی هەریەك لەمانە بە گرام بدۆزەرەوە لە ب . پ . STP دا (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-2 ):

أ. 2.80 L لە $CO_2$

ب. 15.0 mL لە $SO_2$

ج. $3.40\ cm^3$ لە $F_2$

**15.** قەبارەی هەریەك لەمانەی خوارەوە بە لیتر چەندە لە STP دا:

أ. 8.00 g لە $O_2$     ب. 0.0170 g لە $H_2S$

### یاسای گازی نموونەیی

**16.** پەستان بە کەش atm ی هەریەك لەمانەی خوارەوە بدۆزەرەوە (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-3 ):

أ. 2.50 L لە HF کە 1.35 mol تێدایە لە پلەی گەرمی 320 K دا .

ب. $7.50 \times 10^2$ mL لە $CO_2$ کە 2.15 mol ی تێدایە لە پلەی گەرمی 57°C دا.

**17.** ئەو قەبارەیەی هەر یەکە لەمانەی خوارەوە دەیگرێتەوە بە لیتر بدۆزەرەوە (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-4 ):

أ. 2.00 mol لە $H_2$ لەپلەی گەرمی 300. K و لە ژێر پەستانی 1.25 atm

ب. 0.425 mol لە $NH_3$ لەپلەی گەرمی 37°C و لە ژێر پەستانی 0.724 atm

ج. 4.00 g لە $O_2$ لەپلەی گەرمی 57°C و لە ژێر پەستانی 0.888 atm

**18.** ژمارەی مۆڵەکانی گازێك بدۆزەرەوە، کە ئەم قەبارانە داگیر بکات:

أ. $1.25\ L$ لە پلەی گەرمی $250.\ K$ و پەستان $1.06\ atm$

ب. $0.80\ L$ لە پلەی گەرمی $27^oC$ و پەستان $0.925\ atm$

**19.** بارستەی هەریەك لەمانەی خوارەوە بدۆزەرەوە ( بڕوانە پرسی نموونەیی 5-5 ).

أ. $3.50L$ لە $NH_3$ لە پەستانی $0.921\ atm$ و پلەی گەرمی $27^oC$ دا

ب. $125\ mL$ لە $SO_2$ لە پەستانی $0.822\ atm$ و پلەی گەرمی $-53^oC$ دا

**20.** مۆڵە بارستەی (بارستەی مۆڵی) هەر گازە، بدۆزەرەوە کە لەو بارە دیاریکراوانەی خوارەوەدا پێوراون ( بڕوانە پرسی نموونەیی 5-6 ).

أ. $0.650\ g$ ، کە $1.12\ L$ دەگرێتەوە لە پلەی گەرمی $280.\ K$ لە ژێر پەستانی $1.14\ atm$ دا

ب. $1.05\ g$ ، کە $2.35\ L$ دەگرێتەوە لە پلەی گەرمی $37^oC$ لە ژێر پەستانی $0.840\ atm$ دا

**21.** ئەگەر چڕی گازێکی نەناسراو $3.20\ g/L$ بێت لە پلەی گەرمی $-18^oC$ و لە ژێر پەستانی $2.17\ atm$ دا، مۆڵە بارستەی ئەو گازە چەندە؟

**22.** یەکێك لە ڕێگا بەکارهێنراوەکانی پێوانی پلەی گەرمی ناوەندی (چەقی) خۆر، ئەگەر وا دابنێن ناوەندی خۆری، گازی وا تێدایە کە تێکرای مۆڵە بارستەیان $2.00\ g/mol$ ، ئەگەر چڕی ناوەندی خۆر بگاتە $1.40\ g/cm^3$ لە ژێر پەستانی $1.30 \times 10^9\ atm$ بێت، ئایا پلەی گەرمی ناوەند چەند پلەی سەدییە؟

## ژمارکاریی کیمیایی گازەکان

**23.** یەکۆکسیدی کاربۆن، لە گەڵ ئۆکسجین کارلێك دەکەن بۆ پێك هێنانی دوانۆکسیدی کاربۆن،لە کاتی کارلێککردنی $1.0\ L$ یەکۆکسیدی کاربۆن لەگەڵ ئۆکسجین.

أ. چەند لیتر ئۆکسجین بۆ ئەو کارلێککردنە پێویستە؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-7 ).

ب. چەند لیتر دوانۆکسیدی کاربۆن لەو کارلێکە پەیدا دەبێت؟

**24.** گازی ئەستیلین $C_2H_2$ دەسووتێ و دوانۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو پێك دێت، ئەگەر $75.0\ L$ $CO_2$ پەیدابوو بێت.

أ. چەند لیتر $C_2H_2$ سووتاوە؟

ب. قەبارەی هەڵمی ئاوی پەیدا بوو چەندە؟

ج. قەبارەی $O_2$ پێویست چەندە؟

**25.** ئەگەر دوانەگۆگردیدی کاربۆن شل لەگەڵ $4.50 \times 10^2\ mL$ ئۆکسجین کاریان لێککرد بۆ بەرهەمهێنانی گازی دوانۆکسیدی کاربۆن و دوانۆکسیدی گۆگرد، قەبارەی ئەو دوو گازە پەیدابووە چەندە؟

**26.** وادابنێ کە $5.60\ L$ $H_2$ لە ب . پ . STPدا، لەگەڵ $CuO$ کارلێك دەکات بە پێی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:

$$CuO(s) + H_2(g) \rightarrow Cu(s) + H_2O(g)$$

پێش ژمارکاری، دڵنیاببە کە کە هاوکێشەکە هاوسەنگە.

أ. چەند مۆڵ $H_2$ کارلێك دەکات؟ (بڕوانە پرسی نموونەیی 5-8)

ب. چەند مۆڵ $Cu$ پێك دێت؟

ج. چەند گرام $Cu$ پێك دێت؟

**27.** هایدرۆکسیدی ئاسن (III) ی ڕەق، لێك هەڵدەوەشێت بۆ پێکهێنانی ئۆکسیدی ئاسن (III) و هەڵمی ئاو، ئەگەر $0.75\ L$ هەڵمی ئاو پێك بێت لە ب . پ دا STP .

أ. چەند گرام هایدرۆکسیدی ئاسن (III) بەکارهێنراوە؟

ب. چەند گرام ئۆکسیدی ئاسن (III) پەیدابووە؟

**28.** ئەگەر $29.0\ L$ میثان $CH_4$ سووتا، سووتاندنێکی تەواو، لە ژێر پەستانی $0.961\ atm$ و پلەی گەرمی $20^oC$ دا، چەند لیتر لە هەر بەرهەمە پێك دێت؟

**29.** لە بزوێنی ئۆتۆمۆبێلدا، هەڵمی ئۆکتان لەگەڵ هەوا دەسووتێ، ئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین $20.9\%$ ی قەبارەی هەوا بێت:

أ. چەند لیتر هەوا پێویستە بۆ تەواو سووتاندنی $25.0\ L$ هەڵمی ئۆکتان $C_8H_{18}$ ؟

ب. قەبارەی هەردوو بەرهەمەکە چەندە؟

**30.** ئەمۆنیا، بەڕێگەی هابەر ئامادەدەکرێت لە $550.^oC$ داو لەژێر پەستانی $2.50 \times 10^2\ atm$ دا، ئەگەر $10.0\ kg$ نایترۆجین (کارلێککردووی دیاریکراو) بەکارهێنراو کارلێککردنەکە تا کۆتایی بەردەوام بوو، قەبارەی ئەمۆنیای پەیدابوو چەندە؟

**31.** کە نایترۆگلیسرین $C_3H_5(NO_3)_3$ ی شل دەتەقێتەوە، دوانۆکسیدی کاربۆن و نایترۆجین و ئۆکسجین و هەڵمی ئاو پێك دێت، ئەگەر $5.00 \times 10^2\ g$ نایترۆگلیسرین تەقییەوە لە ب.پ.دا (STP) ، قەبارەی گشتی گازە پەیدابووەکان لە ب.پ.دا (STP) چەندە؟

**32.** سەرچاوەی سەرەکی گۆگردی سەرزەوی، ئەو نیشتە گۆگردە ئازادانەیە کە لە ناوچە گڕکانییە چالاکەکاندا هەن، گۆگرد لە سەرەتادا لە کارلێکی دوو جۆر هەڵمی گڕکانی پەیدابووە $SO_2$ و $H_2S$ کە $H_2O(l)$ و $S_8(s)$ پەیدا بوون، قەبارەی پێویستی هەردوو گازی کارلێککردوو چەندە لەژێر پەستانی 0.691 atm و پلەی گەرمی 22°C دا، بۆ پێکهاتنی نیشتەی گۆگرد کە بڕەکەی $4.5 \times 10^5$ kg بێت لەسەر لووتکەی دامێنی گڕکانێکدا.

**33.** نموونەیەکی کاربیدی کالیسیۆمی ڕەق $CaC_2$ بارستەکەی 3.25 g بوو، لەگەڵ ئاو کارلێك دەکەن بۆ پێکهاتنی گازی ئەسیتیلین $C_2H_2$ و گیراوەی هایدرۆکسیدی کالیسیۆم. ئەگەر ئەسیتیلین لەسەر ئاو کۆکرایەوە لە پلەی گەرمیی 17°C و لەژێر پەستانی 0.974 atm دا ، چەند میللیلیتر ئەسیتیلین پەیدا دەبێت؟

**34.** ئەم هاوکێشە کیمیاییەی خوارەوە هاوسەنگ بکە:

$$Mg(s) + O_2(g) \rightarrow MgO(s)$$

ئەوجا بەپشت بەستن بەبڕی کارلێککردوو بەرهەمهاتووی دراوی بڕە هاوتاکانی کارلێکردوو بەرهەمهاتوو دیاری بکە و، وا دابنێ کە سیستمەکە لە ب.پ. دان STP :

أ. $22.4\ L\ O_2 =$ —— $mol\ O_2 \rightarrow$ —— $mol\ MgO$

ب. $11.2\ L\ O_2 =$ —— $mol\ O_2 \rightarrow$ —— $mol\ MgO$

ج. $1.40\ L\ O_2 =$ —— $mol\ O_2 \rightarrow$ —— $mol\ MgO$

## دەرپەڕین و بڵاوبوونەوە

**35.** خێرایی دەرپەڕینی ئەم جووتە گازانەی خوارەوە، بەراورد بکە، لەهەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا:

أ. هایدرۆجین ونایترۆجین(بڕوانە پرسی نموونەیی 5-10)

ب. فلۆر و کلۆر.

**36.** ڕێژەی تێکڕای خێرایی گەردەکانی هایدرۆجین بۆ تێکڕای خێرایی گەردیلەکانی نیۆن لەهەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا چەندە؟

**37.** گەردەکانی فلۆر، تێکڕای خێراییان 0.0380 m/s یە لە بارێکی دیاریکراوی پەستان و پلەی گەرمیدا، تێکڕای خێرایی گەردەکانی دوانۆکسیدی گۆگرد لەهەمان باردا چەندە؟

**38.** نموونەیەکی هیلیۆم بەناو دەفرێکی کونیلەداردا بەخێرایی 6.50 جار لە خێرایی تێپەڕینی گازێکی نەزانراو، زیاتر دەرپەڕی، مۆڵە بارستەی گازە نەزانراوەکە چەندە؟

## پێداچوونەوەی هەمە جۆر

**39.** گازێکی نەناسراو بە خێراییەك کە دەگاتە 0.850 ئەوەندەی تێکڕای دەرپەڕینی دوانۆکسیدی نایترۆجین $NO_2$ ، مۆڵە بارستەی گازە نەناسراوەکە چەندە؟

**40.** یاسای نموونەیی $PV = nRT$ بەکاربێنە، بۆ لێ وەرگرتنی یاسای بۆیڵ و شارڵ.

**41.** دەفرێکی 265 mL گازی کلۆر $Cl_2$ ی تێدایە، وادابنێ کە نموونەی گازەکە لە باری ب.پ.دا ( STP )ن، بارستەکەی چەندە؟

**42.** وادابنێ کە 3.11 مۆڵ لە دوانۆکسیدی کاربۆن لەژێر پەستانی 0.820 atm پلەی گەرمی 39°C دا، قەبارەی نموونەکە بە لیتر چەندە؟

**43.** تێکڕای بڵاوبوونەوەی یەکۆکسیدی کاربۆن، CO و سیانۆکسیدی گۆگرد $SO_3$ بەراورد بکە.

**44.** بارستەی نموونەیەکی گاز 0.993 g بوو، قەبارەی 0.570 L داگیر دەکات لە پلەی گەرمی 281 K لەژێر باری 1.44 atm دا، مۆڵە بارستەی گازەکە چەندە؟

**45.** چڕی گازێك 3.07 g/L ە لە ب.پ. ( STP )دا، مۆڵە بارستەکەی چەندە؟

**46.** چەند مۆڵ گازی هیلیۆم پێویستە بۆ پڕکردنی باڵۆنێکی گاز کە قەبارەکەی $1000.\ cm^3$ بوو، لە پلەی گەرمی 32°C و لەژێر پەستانی 752 mm Hg دا؟

**47.** نموونەیەکی گاز لە پلەی گەرمی 16°C و لەژێر پەستانی 0.982 atm کۆکرایەوە، وادابنێ بارستەی نموونەکە 7.40 g وە قەبارەکەی 3.96 L ، قەبارەی گازەکە لەژێر STP دا چەندە؟

## بیرێکی ڕەخنەسازانە

**48.** بەستنەوەی بیر: هەندێك پێوەندی بیرکارییانە بنووسە، تێکڕای دەرپەڕین و مۆڵە بارستەو چڕی دوو گازی جیاوازی A و B ی پێکەوە ببەستن.

**49. چەمك لێكدانەوە:** ئەم شێوانەی خوارەوە قەبارەی یەكسانی چەند گازێكی جیاواز پیشان دەدەن




ئەم شێوانە، لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسانەی خوارەوەدا بەكاربهێنە:

أ. ئایا ئەم گازانە، لەهەمان پلەی گەرمی و پەستاندا دانراون؟ چۆنت زانی؟

ب. ئەگەر مۆڵە بارستەی گازی B ، 38 g/mol و هی گازی C ، 46 g/mol بێ، نموونەی كام گازیان چڕترە؟ (چڕی كامیان زۆرترە)

ج. بۆ یەكسانكردنی چڕی C و B ، دەبێت قەبارەی كامیان زیاد بكەین؟

د. ئەگەر چڕی گازی A و C یەكسان بوون، پێوەندی نێوان گەردە بارستەیان چییە؟

## تویژینەوەو نووسین

**50.** چۆن ژێر ئاو گەڕەكانی دەریا، دەتوانن سوود لەو یاساو بنەمایانە وەربگرن كە باسی ڕەفتاری گازەكان دەكەن؟ ئەو ئاگاداری و خۆپارێزییانە چین كە پێویستە بیكەن بۆ ئەوەی تووشی كێشە نەبن؟

**51.** ڕێگای شلكردنەوەی گازەكان ڕاڤە بكە، ئەو ماددانە چین كە لە پلەی گەرمی ژووردا گازن و ئاسایی بە شلی بەكاردەهێنرێن؟ بۆچی؟

**52.** لە پێوەندیی نێوان تەقەمەنیەكان و جارێ خەڵاتی نۆبڵ بكۆڵەرەوە، ڕاپۆرتێك لەو بارەیەوە بنووسە كە دەستت كەوتووە.

## برییە هەڵسەنگاندن

**53.** كاتژمێری وەستاندن و بۆنەمەنی (وەك عەتر)و بەرامەی خۆراك و توێكڵی میوەو پیاز بەكاربهێنە، بۆ ئەوەی ئەو كاتانە بنووسیت كە ئەو بۆن و بەرامانە پێیان دەگەنە لووتت، تێبینی و سەرنجەكانت دەربارەی خێرایی بڵاوبوونەوەی پێكهێنەكانی ئەو بۆنەمەنییانە لەو خشتەیەی خوارەوەدا بنووسە، سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی دەستت كەوتوون، بۆ دۆزینەوەی پێكهاتنی كیمیایی هەندێ ئاوێتەی زانراو بەكاربهێنە، ئەوسا مۆڵە بارستەی ئاوێتە نەناسراوەكانی تر بدۆزەرەوە و لە خشتەكەدا بیاننووسە، بە بەراوردكردنی خێرایی بڵاوبوونەوە لەگەڵ مۆڵە بارستەی ئەو ماددانەدا، بگەرە ئەو زانیاری و بۆ دەركەوتنانەی دەتەوێت و لە خانەی تێبینییەكانی خشتەكەدا بیاننووسە.

| ماده | كاتی بڵاوبوونەوە | مۆڵە بارستە (تێكرای بارستە مۆڵ) | تێبینی |
|---|---|---|---|
| بۆنەمەنی عەترەمەنی | | | |
| بەرامەی خۆراك | | | |
| توێكڵە پرتەقاڵ | | | |
| توێكڵە سێو | | | |
| پیاز | | | |
| سیر | | | |
| ئەسیتۆن | | | |
| ئیثەری دوانەئەثیل | | | |

**تێبینی:** كە كات دەنووسیت، با بە یەكسانی لەو ماددانە دوور بن.

بەندی 6

# شل و مادده ڕەقەکان



گشتە ڕێزکردنی سێ دووری تەنۆکەکانی بلوور، ئەوەی پێکهاتنی بلووری پێ دەڵێن، پیشان دەدات

کەرتی 6-1

# شلەکان

## نیشانەکانی ڕاپیکاری

- باسی جووڵەی تەنۆکەکانی شل و تایبەتمەندییەکانی شل دەکات بەپێی بیردۆزی گەردە جووڵە.
- ئەو کردە دەناسێنێ کە شلی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ گازدەناسێنێت.
- ئەو کردەیە ڕوون دەکاتەوە کە شلی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ ماددەی ڕەق.

ئەو ئاوەی، شەپۆلەکانی لە کەناری دەریا دەسوێ و ئەو گرتاوەی خۆی لە دەمی گرکانێك ڕادەپسکێنێت، دوو نموونەی ماددەن لە دۆخی شلدا و کەبیر لە ئۆقیانووسەکانی گۆی زەوی و دەریاچە و ڕووبار گۆم و چەم زۆر شلی تر دەکەیتەوە کە ڕۆژانە دەیانبینێت دەکەوێتەوە، ڕەنگە باوەر نەکەیت کە شلەکان دۆخی کەمترین باوی دۆخەکانی تری ماددەن ، کە لەم گەردوونەدا هەن شلەکان لەمادە ڕەق و گاز و پلازمییەکان کەمتر باون، چونکە مادە لە بوارێکی ڕێژەیی تەسکی پلەی گەرمی و پەستاندا لە دۆخی شلدا دەمینێتەوە و لەم بەشەدا، بە ڕەوشەکانی دۆخی شل ئاشنا دەبیت و بەراوردی دەکەیت لەگەڵ ڕەوشی هەریەکەی مادده ڕەق و گازەکان و گفتوگۆ لەسەر ئەم ڕەوشانە دەکەیت و بیردۆزی گەردە جووڵە بەکاردەهێنێت.

## ڕەوشەکانی شل و بیردۆزی گەردە جووڵە

دەتوانرێت بڵێین: شل ئەو ماددەیەیە، کە قەبارەکەی جێگیرە و شێوەی ئەو دەفرە دەگرێت کە تێی دەکرێت و، دەتوانرێت لە تایبەتمەندییەکانی شل بگەین، لە ڕێی کارپێکردنی بیردۆزی گەردە جووڵەوە بەرچاوکردنی جووڵەی ئەو گەردانە و ڕێزبوونیان و هێزەکانی یەکتر ڕاکێشان لە نێوانیاندا.

هەروەك لە گازەکاندا تەنۆکەکانی شلیش یەکبینە دەجووڵێن و نزیکی تەنۆکەکانی شل زیاترە لە تەنۆکەکانی گاز، بەڵام جووڵە وزەیان کەمترە، بۆ یە هێزی یەکتر ڕاکێشانی تەنۆکەکانی شل کاریگەرترە لە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانی گاز و، ئەم یەکتر ڕاکێشانەی نێوان تەنۆکەکانی شل دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزی یەکتر ڕاکێشانە نێوانییەی لە پۆلی دەدا گفتوگۆی لەسەر کرا، کە هێزی دوو جەمسەری – دوو جەمسەری و هێزی پەرتبوونی لەندەن و هایدرۆجینە بەندەکان.

شلەکان ڕێك و پێك ترن لە گازەکان، چونکە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکە کانی شل گەورەترە و جووڵە یان خاوترە و، بەپێی بیردۆزی گەردە جووڵەی شلەکان، ئەو تەنۆکانە نە بەستراون بە شوێنی جێگیرەوە، بەڵکو یەکبینە دەجووڵێن، ئەم جووڵەی تەنۆکانە، هۆی ناونانی گاز و شلە بە (ڕژۆکەکان)، ڕژۆك **fluid ئەو ماددە ڕژۆکەیە کە شێوەی ئەو دەفرە دەگرێت** کەتێی دەکرێن، زۆربەی شلەکان بەرە خوار دەجووڵێن بە هۆی کاریگەری ڕاکێشانی زەوییەوە، بەڵام هەندێکی تریشیان بە ئاقاری تردا دەجووڵێن، بۆ نموونە هیلیۆمی شلکراوە لە پلەی نزیکە سفری ڕەهادا (پەتیدا)، جیاکەرەوەیەکی نا ئاسایی تێدا دیاری دەدات، کە ڕەوینی بەرە و ژوورە نەك بەرە و خوار.

## چڕییەکی لە چاوخۆدا بەرز

لە ژێر پەستانی کەشی ئاساییدا، شلەکان هەزاران جار چڕترن لە گازەکان و، هۆی ئەو بەرزییە لە چڕی شلدا، لێك نزیکی تەنۆکەکانییێتی، بەڵام چڕی زۆربەی شلەکان، کەمترە ( نزیکەی %10 ) لە چڕی ماددەڕەقەکان و، ئاو بەوە جیا دەکرێتەوە کە لەو ماددەکەمانەیە، لەکاتی ڕەقبوونیدا چڕییەکەی کەم دەکات وەك لە داهاتوودا دەیخوێنیت ( کەرتی6-4 )

لە پلەی گەرمی و پەستانی جێگیردا شلە جۆربەجۆرەکان چڕییان جیاوازە و شێوە 6-1 چڕی جیاوازی هەندێ شل وڕەق پێشان دەدات و تەنانەت شلەکان چینی لەیەك جیا پێك دێنن.

## نەپەستێورانی ڕێژەیی

کاتێك پەستانی شلێك بەرز دەکرێتەوە، لەپلەی گەرمی ژووردا، بۆ 1000 atm قەبارەکەی%4 کەم دەکات، ئەمەیش بەسەر هەموو شلەکاندا کاری پێ دەکرێت و بەسەر ماددە ڕەقەکانیشدا بەڵام گازەکە بە پێچەوانەی ئەوەوە، قەبارەکەی لە ژێر پەستانی 1000 atm دەبێتە 1/1000 ی قەبارە بنەرەتییەکەی لەژێر کەشە پەستانی ئاساییدا، کەواتە شلەکان کەم پەستێوراوترن لە گاز، چونکە تەنۆکەکانی شل سفت ترن لە تەنۆکەکانی گاز، سەرباری ئەوەیش شلەکان دەتوانن پەستان بگوێزنەوە بۆ هەموو لایەك بە شێوەیەکی یەکسان.

## توانستی بڵاوبوونەوە

لەبەندی 4 باس کراوە کە گازەکان بڵاودەبێتەوە و تێکەڵ دەبێت لەگەڵ تەنۆکەکانی گازەکانی تر، هەروەها تەنۆکەی شلەکان پێکدا بڵاو دەبنەوە لەگەڵ تەنۆکەی شلەکانی تردا وەك لە شێوەی 6-2 دا دەردەکەوێت، هەر شلێك کە وردە وردە بەناو شلێکی تردا بڵاو دەبێتەوە ڕەنگە تێیدا بتوێتەوە، بڵاوبوونەوەی شلەکان بەهۆی بەهەموو لایەکدا جووڵەی تەنۆکەکانەوە ڕوودەدات بەڵام بڵاوبوونەوەی شلەکان خاوترە، لە بڵاوبونەوەی گازەکان بەهۆی لێك نزیکی تەنۆکەکانی شلەوە و بوونی هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانیەوە، بەڵام هەرچەندێك پلەی گەرمی شل زیاد بکات، بڵاوبوونەوەی زیاددەکات، چونکە تێکرای جووڵەوزەی گەردەکان و تێکرای خێراییش زیاد دەکات .



**شێوە 6-1** شێوەکە چەند شل و مادەیەکی ڕەق پێشان دەدات کە چڕی هەمە جۆرن، شلە چڕترەکان لە ژێرەوە و چڕی کەمترەکان لەسەرەوە (شلەکان ڕەنگیان تێ کراوە، بۆ ئەوەی چینەکان ئاشکرابن.

**شێوە 6-2** وەك گازەکان، ئەو دوو شلەی لەم شێوەیەداپێشان دراون، بڵاودەبنەوە پاش ماوەیەك دڵۆپە مەرەکەبێکی سەوز، بە ئاوەکەدا بڵاو دەبێتەوە تاکو دەیکاتە گیراوەیەکی ڕەنگی چۆنیەك.








## ڕووە گرژی

ڕووە گرژی **surface tension** هێزێکە ئارەزوو دەکات بەشەکانی ڕووی شل پێکەوە ببەستێ. بۆ کرژبوونی ڕووبەری ڕووی شل تا کەمترین بڕ، ئەوەیش ڕەوشێکی باوە لە هەموو شلێکدا، ڕووەکرژی، لە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانی شل پێك دێت و، هەرچەندێك ئەم هێزی ڕاکیشانە زۆرتر بێت، ڕووە کرژی زۆرتر دەبێت. ئاو بەرزترین هێزی ڕووەکرژی هەیە لە ناو زۆربەی شلەکاندا، بە هۆی ئەو هایدرۆجینە بەندانەوە کە گەردەکانی ئاو لە نێوانی خۆیاندا پێکی دەهێنن، بەڵام ئەو گەردە ئاوانەی دەکەونە سەر ڕووی ئاوەکەو، بەهایدرۆجینە بەند، لکاون بە گەردە ئاوەکانی دەوروبەریانەوە نالکێن بە گەردە هەواکانی ژوور خۆیانەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا گەردە کانی سەر ڕوو بەرەو یەکتر و بەرەو ناوەوە ڕادەکێشرێن، ڕووەکرژییەکی زۆر پەیدا دەکەن، بۆیە دڵۆپە ئاوەکان گۆیی (خڕ) دەبن، چونکە ڕووبەری شێوەی گۆیی لە هی تر کەمترە بە پێی قەبارەیەکی دیاریکراوو، شێوە 6-3 ، نموونەیەکی ئەو دیاردەیە ڕوون دەکاتەوە.

موویینە کاریگەری **capillary action** واتە، ڕاکێشرانی ڕووی شلێك بۆ ڕووی **ماددەیەکی** ڕەق، کە دیاردەیەکی پێوەندی بە تینە بە دیاردەی ڕووکرژییەوە، شل بە لوولە زۆر باریکەکاندا بەرزدەبێتەوە، کاتێك یەکتر ڕاکێشان لە نێوان گەردەکانی و گەردەکانی ڕووی لوولەکەکەدا بە هێز دەبێت ئەم یەکتر ڕاکێشانە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی گەردەکانی شل بەرە و ژوور، بە پێچەوانەی کاریگەری ڕاکێشانی زەوی ئەم بارەیش بەردەوام دەبێت تاکو ئەم یەکتر ڕاکێشانە لەگەڵ کێشی شلەکەدا هاوسەنگ دەبێت و **موویینە کاریگەری** لە نێوان گەردەکانی ئاوو ریشاڵەکانی کاغەزدا ڕوودەدات، وەك لە شێوە 6-4 دا پێشان دراوە، موویینە کاریگەری، کردەی گواستنەوەی ئاو لە ڕەگی درەختەوە بۆ گەڵاکانی دەدرێتە پاڵ، ئەگەر بەشەکیش بێت و، ئەم دیاردەیەیش هۆی چاڵ بوونی ڕووی ئەو شلەیەی meniscus کەلە بۆری تاقیکردنەوە و بۆرییە پلە کراوەکاندا پەیدادەبێت.

هێزی ڕاکێشانی سەرگەردێکی ڕووەکە

هێزی ڕاکێشانی سەرگەردێکی ناوەکی شلەکە

**شێوە 6-3** لە ئەنجامی ڕوو کرژیدا، شلەکان دڵۆپی خڕ پێك دێنن.

## هەڵماندن و کوڵان

بەکردەی گۆڕینی شل بۆ گاز دەڵێن هەڵماندن **vaporization** ، بەڵام هەڵمین **evaporation** ئەو کردەیەکە تەنۆکەکانی ڕووی شل پێش کوڵان لە ڕووی شلەکە دەرباز دەبن و دەچنە دۆخی گازەوە.



( أ )



(ب)

**شێوە 6-4** یەکتر ڕاکێشانی نێوان. گەردە ئاوە جەمسەردارەکان و گەردەکانی سیلیلۆزی جەمسەردار لە ریشاڵەکانی کاغەزدا، دەبێتە هۆی پاڵنانی ئاو بۆ سەرەوەی کاغەزەکە، هەروەها مەرەکەبی لە ئاودا تواوە کە لەبنی کاغەزەکەی (أ) دانراوە، لەگەڵ ئاوەکە بەرزدەبێتەوە وەك لە (ب) دا پێشان دراوە کە مەرەکەبە کە بە کاغەزەکەدا بەرز دبێتەوە، پێکهێنەکانی جیا دەبنەوە بۆ گورزەی ڕەنگاوڕەنگ، هۆی جیابوونەوەی پێکهێنەکانی ئەوەیەکە هەریەکەی ئاو و کاغەز، گەردەکانی پێکهێنەکانی مەرەکەبەکە بە شێوەیەکی جیاواز ڕادەکێشن، ئەم دیاردەیە لە کردەکانی جیاکردنەوەی کیمیایی (کاغەزی کرۆماتۆگرافی) دا بەکار دەهێنرێت، کە لەم شێوەیەدا پێشان دراوە.

که بڕێکی کەم شلەی بڕۆم بکەینە کەمۆڵەیەکەوە، وەك شێوە 6-5 ، هەوای سەربڕۆمە شلەکە لە چەند خولەکێکدا دەبێتە ڕەنگێکی قاوەیی سووربـاو، چونکە هەندێك لە گەردەکانی بڕۆم لە ڕووی شلەکە دەردەپەڕێت و دەچێتە دۆخی گازەوە، واتە دەگۆڕدرێت بۆ هەڵمی بڕۆم کە تێکەڵی هەواکە دەبێت، هەمان دیاردە دووبارە دەبێتەوە کە عەترێك بکەیتە سەر بەری دەست، لە چەند چرکەیەکدا بۆنی دەکەیت چونکە گەردەکانی بۆنەکە دەهەڵمێت لە پێستەکەوە و بەهەوادا بڵاودەبێتەوە و خانەکانی بۆنکردن لە لووتدا دەیانقۆزنەوە هەڵمین بۆیە ڕوودەدات چونکە تەنۆکەکانی شل کە جۆرەها جووڵە وزەیان تێدایە، تەنۆکە وزە بەرزترەکان لەوانی تر خێراتر دەجووڵێن و، ڕووە تەنۆکەکان کە گەورەترین جووڵە وزەیان هەیە، بەسەر هێزە نێوانیەکانیاندا زاڵ دەبێت کە دەیبەستێتەوە بە شلەکەوە و دەربازدەبێت بۆ دۆخی گاز.

هەڵمین، لە دیاردە گرنگەکانی سروشتە، هەڵمین، شیرناوی ڕووی دەریا و ئۆقیانووسەکان لادەبات خوێیەکەی زۆر لە دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت، لە ناوچە نیمچە کەمەرەییەکاندا ، هەڵمین زۆر ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی زۆربوونی سوێری لە ئاوە ڕووەکییەکاندا، هەموو ئەو ئاوانەی دەکەونە سەر زەوی بە شێوەی باران و بەفر، لە بنەڕەتدا ئاوی هەڵمیون لە ئۆقیانووس و دەریاچە و ڕووبارەکانەوە، هەڵمینی ئارەق لە پێستەوە زۆر کاریگەرە لە فێنککردنەوەی لەشدا، ئەو ئارەقەی کە لە بنچینەدا لە ئاو پێك دێت، کە گەرمی لەش دەمژێت لە کاتی هەڵمینیدا، لەش سارد و فێنك دەکاتەوە، مژینی گەرمە وزە لە پێست، گەرمییەکەی کەم دەکاتەوە.

کوڵان، کردەی گۆڕانی شل بۆ بڵقی هەڵم کە بە ئاشکرا لە شلەکەدا دیارە کوڵان لەگەڵ هەڵمیندا جیاوازە وەك لە کەرتی 6-3 دا دەبینیت.

## پێکهاتنی ماددە ڕەقەکان

کە شلەیەك سارد دەکرێتەوە، تێکڕای جووڵە وزەی تەنۆکەکانی کەم دەکات کاتێك ئەو وزەیە زۆر کەم دەکات، تەنۆکەکانی شل ڕیز دەبێت، بە هۆی هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانیانەوە، لە بارێکی ڕێك و پێکتردا و ماددەکە دەگۆڕدرێت بۆ دۆخی ڕەق، بەو دیاردەیەی کە فیزیاییانە شلی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ ڕەق کەلە کاتی ساردکردنەوەیدا، دەڵێن بەستن **freezing**. ، لە نموونە باوەکانی بەستن، گۆڕانی ئاوە بۆ بەفر لە پلەی گەرمی سفری سەدیدا $0^oC$ . نموونەیەکی باوی تر هەیە، ئەویش ڕەقبوونی پارافینە لە پلەی گەرمی جیاوازدا، ئیثانۆڵ لە پلەی گەرمی $-115^oC$ دا دەیبەستێ، لە کاتێکدا جیوە، لە پلەی گەرمی $-38^oC$. دا دەیبەستێ.




**شێوە 6-5** شلی بڕۆم $Br_2$ ، لە پلەیەکی نزیك پلەی گەرمی ژووردا دەهەڵمێت. گازە قاوەییە سووربـاوەکە بەهەواکە دا بڵاو دەبێتەوە لەسەر ڕووی شلەکە.

## پێداچوونەوەی کەرتی 6-1

**1.** باسی دۆخی شلی بکە، لە ڕێی تێگەیشتنەوە لە بیردۆزی گەردە جووڵە.

**2.** ڕەوشەکانی شل بژمێرە.

**3.** بیردۆزی گەردە جووڵە، چۆن ئەم ڕەوشانە لێك دەداتەوە

( أ ) چڕی بەرز (ب) توانستی بڵاوبوونەوە

( ج ) توانستی هەڵمین

**4.** هۆی پەیدابوونی ڕوویەکی چاڵ لە بۆرییەکی تاقیکردنەوەدا ڕاڤە بکە.

**5.** هەڵماندن و هەڵمێن بەراوردبکە.

## کەرتی 2-6

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- باسی جووڵەی تەنۆکەکانی مادده ڕەقەکان و تایبەتمەندی ئەم ماددانە دەکات بەپێی بیردۆزی گەردە جووڵە.
- دوو جۆرە ماددەی ڕەق جیادەکاتەوە.
- باسی جۆرەکانی لێکچوونی بلوری دەکات وبلووره پێکهاتن و یەکەی خانە پێ دەناسێت

# ماددەی ڕەق

«ڕەقە وەك بەرد» دەربڕینێکی باوە باسی شتێکی سەخت دەکات کە نەرم نابێتەوەو و شێوە و قەبارەیەکی جێگری هەیە.
لەم کەرتەدا رەوشەکانی مادەی رەق دەزانین و بەراوردی دەکەین لەگەڵ رەوشەکانی هەریەك لە مادەی شلەکان و گازەکان. رەوشەکانی مادەی رەق وەك بارەکانی تری مادە لێك دەدرێتەوە لەسەر بنچینەی بیردۆزی جووڵەی گەردەکان.

## تایبەتمەندییەکانی مادده ڕەقەکان و بیردۆزی گەردە جووڵە

تەنۆکەکانی ماددەی ڕەق سفتترن لە تەنۆکەکانی شل یان گاز، بۆیە هێزە نێوانییەکانی تەنۆکەکانی ماددەی ڕەق لەوانی تر کاریگەرترن، هێزی یەکترڕاکێشانی دوو جەمسەر – دوو جەمسەر و هێزەکانی پەرتبوونی لۆندن و، هایدرۆجینەبەند، زۆرتر کار لە مادده ڕەقەکان دەکەن وەك لە شل و گازەکان، ئەم هێزانە ئارەزوو دەکەن ئەو تەنۆکانە لە شوێنی خۆیاندا بچەسپێنن، بەڵام هەر بە جووڵۆکی دەمێننەوە لە دەوری چەند خاڵێکی دیاریکراودا دەلەرێنەوەو، لەبەرئەوەی جووڵەی تەنۆکەکان بەم ڕێگەیە بەستراوە، مادده ڕەقەکان لە شلەکان ڕێك وپێك تر دەبن و زۆر ڕێك و پێکتر دەبن لە گازەکان، لە شێوە 6-6 وردببەرەوە.

**شێوە6-6** تەنۆکەکانی سۆدیۆم لە هەرسێ دۆخەکەدا، سۆدیۆم لەباری گازدا لە گڵۆپی هەڵمی سۆدیۆمدا هەیە.






دوو جۆر ماددەی ڕەق هەن، مادده ڕەقە بلوورییەکان. و مادده ڕەقە نابلوورییەکان زۆربەی مادده ڕەقەکان **crystaline solids** ، کە لە بلوور **crystal** پێکدێن و ئەو مادانەن تێیدا تەنۆکەکان بەشێوەی ئەندازەیی ڕێکوپێك و چەند بارەوەوە بوو ڕیز دەبن، ماددەی ڕەقی نابلووری **amorphous solid** ئەو ماددانەن کە تەنۆکەکانیان بەشێوەیەکی نارێك و کوێرانە ڕیز دەبن، وەك شوشە و گونجۆك (پلاستیك)، هەردوو جۆرە مادده ڕەقەکە دواتر لێی دەدوێین.

## شێوە و قەبارەی دیاریکراو

بە پێچەوانەی مادده شل و گازەکانەوە، مادده ڕەقەکان شێوەیەکی دیاریکراویان هەیە، سەرباری ئەوە، مادده ڕەقە بلوورییەکان ئەندازەییانە ڕێکخراون و تەنانەت تەلەزمەکانیان شێوەی ئەندازەیی ڕێك و پێك وەردەگرن کە ڕەنگدانەوەی پێکهاتنێکی ناوەکی ڕێکوپێکە. مادده ڕەقە نابلوورییەکان بۆ نموونە، شێوەیەکی نەگۆڕیان هەیە، بەڵام شێوەکەی لە شێوەی ئەندازەیی جیاو دیاری مادده بلوورییەکان جیاوازە، بۆ نموونە: دەتوانرێت شووشە بە شێوەی ئەندازەیی جیاواز دابڕێژین، بەڵام کەشکا، شێوەی جیاواز و نارێك وەردەگرێت.

قەبارەی ماددەی ڕەق کەمێك دەگۆڕدرێت لەکاتی گۆڕانی پەستان یان پلەی گەرمیدا، بەڵام مادده ڕەقەکان بەگشتی قەبارەیان جێگیرە چونکە تەنۆکەکانی زۆر سفتن، بەڵام بۆشایی نێوانی زۆر وردیان تێدایە کە دەشێ ئەویش بپەستێورێت و، مادده ڕەقە بلوورییەکان ئاسایی نارەون(نارژێن)، چونکە تەنۆکەکانیان لە شوێنی جێگیردا پێکەوە بەندن لە نێوان خۆیاندا.


( أ )



(ب)

**شێوە 7-6** (أ) وێنەیەکی بە وردبینی ئەلەکترۆنی پێوراو (SEM)ی بلووری کلۆریدی سۆدیۆم. (ب) دەتوانرێ بلوورەکە، لە ڕێی پێکهاتنی بلوورییەوە، کە لە یەکەی تاکی سێ دووری پێکهاتووە، وەك خانە، لێرەدا یەکێك لەو خانانە پیشان دراوە و بەسوور دیاریکراوە.

## پلەی شلەوەبوونی دیاریکراو

شلبوونەوە **melting** کردەی گۆڕانی فیزیایی ماددەیە، بەگەرمی، لەدۆخی ڕەقییەوە بۆ شلی و بەو پلە گەرمییەی ڕەقی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ شل دەڵێن پلەی شلبوونەوە **melting point** ، لەو پلە گەرمییەدا، جووڵە وزەی تەنۆکەکانی ماددەی ڕەق بەسەر ئەو هێزی ڕاکێشانەدا زاڵ دەبێت کە پێکیانەوە دەبەستێ و لە شوێنەکانیان دەردەپەڕن لەو مادده ڕەقە بلووریانەی بە پلەی شلبوونەوەی دیاریکراو جیادەکرێنەوەو بە پێچەوانەشەوە، مادده ڕەقە نابلوورییەکان پلەی شلبوونەوەی دیاریکراویان نییە، بەڵکو توانستی ڕەوینیان هەیە لە بوارێکی دیاریکراوی پلەی گەرمیدا، بۆیە مادده ڕەقە نابلوورییەکان، هەندێجار بەشلە زۆر ساردکراوەکان دەپۆلێنرێت **supercooled liquids** و مەبەست لەوەیش هەموو ئەو ماددانەی هەندێ ڕەوش و تایبەتمەندیی شلەکان لە خۆیدا دەپارێزیت، ئەگەرچی لە پلەی گەرمی دیاریکراودا ڕەقیش بن، هۆی ئەم ڕەوشەیش کوێرانە ڕێز بوونی تەنوکەکانی مادده ڕەقە نابلوورییەکاندا، کە لە ڕێزبوونی شل دەچێت، لێرەدا جیاوازی نێوان شلە ڕاستەقینەکان و مادده ڕەقە نابلوورییەکان ئەوەیە، کە تەنۆکەکانی مادده ڕەقە نابلوورییەکان هەمیشە شوێنی خۆیان ناگۆڕن، وەك لە شلەکاندا ڕوودەدات.

## چڕییەکی زۆرو نەپەستێوران

مادده لەوپەڕی چڕیدا دەردەکەوێت کە لە دۆخی ڕەقیدا بێت، مادده ڕەقەکان، چڕییان کەمێك لە چڕی شلەکان زیاترە و لە چڕی گازەکان زۆر زیاترە. هۆی ئەمە چونکە تەنۆکەکانی ماددەی ڕەق سفت ترە لە تەنۆکەکانی ماددەی شل و گازیش. کەمترین مادەی ڕەق چڕی هەیە بریتی یە لە هایدرۆجینی ڕەق، کە چڕییەکەی 1/320 ی چڕی ئۆزمیۆمە (Os)، کە چڕترین توخمی هەموو توخمەکانە.



فلۆریتی شەش پاڵو



چالکۆ پایرایتی
شێوە چواری

زمرووتی شێوە
شەشی



کالسیتی سیانە
لێکچوون



ئاراگۆنایتی لەبزینەیی
لەسەر یەك ستوون

ئازۆرایتی یەکەلادان



ڕۆدۆنایتی سیانە
لادان

**شێوە6-8** حەوت جۆرە سیستەمە بلوورییەکەو، نموونەکانی هەریەکەیان
**تێبینییەکی گرنگ**: ئەم نموونەو وێنانە تەنیا بۆ سەیرکردنە و هیچی تر.

لەلایەکی تریشەوە، مادده ڕەقەکان لە مادده شلەکان کەم پەستێوراوترن، بەڕادەیەك دەتوانین بە نەپەستێوراوی دابنێین incompressible هەندێ ماددەی ڕەق، وەك دارو تەپەدۆڕ وا دەردەکەون کە دەپەستێورێن، بەڵام لە ڕاستیدا وا نین، ئەم ماددانە کەلێنی پڕ هەوایان تێدایە و کە بکەونە بەر توند پەستاوتن، کەلێنەکان دەپەستێورێن و ماددەی دارو تەپەدۆڕەکە ناپەستێورێن.

## تێکڕای بڵاوبوونەوەی کەم

لەکاتی بەستنی دەپێکی زینك بە دەپێکی مسدا، بۆ ماوەیەکی درێژ، هەندێ گەردیلەی هەریەکەی ئەو دوو ماددەیە، بەناو یەکتردا بڵاودەبنەوەو ئەمەیش دەری دەخات کە بڵاوبوونەوە لە مادده ڕەقەکانیشدا یان لە ناو خۆیاندا ڕوودەدات، بەڵام تێکڕای ئەو بڵاوبوونەوەیە، ملیۆنەها جار خاوترە لە هی شل و گازەکان.

## مادده بلوورییەکان

مادده ڕەقە بلوورییەکان، یان بەشێوەی بلووری تاکن، یان کۆمەڵە بلووری یەکگرتوو، کە بە ڕیزبوونی گشتی سێ دووریی تەنۆکەکانی بلوور دەڵێن: بلوورە پێکهاتن **crystal structure**، ڕیزبوونی تەنۆکەکان لە بلووردا بە شێواز(سیستم)ێکی پێکەوە بەستران پیشان دەدرێن، کە پێی دەڵێن تۆڕ lattice و بە بەشە بچووکترە بابەتییە سێ دوورییەکەی سیستمی تۆڕی بلووریی ئەو ماددەیە دەڵێن یەکەی خانە **unit cell** ئاسایی، تۆڕی بلووری چەند یەکەیەکی خانەیی لەسەر یەك ڕێزکراوی تێدایە، شێوە 6-7، پەیوەندیی نێوان تۆڕ و یەکەی خانە پێکهێنەکانی دەردەخات و بلوور و یەکەخانەییەکانی، جۆرێك لە حەوت جۆر لێکچوونی ئەندازەیی وەردەگرن.

**خشتە 1-6** شلبوونەوە و كوڵانی چەند نموونەیەكی ماددە ڕەقە بلوورییەكان

| جۆری ماددە | شێوگ | پلەی شلبوونەوە (°C) | پلەی كوڵان لە ژێر mta1 (°C) |
|---|---|---|---|
| ئەیۆنی | NaCl | 801 | 1413 |
| | $MgF_2$ | 1266 | 2239 |
| هاوبەشی تۆڕی | $(SiO_2)_x$ | 1610 | 2230 |
| | ئەلماس $C_x$ | 3500 | 3930 |
| كانزایی | Hg | -39 | 357 |
| | Cu | 1083 | 2567 |
| | Fe | 1535 | 2750 |
| | W | 3410 | 5660 |
| گەردی هاوبەشی (بێ جەمسەر) | $H_2$ | -259 | -253 |
| | $O_2$ | -218 | -183 |
| | $CH_4$ | -182 | -164 |
| | $CCl_4$ | -23 | 77 |
| | $C_6H_6$ | 6 | 80 |
| گەردی هاوبەشی ( جەمسەردار) | $NH_3$ | -78 | -33 |
| | $H_2O$ | 0 | 100 |

ئەم ڕاستییە، وای لە زانایان كرد كە بتوانن بلوورەكان بەپێی شێوەكانیان بپۆلێنن و شێوە 6-8 شێوە و نموونەی ئەو حەوت جۆرە لێكچوونی بلوورییەن.

## هێزەكانی پێكەوە بەستن لە بلوورەكاندا

دەتوانرێت، بەپێی ئەو تەنۆكانەی كە تێیدایەتی و بەپێی جۆری بەندە كیمیاییەكانی نێوان تەنۆكەكانیش، باسی شێوە بلوورییەكان بكەین، بەپێی ئەم ڕێگە پۆلێنییە، چوار جۆر بلوورمان دەبێت وەك لەخشتە 6-1 دا دەردەكەوێت، بگەڕێرەوە بۆ ئەو خشتەیە كە ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە دەخوێنێتەوە:

1. **بلوورە ئایۆنییەكان:** پێكهاتنی بلووری ئایۆنی، ئایۆنی سالیب و هی تری مووجەبیشی تێدایەو بەشێوەیەكی ڕێكوپێك ڕێزكراوە، ئەو ئایۆنانە یان یەك گەردیلەو یان فرە گەردیلەن و بەگشتی بلوورە ئایۆنییەكان لەكاتی یەكگرتنی ئایۆنە فرەگەردیلەكان یان یەككگرتنی گەردیلە ناكانزاییەكان لە كۆمەڵەی 16 یان 17 لەگەڵ كانزاكانی كۆمەڵە 1 یان 2، هێزی پێكەوەبەستنی توندی نێوان ئایۆنە سالیبەكان و ئایۆنە مووجەبەكان، لە پێكهاتنی بلووری بلوورە ئایۆنییەكاندا، ڕەوشی دیاریكراویان دەداتێ، وەك ئەوەی ئەم بلوورانە سەخت و زوو شكاو و پلەی شلەوەبوون بەرز و ماددەی باش دا بڕ دەبن.
2. **بلوورە هاوبەشییە تۆڕییەكان:** ئەم بلوورانە، گەردیلەی بە هاوبەشە بەند پێكەوە بەستراویان تێدایەو، ئەم پێكەوە بەسترانە بەناو ئەو تۆڕەدا درێژدەبێتەوە كە ژمارەیەكی زۆر گەردیەیان تێدایە، لەو بلوورانە، ئەڵماس $C_x$، و كوارتز $(SiO_2)_x$ كەلە شێوە 6-9 دا ڕوونكراوەتەوەو كاربیدی سیلیكۆن $(SiC)_x$ و ئۆكسیدی فرە توخمی گواستراوەو ئەم ماددانە لە بنچینەدا گەردی مەزنن وە ژێرەنووسی $x$ لەو شێوگانەدا ئەوە دەگەیەنێت كە ماددەی نێوان دووكەوانەكە تا ناكۆتا درێژ دەبێتەوەو بەزۆری ماددە تۆرە ڕەقەكە، زۆر سەخت زووشكاو و پلەی شلەوەبوون بەرزو نەگەیێن یان نیمچە گەیێنە.

3. **بلووره کانزاییەکان**: پێکهاتنی بلووریی کانزای، گەردیلەی کانزای تێدایە کە بە دەریایەك ئەلەکترۆنی هاوهێزی دەورە دراوە، سەرچاوەی ئەو ئەلیکترۆنانە گەردیلەی کانزایە، کە بەگشتی هی بلوورەکەیە ئازادی جوولەی ئەلیکترۆنە دەرەکییەکان لەسەر هەموو بلوورەکە، پلەی گەیاندنی کارەبایی بەرزی ئەم کانزایانە لێك دەداتەوە، ئەوەی لە خشتە 6-1 دا دەیبینین، پلەی شلەوەبوونی بلووره کانزاییە جیاوازەکان بەشێوەیەکی گەورە لێك جیاوازن.

4. **بلووره گەردیلە هاوبەشەکان**: پێکهاتنی بلووری ماددە گەردییە هاوبەشەکان، گەردی هاوبەشی بەهۆی هێزی نێوانی پێکەوە بەستراوی تێدایە، ئەگەر گەردەکان بێ جەمسەربن وەك گەردی هایدرۆجین $H_2$ یان میثان $CH_4$ یان بەنزین $C_6H_6$ ، تەنیا هێزی پەرتبوونی لەندەنی لاوازیان لە نێواندایە، بەلام بلووره گەردییە جەمسەردارەکانی وەك گەردی ئاو $H_2O$ و ئامۆنیا $NH_3$ ، گەردەکان تێیاندا بەهێزی دووجەمسەری–دووجەمسەری تا رادەیەك بەهێز، و جاروباریش بە هایدرۆجینە بەندی بەهێز پێکەوە بەستراون. و ئەو هێزانەی گەردە بێ جەمسەرو جەمسەردارەکان پێکەوە دەبەستن لە پێکهاتنی بلووریدا لە هاوبەشە بەندی کیمیایی نێوان گەردیلەکانی گەردێك لاوازترن. لەبەرئەوە بلووره گەردییە هاوبەشییەکان، پلەی شل بوونەوەیان نزمە، کە وای لێدەکات ئاسان هەڵمیون جگە لەوەی ناسکن و دابڕی باشن، گرنگترین نموونە لەسەر بلووره گەردییە هاوبەشییەکان، بلووری سەهۆڵ، کە دواتر بە درێژی باسی دەکەین



**شێوە 6-9** بلوورێکی هاوبەشی تۆڕی، کە تۆزێکی ماددەی رەقی سێ دووری تێدایە، وەك کوارتز $(SiO_2)_x$ کە لەم شێوەیەدا دیارە بە پێکهاتنە گەردیلەی بەسێ دوورییەکەیەوە.

## ماده ڕەقە نابلوورییەکان

زاراوەی نابلووری لە واژەی amorphous ی لاتینیەوە، وەرگیراوە، واتا «بێ شێوە»، ئەم ماددانە، بە پێچەوانەی ماددە ڕەقە بلوورییەکانەوە، شێوەیەکی ڕێکوپێکی نییە لەسروشتدا. ئەم ماددانە، شێوەیەکی یەکگرتووی هەیەو ماوەیەکی دووردرێژ دەمێنێتەوە، بەلام هەندێکیان زۆر بە خاوی ئارەزووی ڕەوین دەکەن، لە هەندێ شووشەی پەنجەرەی کۆنەوە، دەردەکەوێ شووشەکە لە بنی پەنجەرەکەوە ئەستوورترە وەك لەسەرووی کە نیشانەی ئەوەیە شووشەکە، بە تێپەڕینی کات بەرە و خوار ڕەویوە، شووشە، کۆمەڵێکی نموونەی ماددەی ڕەقی نابلووری پێکدێنێت وبە سارد کردنەوە ماددەی شلەوەبوو دروست دەکرێت، بەلام بەرێگەیەك بلوورەکەی تێدا تەواو نابێت، بەڵکو لە باری نابلووریدا دەیهێڵێتەوە. سەدان جۆر شووشە و گونجۆك (پلاستیك)هەیە، هەریەکەیان هەزاران کارپێکردنی گرنگی هەیە بۆ نموونە شووشە نزیکەی لە هەموو شتێکدا بەکاردێت، لە پەیکەری ئەو ئاوێتانەوە کە لە ڕیشاڵی شووشە دروستکراون، تا دەگاتە ئەو ڕیشاڵە بینایانەی ڕووناکی بەکاردێنن بۆ گواستنەوەی گفتوگۆ تەلەفۆنییەکان.

## پێداچوونەوەی کەرتی 6-2

1. باسی دۆخی ڕەق بکە بە پێی بیردۆزی گەردە جووڵە.
2. جیاوازی چییە لە نێوان ماددەی ڕەقی نابلووری و ماددەی ڕەقی بلووریدا.
3. ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی ماددەی ڕەق راڤە بکە: (أ) قەبارەی دیاری کراو، (ب) چڕی بەرزی ڕێژەییانەی ماددەی ڕەق (ج) تێکڕای بلاوبوونەوەی زۆر هێواش.
4. چوار جۆرەکەی بلوورەکان بەراورد بکە.

## کەرتی 3-6

### نیشانەکانی ڕاییکاری

- پێوەندی نێوان هاوسەنگی و گۆڕانی دۆخی فیزیایی مادده، ڕوون دەکاتەوە.
- پێشبینی گۆڕانی هاوسەنگی دەکات بەبەکارهێنانی باوەری لوشاتلی.
- مەبەست لە هەڵمە پەستان ڕوون دەکاتەوە.
- باسی کوڵان و بەستن و شلبوونەوە دەکات.

# گۆڕانی دۆخ

مادده لە سروشتدا، لە یەکێك لەم دۆخانەدا دەبێت: ڕەقی، شلی، گازی و، مادده دەتوانێت لە دۆخێکەوە بگۆردرێت بۆ دۆخێکی تر، خشتە 2-6 گۆڕانە شیاوەکانی دۆخی مادده دەردەخات، لەم کەرتەدا لەو گۆڕانە دەدوێن و بەو هۆکارانە ئاشنا دەبین کە دیارییان دەکەن.

## هاوسەنگی

هاوسەنگی **equilibrium** بارێکی دینامیکییە کە بە دوو تێکڕای یەکسان تێدا ڕوودەدات و دوو گۆڕانی پێچەوانەن لە سیستمێکی داخراودا لەم سیستەمەدا مادە ناتوانێت بێتە ناوی یان دەربچێت بەڵام ووزە دەتوانێت ئەمە بکات دەتوانین باری هاوسەنگی داینەمیکی بە شوێن مەلەیەکی گشتی لە ڕۆژێکی هاویندا بچوێنین، لەبەیانیدا، ژمارەی مەلەوانە هاتووەکان زۆرترە لە ڕۆیشتووەکان، بۆیە تابێت شوێنە کە جەنجاڵتر دەبێت، واتە سیستەمەکە هاوسەنگ نابێت، لە نیوەڕۆدا کە ژمارەی هاتووان یەکسان دەبێت بە ڕۆیشتووان، ژمارەی ئەوانەی لە شوێن مەلەکە دەبن ناگۆڕدرێت، لەگەڵ جووڵەی هاتن و چووندا، واتە سیستەمەکە بە هاوسەنگی دەمێنێتەوە.
هاوسەنگی چەمکێکی کیمیایی زۆر گرنگە کە لەم بەندەدا لەگەڵ دۆخەکانی ماددەدا، فێری دەبیت و دواتریش دەبەسترێتەوە بە کارلێکە کیمیاییەکانەوە.

### هاوسەنگی و گۆڕینەکانی دۆخ (بارگۆڕین)

نموونەیەك لەسەر باری هەڵمینی ئاو لە دەفرێکی داخراوی هەواتێدانەهێڵراودا بکە نموونە، وەك شێوە 6-10

**خشتە 2-6 گۆڕانی دۆخ**

| گۆڕانی دۆخ | کردە | نموونە |
|---|---|---|
| ڕەق ← شل | شلبوونەوە | سەهۆڵ ← ئاو |
| ڕەق ← گاز | هەڵچون ( هەڵکشان) | وشکە بەفر ← گازی $CO_2$ |
| شل ← ڕەق | بەستن | ئاو ← بەفر |
| شل ← گاز | هەڵماندن | برۆمی شل ← هەڵمی برۆم |
| گاز ← شل | چڕبوونەوە | هەڵمی ئاو ← ئاو |
| گاز ← ڕەق | نیشێنە چڕبوونەوە | هەڵمی ئاو ← بەفر |




**شێوە10-6** باری هاوسەنگی (شل – هەڵم) لە سیستمێکی داخراودا (أ) لە سەرەتادا تەنیا شلی تێدایە، بەڵام گەردەکان دەست بە هەڵمین دەکەن (ب) هەڵمین،بە تێکرایەکی نەگۆڕ بەردەوام دەبێت، ئەوجا هەندێ گەرد چڕ دەبنەوە بۆ شل (ج) کاتێك تێکڕای هەڵمین یەکسان دەبێت بە تێکڕای چڕبوونەوە، باری هاوسەنگی پێك دێت .

ئەگەر وزەی گەردەکانی ئاوی ڕووی شلەکە ئەوەندە بەرزبۆوەکە بەسەر هێزی کێشی گەردە دراوسێکانیدا زاڵ ببێت، دەهەڵمێت، واتە دۆخی شلی بەجێ دێڵێت و وەك گەردی گاز ڕەفتاردەکات، هەندێ گەردی هەڵمەکە، دەگەڕێتەوە بۆ ڕووی شلەکە و چڕدەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ دۆخی شلی، **چڕبوونەوە** *(خەستبوونەوە)* **condensation** ، ***کردەیەکە، گازی تێدا دەگۆڕێت بۆ شل.***

ئەگەر پلەی گەرمی شل و ڕووبەری ڕووەکەی بەجێگیری مانەوە، تێکڕای هەڵمینی گەردەکانی شل نا گۆڕدرێت، تێکڕای گۆڕانی گەردەکانی ئاو لە دۆخی گازەوە (هەڵم) بۆ دۆخی شل (ئاو) بەستراوە بە خەستی گەردەکانەوە لە دۆخێ گازدا، لەسەرەتادا، خەستیی گەردەکان و تێکڕای خەستبوونەوەیان سفر دەبێت وەك لە شێوە 10-6 ( أ ) دا دەردەکەوێت، وردە وردە و بە بەردەوامبوونی هەڵمین، خەستی گەردەکانی گاز (هەڵم) زۆر دەبێت، ئەو زیادبوونە دەبێتە هۆی زۆربونی خەستبوونەوە (چڕبوونەوە) ، بەڵام ئەم تێکڕایە، لە تێکڕای هەڵمین کەمتر دەبێت، شێوە 10-6 (ب)، لە قۆناغێکی دواتردا، خەستی گەردەکانی هەڵم بەڕادەیەك زۆردەبێت، تێکرای هەڵمین یەکسان دەبێت بە تێکڕای خەستبوونەوە، شێوە 10-6 (ج)، ئەو کاتە باری هاوسەنگی ڕوودەدات و، بڕی شل و گاز یەکسان دەبن.

## هاوکێشەی هاوسەنگبوون

هەمو شلەیەك دەگۆڕێت بۆ هەڵم ئەگەر بڕێکی گونجاو وزەی گەرمی بمژێت و، لەگەڵ هەڵمەکەیدا باری هاوسەنگی پێك دێنێت، بۆ نموونە با ئاو وەربگرین، بۆ ڕوونکردنەوەی باری هاوسەنگی، کە ئاوی شل دەگۆڕێت بۆ هەڵم کاتێك گەرمی لە دەور و پشتی بمژێت، بۆیە دەتوانین هەڵمین، بەم هاوکێشەیە دەربڕین:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightarrow H_2O(g)$$

کـاتـێك هـەڵـم چـڕ دەبـێتـەوە (خـەست دەبـێتـەوە) گـەرمـە وزەی لـێ دەردەپـەڕێت بـۆ دەوروپشتی، بۆیە دەتوانرێت خەستبوونەوە بەم هاوکێشەیە دەرببڕدرێت:

$$H_2O(g) \rightarrow H_2O(l) + \text{گەرمە وزە}$$

و هاوسەنگی ( شل – هەڵم) بەم هاوکیشەیە دەردەبڕدرێت:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightleftarrows H_2O(g)$$

نیشانەی $\rightleftarrows$ لە هاوکێشەکەی پێشوودا گۆڕانێکی پێچەوانەیی پێشان دەدات، ئەمەیش واتە گۆڕان دەشێ بە هەردوو لادا ڕووبدات و، گۆڕانی پێشینە لە چەپەوە بۆ ڕاست وەك خوارەوە دەخوێندرێتەوە:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightarrow H_2O(g)$$

گۆڕانی پێچەوانەیی لە چەپەوە بۆ ڕاست وەك خوارەوە دەخوێندرێتەوە:

$$H_2O(g) \rightarrow H_2O(l) + \text{گەرمە وزە}$$

## باوەڕی لو شاتلیێ

سیستمەکە لەباری هاوسەنگیدا دەمێنێتەوە، ئەگەر شتێك ڕوونەدات ئەو بارە بگۆڕێت، گرنگە، لە و هۆکارە بگەین کە بۆ دابینکردنی باری هاوسەنگی سیستمەکە بەکارهێنراوە لە ساڵی 1888 دا، کیمیاگەری فەڕەنسی هێنری لویس لو شاتلێی گەشەی بە بنەمایەکی ئەم پێشبینییەکرد: چۆن گۆڕانی هۆکارێك، کاردەکاتە باری هاوسەنگیی سیستمێك، دەتوانرێت **بنەمای لوشاتلیێ Le Châtelier's principle** بەم جۆرە دابڕێژرێت: **کاتێك سیستمێك لە باری هاوسەنگیدا دەشێوێت لە ئەنجامی هۆکارێکی کاریگەردا، ئەو سیستمە باری هاوسەنگی نوێ پێك دێنێت، کە لە کاریگەریی ئەو هۆکارە کەم دەکاتەوە تا خوارترین سنوور،** دەشێ هۆکارە کارتێکردووەکە گۆڕانی خەستی یان پەستان یان گەرمی بێت.

## هاوسەنگی و پلەی گەرمی

دەتوانرێت باوەڕی لو شاتلێی بەکاربهێنرێت بۆ پێشبینی چۆنێتی گۆڕانی باری هاوسەنگی (شل – هەڵم)کاتێك دەکەوێتە بەر هۆکارێکی کاریگەر، وەك بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی سیستمەکە لە 25°C بەرز بێتەوە بۆ 50°C ، دەتوانین ئەو هاوسەنگییە بەم گۆڕانە پێچەوانەییەی خوارەوە دەرببڕدرێت:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightleftarrows H_2O(g)$$

بەپێی باوەڕی لو شاتلێی، سیستمەکە دەچێت بە دەنگ ئەو بەرزبوونەوەیەی پلەی گەرمییەوە و لەم بارەدا، گۆڕانی پێشینە گەرمیمژە endothermic واتە وزەی گەرمی دەمژێت. گۆڕانی پێشینە هەوڵی بەرگری بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و کەمکردنەوەی کاریگەری دەدات تا ئەو پەڕی کەمی، ئەویش بەزیادکردنی تێکڕای گۆڕانی پێشینە تا ئەو پەری زۆری، بە پێی گۆڕانی پێچەوانەیی، تا بارێکی هاوسەنگی نوێ پەیدا دەبێت و، خەستی هەڵم لە پلەی گەرمی 50°C دا زۆرترە وەك لە 25°C ، بەڵام لە باری هاوسەنگیدا خەستبوونەوە (پێچەوانە گۆڕان) بە تێکڕایەکی زۆرتر ڕوودەدات وەك لە هی پلەی گەرمی کەمتر.

وادابنێ، پلەی گەرمی سیستمەکە، لەباری هاوسەنگیدا 25ºC بوو، نزم بووەوە بۆ 5ºC، بەپێی باوەڕی لوشاتلێ، سیستمەکە بەرگری لەو نزمبوونەوەیەی پلەی گەرمی دەکات بەزیادکردنی تێکرای گۆڕانی پێچەوانەیی، چونکە گەرمیدەرە exothermic واتە گەرمەوزە دەدات، ئەو کاتە هاوسەنگییەکە بەلای چەپدا لادەدات و لە پلەی گەرمی 5ºC دا جێگیردەبێت و خەستی هەڵمی ئاو ئێستا کەمترە لە پلەی گەرمی 25ºC.

## هاوسەنگی و خەستی

وادابنێ کە بارستەی سیستمە هاوسەنگەکە و پلەی گەرمییەکەی بە جێگیری مایەوە بەڵام قەبارە لە پڕ زیادی کرد، هاوسەنگی چی لێ دێت؟ بە پێی زۆربوونی قەبارە، خەستی گەردەکان کەم دەکات لە باری گازدا (هەڵمدا) و بەو پێیەش تێکڕای خەستبوونەوە دەکەم دەکات، لە ئەنجامی ئەوەدا تێکڕای هەڵمین زیاد دەکات تا دەگاتە بارێکی هاوسەنگی نوێ، کە ژمارەی گەردەکانی شلی تێدا کەم دەکات، خشتە 6-3 گۆڕانی شوێنەکانی هاوسەنگی ڕوون دەکاتەوە لە ئەنجامی کاریگەری هەندێ هۆکاردا لەم گۆڕانەی خوارەوە:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightleftharpoons H_2O(g)$$

**خشتە 6-3** گوێزرانەوەی هاوسەنگی لە گۆڕانی $H_2O(l) + \text{گەرمەوزە} \rightleftharpoons H_2O(g)$

| گۆڕان | لادان |
|---|---|
| شل تێکردن | بەرەوڕاست |
| شل لابردن | بەرەوچەپ |
| هەڵم تێکردن | بەرەوچەپ |
| هەڵم لابردن | بەرەوڕاست |
| کەمکردنەوەی قەبارەی دەفرەکە | بەرەوچەپ |
| زیادکردنەوەی قەبارەی دەفرەکە | بەرەوڕاست |
| نزمبوونەوەی پلەی گەرمی | بەرەوچەپ |
| بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی | بەرەوڕاست |

## هەڵمە پەستانی شل

ئەو گەردانەی هەڵم کە لە باری هاوسەنگیدان لەگەڵ شل، لە ناو سیستمێکی داخراودا پەستانێك پەیدا دەکات کە تینەکەی لەگەڵ خەستی هەڵمەکەدا هاوڕێژەیە، **بەو پەستانەی لە باری هاوسەنگیدا لەگەڵ شلدا پەیدای دەکات، لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا**، دەڵێن هەڵمە پەستان **The vapor pressure** ی ئەو شلە. شێوە 6-11 ئامێرو ڕێگەی بەکارهێنراوی پێوانی هەڵمە پەستانی شلێکی دیاریکراو پیشان دەدات.

**شێوە11-6** ( أ ) دەتوانرێت هەڵمە پەستانی ئیثانۆڵ $CH_3CH_2OH$ بپیورێت، بە دڵۆپاندنی ئیثانۆڵی شل بۆ ناو کەمۆڵەیەکی بۆش کە بەشێکە لە سیستمە داخراوەکە. (ب) هەندێ گەردی ئیثانۆڵ ڕووی شلەکە بەجێ دێلن و هەڵم پێك دێنن. (ج) گەردەکانی ئیثانۆڵ بەردەوام دەبن لە هەڵمین و خەستبوونەوەدا، تاباری هاوسەنگی پێك دێت. (د) لە باری هاوسەنگیدا، ئەو پەستانەی کە تۆمار دەکرێ هەڵمەکە کاری پێ دەکات لەو ئاستی جیوەی هەر دوولای بۆریی ماتۆمەکرەکە.







شێوە 6-12 ، چەماوەکانی هەڵمە پەستانی هەریەکەی ئیثەری دوانە ئەثیل و ئیثانۆڵ و ئاوپێشان دەدات،چەماوەکە دەری دەخات کە هەڵمی هاوسەنگ لەگەڵ شلدا، پەستانێکی دیاریکراو پەیدادەکات لە هەموو پلەکانی گەرمیدا و، هەڵمە پەستانی شل بەبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی زیاد دەکات.

**هەڵمە پەستانی هەریەکەی ئیثەری دوانە ئەثیل و ئیثانۆڵ و ئاو لەچەند پلەیەکی گەرمی جێگیردا.**



**شێوە12-6** هەڵمە پەستانی شل بەبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی زیاددەکات و، شلەکە دەکوڵێت، کاتێك هەڵمە پەستانەکەی یەکسان دەبێت بە کەشە پەستان.

## هەڵمە پەستان و بیردۆزی گەردە جووڵە

دەتوانرێ زیادەی هەڵمە پەستان کە لە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی پەیدا دەبێت، بەهۆی بیردۆزی گەردە جووڵەی شل و گازەوە بدۆزرێتەوە، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی شل، دەبێتە هۆی زیادبوونی تێکڕای جووڵەوزەی، ئەمیش واتە، زۆربوونی ژمارەی ئەو گەردانەی ئەوەندە وزەیان وەرگرتووە کە بتوانن لە باری شلییەوە دەرباز ببن بۆ باری گاز، ئەو زیادبوونەی لە تێکڕای هەڵمیندا ڕووی داوە، دەبێتە هۆی زۆربوونی چڕی گەردەکانی هەڵمەکەو، بەو پێیەش دەبێتە هۆی زۆربوونی هەڵمە پەستان و ئەوەیش دەبێتە هۆی پشێوی تێکچوونی باری هاوسەنگی (شل – هەڵم)، دەبێتە هۆی زیادبوونی خەستی گەردەکانی هەڵم، لە لایەکی ترەوە زیاد بوون لە تێکڕای خەست بونەوەی گەردەکانی هەڵم وگۆڕانیان بۆ شل. ئەوەندەی پێ ناچێت باری هاوسەنگی دەگەڕێتەوە، بەڵام لە هەڵمە پەستانێکی لەوەی پێشوو بەرزتردا.

## شلە زوو هەڵمیوو و شلە زوو نەهەڵمیوەکان

لەبەر ئەوەی شلەکان هەموو هێزی ڕاکێشانیان هەیە لە نێوان گەردەکانیاندا، هەموو شلێك هەڵمە پەستانێکی تایبەتی خۆی هەیە لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا و هەرچەندێك هێزی کێشی نێوان گەردەکان بەهێزتر بێت، ڕێژەی گەردە هەڵمیوەکانی شلەکە لە پلەیەکی گەرمی دیار یکراودا کەم دەکات و ڕێژەی کەمی هەڵمین، دەبێتە هۆی هەڵمە پەستانێکی نزم و **شلە زوو هەڵمیوەکان** ***volatile liquids***، ئەو شلانەن **کە زوو دەبن بە هەڵم، چونکە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانی لاوازە**، ئیثەر شێوەیەکی نموونەی شلی زوو هەڵمیوە، بەڵام شلە زوو نەهەڵمیوەکان، کە بە هێواشی دەهەڵمن، هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانیان زۆرە و، ئاوێتە ئایۆنییە شلەوەبووەکان نموونەن بۆ شلە زوونەهەڵمیوەکان.

## کوڵان

هەڵمە پەستان، بۆ لێکدانەوەی چەمکی کوڵان و ناساندنی بەکاردێت (بڕوانە کەرتی 1-6 ) **کوڵان boiling کردەی گۆڕانی شلە بۆ هەڵم، کە لە ناوەوەو ڕووی شلەکەدا ڕوودەدات کاتێك هەڵمە پەستان یەکسان بێت بەکەشە پەستان.**

کاتێك پلەی گەرمی شلێك بەرزدەبێتەوە، هەڵمە پەستانەکەیشی بەرز دەبێتەوە تا دەگاتەپلەی گەرمیی کوڵان و **پلەی کوڵان boiling point شلێکی دیاریکراو، ئەو پلە گەرمییەیە کە هەڵمەپەستانی شلەکە و کەشەپەستان یەکسان دەبن** و، هەر چەندە کە شەپەستان کەم بێت پلەی کوڵان کەم دەبێت بۆیە شلەکانی چێشت لێنان لە شوێنە بەرزەکان، لە پلەیەکی گەرمی نزمتردا دەکوڵێن، چونکە لەو شوێنە بەرزانەدا، پەستانی کەش لە پەستانی ئاستی ڕووی دەریا کەمتر دەبێت و پێگەییشتنی خۆراك کاتێکی زۆر تری دەوێت.

لە پلەی کوڵاندا هەموو گەرمییە مژراوەکە، بۆ هەڵماندنی شلەکە بەکاردەهێنرێت و، پلەی گەرمی بە جێگیری دەمێنێتەوە هەتا پەستان جێگیربێت، کە پەستانی سەر شلە گەرمکراوەکە زیادی کرد، پلەی گەرمی شلەکە بەرز دەبێتەوە تاکو هەڵمە پەستانی شلەکە، لەگەڵ پەستانە نوێیەکەدا یەکسان دەبن و شلەکە جارێکی تر دەست دەکاتەوە بە کوڵان، لەسەر ئەو بنەمایەیش مەنجەڵی پەستۆك دروست کراوە، مەنجەڵی پەستۆك توند دادەخرێت بۆئەوەی هەڵمە پەستانی سەر ڕووی ئاوە لە کوڵەکەی ناو مەنجەڵەکە زۆر بێت و، ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی کوڵانی ئاو، بەوەیش خواردنەکە زووتر دەکوڵێت و پێ دەگات، بە پێچەوانەی مەنجەڵی پەستۆکیشەوە، ئامێرێکی تر دروست کراوە، پێی دەڵێن مەنجەڵی بۆشەهەڵمین vacuum evaporator ، کە بۆ ئاو تێدا نەهێشتنی لە گیراوەی شیر و شەکراو، بەکاردەهێنرێت و لە ژێر پەستانێکی کەمدا، ئاو لە پلەیەکی گەرمی نزمدا دەکوڵێت و دەتوانرێت خۆڵە بە فیرۆ چوونی شیرو شەکرە کە لا بدەین و ئەم ڕێگەیە بۆ دروست کردنی و شکەشیر و خەستە شیر و پیشەسازییانە شیرینکراو بەکاردەهێنرێت.

لە ژێر پەستانی کەشی ئاساییدا (101.3 kPa ، 760. torr ، 1 atm) پلەی کوڵانی ئاو 100°C تەواودەبێت و، پێی دەڵێن پلەی کوڵانی ئاوی ئاسایی شێوە 6-12 ، پلەی کوڵانی ئاسایی ئاو شلەی تر پیشان دەدات.

## وزە و کوڵان

بۆ ئەوەی کوڵانی شلێکی دیاریکراو بەردەوام بێت، پێویستە یەکبینە گەرمە وزەیان بدریتێ، دوای لابردنی مەنجەڵە ئاوی کوڵاو لە سەر ئاگر، یان گەرمکەرێك، یەکسەر کوڵان دەوەستێت و، ئەگەر وامان دانا کە دەتوانیت پلەی کوڵانی شلێکی لەکۆڵ و پلەی گەرمیی هەڵمەکەی زۆر بەوردی بپێویت ڕەنگە سەرت سووڕ بمێنێت کە دەبینیت پلەی گەرمییەکەیان یەکسانە، گەرمی، یان تێکڕای جووڵە وزەی تەنۆکەکان، لە پلەی کوڵاندا، بە جێگیری دەمینێتەوە لەگەڵ ئەوەیشدا گەرمکردن بەردەوام بێت، کەواتە ئاخۆ ئەو گەرمە وزە سەربارە چی لێ دێت؟ ئەو وزەیە بۆ زاڵبوون بەسەر هێزی یەکتر ڕاکێشانی تەنۆکەکانی شلەکەدا، بەکاردێت لەکاتی گۆڕانی شلێك بۆ گاز و وزەکە لە هەڵمەکەدا هەڵدەگیرێت وەك ماتە وزەیەك.

## مۆڵە گەرمی هەڵماندن

**بەبڕی گەرمی پێویست بۆ هەڵماندنی مۆڵێك شل لە پلەی کوڵاندنەکەیدا دەوترێت مۆڵەگەرمی** (گەرمی مۆڵی) هەڵماندن **molar heat of vaporization** مۆڵەگەرمی هەڵماندن بە پێوەری هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانی شل دادەنرێت، هەر چەندێك ئەو هێزانە زۆرتر بێت، پێویست بەبەکارهێنانی وزەیەکی زۆرتر دەکات بۆ بەسەردا زاڵبوونی، لەوەیش مۆڵە گەرمییەکی هەڵماندنی زۆرتر پەیدا دەبێت، وە هەر شلێك مۆڵە گەرمییەکی هەڵماندنی تایبەتی خۆی هەیە، ئاو بە بەراورد لەگەڵ شلەکانی تردا مۆڵە گەرمییەکی هەڵماندنی بەرزی هەیە بەشێوەیەکی نائاسایی، بەهۆی بوونی ئەو هایدرۆجینە بەندانەوە کە لە نێوان گەردەکانی ئاوی شلدا هەیە، ئەم ڕەوشە والە ئاو دەکات، هۆکارێکی ساردکردنەوەی کارابێت، کاتێك ئاو لە پێستەوە دەهەڵمێت، گەردە هەڵمیوەکان بڕی زۆر گەرمی لە پێست دوور دەخەنەوەو سارد دەبێت، شێو6-13 دابەشبوونی جووڵەوزەی گەردەکانی شلێك لە دوو پلەی گەرمیدا پیشان دەدات و، دەتوانین سەرنجی ئەمانە بدەین: لە پلەی گەرمی بەرزدا، ژمارەی ئەو گەردانە زۆردەبێت کە ئەوەندەیان گەرمە وزە تێدایە بتوانن لە ڕووی شلەکە دەربازبن و بهەڵمێن.




**شێوە 13-6** پەیوەندی نێوان ژمارەی گەردەکانی شل و جووڵە وزە، لە دوو پلەی گەرمی جیاوازدا، سەرنجی ناوچە سێبەرەکە بدە کە کەمترین ڕادەی جووڵەوزەی پێویستی هەڵمین پیشان دەدات.

## بەستن و شلبوونەوە

بەکردەی گۆڕانی فیزیایی شل بۆ ڕەق دەڵێن بەستن freezing ، بەستن ونکردنی گەرمە وزە لە شل دەگرێتەوە، وەك لەم هاوکێشەیەی خوارەوەدا پیشاندراوە:

$$H_2O(l) \rightarrow H_2O(s) + \text{گەرمە وزە}$$

لەبارەی ماددە ڕەقە بلوورییە خاوێنەکاندا، ئەم گۆڕانە، لە **پلەیەکی گەرمی جێگیردا ڕوودەدات کە پێی دەڵێن پلەی بەستن freezing point** و **پلەی بەستنی ئاسایی بەو پلە گەرمییە دەڵێن، کە ڕەق و شل تێیدا لەباری هاوسەنگیدان، لەژێر کەشە پەستانێکی** *1 atm ( 760 torr ، یان 101.3 kPa )*. لە پلەی بەستندا، تەنۆکەکانی شل و ڕەق هەمان تێکڕای جووڵە وزەیان هەیە و بۆیە ون کردنی وزە لەکاتی بەستن بریتی یە لە ونکردنی وزەی شاراوەی ناوشلەکە، لەوکاتەدا کە وزە کەم دەبێتەوە، زۆربوونێکی بەرهەست لە ڕێزبوونی تەنۆکەکاندا ڕوودەدات، چونکە تەنۆکەکان، لە دۆخی ڕەقیدا، لە تەنۆکەکانی دۆخی شل ڕێك وپێك ترن لەهەمان پلەی گەرمیدا. شلبوونەوە، پێچەوانەی بەستنەو، ئەویش لە پلەیەکی گەرمی جێگیردا ڕوودەدات، کە ڕەق شل دەبێتەوە، یەکبینە گەرمی دەمژێت، کە بەم هاوکێشەیە پیشان دەدرێت:

$$H_2O(s) + \text{گەرمە وزە} \rightarrow H_2O(l)$$

لە ماددە ڕەقە بلوورییە خاوێنەکاندا، پلەی شلەوەبوون یەکسانە بە پلەی بەستن و لەباری هاوسەنگیدا هەریەکەی شلبوونەوەو بەستن بە تێکڕایەکی یەکسان ڕوودەدەن(بەهەمان خێرایی ڕوو دەدەن) و ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە بۆ پیشاندانی ئەو بارانە بەکاردێت:

$$H_2O(s) + \text{گەرمە وزە} \rightleftharpoons H_2O(l)$$

لە ژێر پەستانی ئاساییدا، پلەی گەرمی سیستمێك کە بەفر و ئاوی پێکەوە تێدا بێت لە پلەی گەرمی $0^oC$ دا، ئەم پلە گەرمییەی $0^oC$ بەجێگری دەمێنێتەوە. هەر چەندێك پلەی گەرمی ناوەندەکەی دەورووبەر بگۆڕدرێت و

وەك چاوەڕوان دەكرێت لە كارپێكردنی بنەمای لوشاتلیێ وە، گەرمكردنی ئەم سیستەمە، هاوسەنگییەكە بەرەو ڕاست دەبات، بەرەو زۆربوونی ڕێژەی شل (ئاو) و پاش شلبوونەوەی سەهۆڵەكە بەتەواوی، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی كاردەكاتە سەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی سیستەمەكە.

## مۆڵە گەرمیی شلبوونەوە

بەبڕی گەرمە وزەی پێویستی شلكردنەوەی مۆڵێكی ڕەق لە پلەی گەرمی شلبوونەوەیدا دەڵێن: مۆڵە گەرمی شلبوونەوە **molar heat of fusion** بە زۆربوونی گەرمی مژراو، ماتەوزەی ئەو ڕەقە زیاد دەكات كە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو هێزی ڕاكێشانەدا بەكاردەهێنرێت كە گەردەكان پێكەوە دەبەستێ و لە هەمان كاتدا ڕیزبوونی تەنۆكەكان زۆر كەم دەكات كاتێك تەنۆكەكان لە دۆخی ڕەقەوە دەگۆڕێن بۆ دۆخی شل و مۆڵەگەرمی شلبوونەوە، وەك مۆڵەگەرمی هەڵماندن، بەستراوە بە یەكتر ڕاكێشانی تەنۆكەكانی ڕەقەوە.

## هەڵچوون (هەڵكشان) و نیشاندن

لە پلەی گەرمی و پەستانی نزمدا، شل بە شلی نامێنێتەوە، لە ژێر ئەو مەرجانەدا، ماددەی ڕەق لەباری هاوسەنگیدا دەبێت لەگەڵ هەڵمەكەیدا لەجیاتی شلەكەی، وەك لەم هاوكێشەدا دەیبینین:

$$H_2O(s) + \text{گەرمە وزە} \rightleftarrows H_2O(g)$$

بە گۆڕان لە دۆخی ڕەقەوە بۆ دۆخی گاز، بێ تێپەڕین بە دۆخی شلدا، دەڵێن هەڵچوون (هەڵكشان) **sublimation** و كردە پێچەوانەكەی، واتە گۆڕان لە دۆخی گازەوە بۆ ڕەق، بێ تێپەڕین بە دۆخی شلدا، پێی دەڵێن نیشاندن **deposition**، لەماددە هەڵچووەكان لە پلەی گەرمییەدا ژووردا، وشكە بەفر($CO_2$ ی ڕەق ) و یۆد، بەفری ئاسایی هەڵدەچین، بە هێواشی لەو پلە گەرمییەدا كە لە پلەی گەرمی شلبوونەوەی كەمترە ($0^oC$)، ئەویش لێكی دەداتەوە چۆن تویژاڵە بەفرێك دیار نامێنێ لەگەڵ ئەوەیشدا كە پلەی گەرمییەكەی لە ژێر $0^oC$یەوە دایە. هەڵچوون لە بەفرخەرەكانی بەستنی ئازاددا frost free ڕوودەدات كاتێك گەرمی لە ژووری بەستندا بەشێوەیەكی نۆرەكاری بەرز دەكرێتەوە بۆ ئەوەی هەر بەفرێكی پەیدابوو خێرا هەڵبچێت، ئەوجا بە كێشێكی كارەبایی هەڵمی ئاوە پەیدابووەكە لادەدات، لەلایەكی تریشەوە، پەیدابوونی سەهۆڵ لەسەر ڕووە ساردەكان، نموونەیەكی باوی كردەی نیشاندنە.

### پێداچوونەوەی كەرتی 3-6

**1.** هاوسەنگی چییە؟

**2.** بنەما (باوەڕ)ی لوشاتلیێ پێ بناسە.

**3.** چی ڕوودەدات، كاتێك پلەی گەرمی بەرز یان نزم بكرێتەوە لەو سیستەمە هاوسەنگەی خوارەوەدا:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightleftarrows H_2O(g)$$

**4.** نموونەیەك بۆ نیشاندن بهێنەوە.

**5.** مەبەست لە هەڵمە پەستانی شل چییە؟

**6.** مەبەست لە پلەی كوڵانی شل چییە؟



# مادده دۆخ گۆڕۆکەکان

ڕەنگە جاری بنکەکانی خانووبەرە فرۆشتن لە ئایندەدا بگۆڕدرێن و، بەم شێوەیان لێ بێت: ماڵێکی نموونەیی، دوو ژووری نووستن و دوو ئاودەست، ژوورێکی میوانی هەیە، کە بەکەمترین بڕ کارەبا وزە یان هەر وزەیەکی تر گەرم و سارد دەکرێتەوە. ئەم جۆرە ماڵانە بەم زووانە دەبنە باو و تەکنەلۆژیای دۆخ گۆڕین بەشداری دەکات لە دابینکردنی گەرمی ئەو ماڵانەدا، کە ناواخنی دیوارەکانیان شل دەبنەوە یان تارادەیەك دەیبەستێ، لەگەڵ گۆڕانی ئاوو هەوادا. کاتێك دۆخی فیزیایی هەر ماددەیەك دەگۆڕێت، ماددەکە گەرمی دەدات یان دەمژێت و دیوارەکان بەپێی ئەو بنەمایە دروستکراون، کە ناو ئەو دیوارانە، پڕ دەکرێن لە جۆرە پاڕافینێك، لە پلەی گەرمی $24^{o}C$ دا، شل دەبێتەوە یان دەمەیێت (دەیبەستێت)و کاتێك پلەی گەرمی لە دەرەوەی ماڵەکان لەوە تێ دەپەڕێت، پاڕافینەکە شل دەبێتەوەو گەرمی لە ناو ماڵەکە دەمژێت، بەتەواویش پێچەوانەکەی ڕوودەدات، کاتێك دنیا سارد دەبێت و پلەی گەرمی دەرێی ماڵ نزم دەبێتەوە، لە ئەنجامی ئەو دۆخ گۆڕینەدا، پلەی گەرمیی ماڵ بە جێگیری دەمێنێتەوە، بە بەکارهێنانی بڕێکی کەم وزە، سەرباری ئەوەی لە دوا ڕۆژدا گەرمی خۆر زۆر فراوان بەکاردەهێنرێت. کاتێك ماددەکان بە وزەی کارەبا گەرم دەکەین(چەند سەعاتێك)، دەتوانین گەرمی هەڵبگرین، کاتێك پاڕافینی ناو دیوارەکان شل دەبێتەوەو کاتێك دیوارەکان سارد دەبنەوە، پاڕافینەکە



دۆخ گۆڕینەکان ئەو گۆڕینە فیزیاییانەن کە دەشێت گەرمیدەر یان گەرمیمژبن کە بەستراوە بە ئاڕاستەی ڕەوینی وزەوە لە نێوان تەنێك و دەوروبەردا.

دەمەیێتەوە (دەیبەستێتەوە)و وزەی گەرمی دەدات بەناو ماڵەکەو، بە درێژایی ڕۆژ بەگەرمی دەمێنێتەوەو لەبەرئەوەی دۆخگۆڕین، لە تایبەتمەندییەکانی ماددەی سروشتییە، دیوارەکان لە خۆیانەوە گەرم دەبن و ساردیش دەبنەوە بێئەوەی پێویستیان بە چاودێری بێت، لەلایەن کرێکار و پسپۆڕانەوە یان گۆڕینیان بە هۆی داخوران و لەناوچوونەوە. داهێنانێکی نوێتر هەیە، تاڕادەیەکی زۆر دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تێچوونی ساردکردنەوەو گەرمکردنەوەی خانووبەرە، ناواخنی ئاوێتە بەکاردەهێنێت، لە ماددەی وا دروستکراوە کە دەتوانێ دۆخی فیزیایی خۆی بگۆڕێت، ئەم ناواخنانە لە بۆشایی ناو قاڵبەکانی کۆنکریتی شیشبەند دادەنرێت پێش داڕشتنی، ئەو ناواخنانە دەتوانن گەرمی خۆر بهێڵنەوە و بپارێزن لە زستاندا بۆ مەبەستی گەرمکردن و ساردی شەوانی هاوینیش دەهێڵنەوە بۆ فێنکردنەوەی ڕۆژ، توێژیاران پێشبینی دەکەن، سوود لەم تەکنیکە وەربگیرێت لە زۆر بواردا، ئەگەر بزانین کە مادده دۆخ گۆڕەکان

ئێستا دەفرۆشرێت و بەکاردەهێنرێت لە بواری پاراستنی گەرمی خۆراکدا، پاش گەرمکردنی بە تیشکی مایکرۆیی تا چەند خولەکێك وردکە (دەقیقە) یەك و ئەو ماددانە لە شێوەی وردە سەریندا دروست دەکرێن، تاماوەیەکی زۆر بەگەرمی دەمێننەوەو ئەم ڕێگایش بۆ بە گەرمی هێشتنەوەی قاپ و قاچاخ بەکاردەهێنرێت و خۆراکە کە بە گەرمی دەمێنێتەوەو بەبوونی ماددەی دۆخی خۆ گۆڕ، کەش لە زستاندا زۆر سارد نابێت، ئەگەر ئەم ماددانە بۆ ناوپۆشینی پاڵتۆ و کڵاو و دەستکێش و...تاد، بەکاربهێنرێن، لەگەڵ ئەم ماددانەدا، ڕووەك بە گەرمی لە مۆژەکانیاندا دەمێننەوە، هەروەك دەتوانرێت ئەو ماددانە بۆ قیری پردی سەر ڕێگاکان و ناوپۆشی باتری ئۆتۆمبێل بۆ پاراستنی لەبەستن بەکاربهێنرێن، هەروەها لەگەڵ بەکارهێنانی مادده دۆخی خۆگۆڕەکان دەتوانرێت پۆشاکی سەربازەکانی ئاگر کوژاندنەوەیان لێ دروست بکرێت بۆ پارێزگارییان لە گەرمی، دیسان دەتوانرێ بەرگی دژەگەرمی شوێنە هەستیارەکانی فڕۆکەیان لێ دروست بکرێت کە پێویستە بیپارێزین، وەك زانیاری تۆمارکەرەی فڕۆکەو دەنگ تۆمارکەرەی فڕۆکەوانەکان کە بەشدارن لە پێکهێنەکانی سنووقە ڕەشدا، کە چۆنێتی ڕوودانی کارەساتەکان تۆمار دەکات.

## کەرتی 6-4

### نیشانەکانی ڕاپیکاری

- باسی پێکهاتنی گەردی ئاو دەکات.
- گفتوگۆ لەسەر ڕەوشە فیزیاییەکانی ئاو دەکات و ڕوونی دەکاتەوە چۆن لە ڕێی پێکهاتنی ئاوەوە دیاری دەکرێت.
- بڕی گەرمە وزەی مژراو یان دەرپەڕیو دەدۆزرێتەوە، کاتێك بڕێ ئاو دۆخەکەی دەگۆڕێت.

# ئـــــاو

ئاو ماددەیەکی زۆر باوە لە هەرسێ دۆخەکەیدا، شل و ڕەق و گاز، ئاو شلەیەکە زۆرترین بوونی هەیە لەسەر ڕووی زەوی، دەریاو دەریاچەو ڕووبارەکان75% زۆرتری ڕووی زەوییان داپۆشیوە، بڕێکی ئێجگار زۆر ئاوی بەستوو لە جەمسەرەکانی زەوی هەیەو، ئاو پێکهێنی پێویستی هەموو زیندەوەرانەو 70% تا 90% ی بارستەی زیندەوەرێك پێك دێنێت و کارلێکە کیمیاییەکانی زۆربەی زیندە چالاکییەکانی تێدا ڕوودەدات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ئاو بەزۆری بەرهەم یان کارلێککردووە لەم کارلێکانەدا، جا بۆ ئەوەی لە گرنگی ئاو باشتر تێ بگەیت، پێویستە لە پێکهاتەو ڕەوشەکانی باشتر بگەین.

## پێکهاتەی ئـاو

گەردی ئاو (بڕوانە بەندی 6 ی کتێبی پۆلی دەیەم)، لە دوو گەریلە هایدرۆجین و گەردیلەیەك ئۆکسجینی بە هاوبەشەبەندی جەمسەردار پێکەوە بەستراو پێکهاتووە، تاقیکردنەوەکان دەریان خستووە کە گەردی ئاو گۆشەییەو دەتوانرێت پێکهاتەکەی وەك خوارەوە دەرببڕدرێت:



بەهای گۆشەی نێوان دوو بەندەکەی هایدرۆجین– ئۆکسجین $105^{o}$ یە، ئەم بەهایە، لە بەهای گۆشەی چاوەڕوانکراوی دوو ڕەگبوونی $sp^{3}$ ی تایبەتی ئۆربیتاڵەکانی گەردیلەی ئۆکسجین نزیك دەبێتەوە. گەردەکانی ئاو یان بەفر، بە هایدرۆجینە بەند پێکەوە بەستراون، ژمارەی گەردە پێکەوە بەستراوەکان، بەبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی، کەم دەکەن، چونکە زۆربوونی جووڵە وزەی گەردەکان کارێکی وا دەکات پێکهاتنی بەند کارێکی گران بێت، لەگەڵ ئەوەشدا، لە هەر کۆمەڵە ئاوێکی شلدا چەند گەردێك هەیە لە نێوان4 و8 گەرددا کە بە هایدرۆجینە بەند پێکەوە بەستراون، وەك شێوە 6-14 . ئەگەر ئەم کۆمەڵە گەردانە نەبوونایە، لە پلەی گەرمی ژووردا ئاو دەبوو بە هەڵم، گەردە بێجەمسەرەکانی وەك میثان $CH_4$ ، لەلایەکی دیکەوە، لە بارستە و قەبارەدا وەك گەردەکانی ئاو وان، بەڵام هایدرۆجینەبەند یان لە نێواندا نییە، بۆیە میثان گازە لە پلەی گەرمی ژووردا.

بەفر، لە گەردی ڕێك و پێك ڕیزکراو پێکهاتووە بە شێوەی شەش ڕوو، وەك لە شێوە 6-15 دا دیارە، بۆشایی نێوان گەردەکان لەم ڕێزەدا هۆیەکە بۆ کەمی چڕی




**شێوە6-14** پێکهاتەی ئاوی شل ڕوون دەکاتەوە، ئۆکسجین لە ناوگەردی ئاودا، لەگەڵ هایدرۆجین بە هاوبەشەبەند پێکەوە بەستراون، بەڵام گەردەکانی ئاو بە هایدرۆجینەبەند پێکەوە بەستراون.

بەفرو کە گەرمی بکەین گەردەکانی دەجوولێن و توند دەلەرێنەوە، بەهۆی بەرزی وزەیانەوەو کە دەگاتە پلەی شلەوەبوون، وزەی گەردەکان ئەوەندە بەرزدەبێت بەڕادەیەك پێکهاتەکراوەو سەختەکەی بلووری سەهۆڵ تێك دەشکێت و بەفرەکە شل دەبێتەوە. شێوە 14-6 و 6-15 دەری دەخەن، کە ژمارەی هایدرۆجینە بەندەکانی نێوان گەردەکانی ئاو لە $0^oC$ دا، کەمترە لە ژمارەیان لە نێوان گەردەکانی بەفرداو ناڕێکترن لە هەمان پلەی گەرمیدا، چونکە پێکهاتە ڕەق کراوەکەی بەفر لێك هەڵدەوەشێت، کە وا دەکات گەردەکانی ئاو پێکەوە کۆببنەوەو بەوپێیە ئاو چڕتر دەبێت لە بەفر. کاتێك، ئاوی شل گەرم دەکرێت، لە $0^oC$ یەوە، گەردەکانی ئاو بەشێوەیەکی گەورەتر کۆدەبنەوەو ئەم کۆبوونەوەیە، دەگاتە ئەوپەڕی لە پلەی $3.98^oC$ دا، لە پلە بەرزترەکانی لە$3.98^oC$ بەرزتردا، جووڵە وزەی زیادکردووی ئەو گەردانە دەبێتە هۆی زاڵبوونی بەسەر ئەو هێزی یەکترڕاکێشانەی کۆی کردوونەتەوەو تۆپەڵی کردوون، لێك دوور دەکەونەوە، لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیدا، تا دەگاتە پلەی کوڵان، لە پلەی کوڵاندا، کۆمەڵە گەردەکانی ئاوی شل، بڕێك وزە دەمژن، ئەوەندەی کە بەشی لێك جیابوونەوەیان و پێکهاتنی تاکە گەرد بکات، بەهۆی بوونی هایدرۆجینەبەندەوە لە نێوان گەردەکانی ئاودا، پێویست بە جووڵەوزەی بەرز دەکات، کە پلەی کوڵان تا ڕادەیەك بەرز بکاتەوە ($100.^oC$) بەبەراورد لەگەڵ شلەکانی تردا کە مۆڵە بارستەیان لە مۆڵە بارستەی ئاو دەچێت.




**شێوە15-6** بەفر هەمان پێکەوەبەسترانی ئاوی هەیە، بەڵام پێکهاتنی هایدرۆجینەبەند زۆر ڕەقترو فراوانترە لە پێکهاتنی بەند لە ئاودا.

## ڕەوشە فیزیاییەکانی ئاو

ئاو، لە پلەی گەرمی ژووردا ڕوونە، بێ بۆن و بێ تام و بێ ڕەنگە، هۆی هەر تام و بۆیەکی هەستپێکراو لە ئاودا، بوونی خەوشی شل یان گازیان ماددە ڕەقەکانە کە تێیدا تواونەتەوە. مۆڵەگەرمی شلبوونەوەی سەهۆڵ دەگاتە 6.009 kJ/mol ، ئەم بەهایە، گەورەیە بەپێی مۆڵەگەرمی شلبوونەوەی ماددەکانی تر، ئاو، وەك پێشتر وتمان ڕەوشێکی نائاسایی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لەکاتی بەستندا، قەبارەکەی دەکشێت، چونکە پێکهاتنی گەردییەکەی لە شێوەیەکی ڕەق و کراوە پێکهاتووە لە ئەنجامی ئەوەدا، چڕی بەفر لە $0^oC$ دا نزیکەی$0.917\ g/cm^3$ ، کاتێك چڕی ئاو لەو پلەیەدا $0.99984\ g/cm^3$.

چڕی نزمی سەهۆڵ، لە چاوخۆیدا، هۆی سەرئاوکەوتنێتی و، کاری دابڕینی بەفری سەرئاو کەوتە، بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە لەوەدا کە پێوەندیی بە تۆپەڵە ئاوە گەورەکانەوە هەیە، وەك دەریاو دەریاچە و ڕووبارەکان، ئەگەر بەفر لە ئاو چڕ تر بوایە دەنیشێتە ژێر ئاوەکەو بنکی دەریاو دەریاچەکان، کە شیانی شلبوونەوەی بەتەواوی کەم دەکات و ئەوسایش ئاوی هەموو دەریاکان لە ئاوو هەوای ئاساییدا دەیبەست، کە دەبووە هۆی کوشتنی هەموو جۆرەکانی ژیان تێیاندا.

ئاو لە $100^oC$ دا دەکوڵێت و لە ژێر کەشە پەستانی 1 atm (101.3 kPa) دا و لەو پلەی گەرمییەدا، مۆڵەگەرمی هەڵماندنی ئاو 40.79 kJ/mol دەبێت، ئاشکرایە کە پلەی کوڵان و گەرمی مۆڵی هەڵماندن بۆ ئاو بەرزن بە بەراورد لەگەڵ مادە بێ جەمسەرەکانی تر کە هەمان بارستەی گەردیان هەیە وەك میثان، بەرزی ئەم دوو نرخە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی بەندی هایدرۆجینی کە دەبێت زاڵ بین بەسەریدا بۆ ڕوودانی کوڵان. ، پلەی کوڵان و مۆڵەگەرمی هەڵماندن، وا لە ئاو دەکات بەسوودبێت لە سیستمە گەرمکارییەکانی خانووبەرەدا، کاتێك هەڵم لە تیشکدەرە گەرمییەکاندا خەست دەبێتەوە، بڕێکی زۆر گەرمی دەردەپەڕێت.

**پرسی نموونەیی 1-6**

بڕی گەرمە وزەی مژراو چەندە لەکاتی شلبوونەوەی **47.0 g** بەفر لە ب . پ **STP** دا؟ و بڕی گەرمە ووەزی مژراو چەندە لەکاتی کوڵاندنی ئەم بارستە ئاودا؟

**شیکاری**

**1 شی بکەرەوە**

**دراو:** بارستەی $H_2O(s)$ = 47.0 g

بارستەی $H_2O(l)$ = 47.0 g

مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی بەفر = 6.009 kJ/mol

مۆڵە گەرمی هەڵماندن = 40.79 kJ/mol

**نەزانراو:** گەرمە وزەی مژراو لە کاتی شلبوونەوە سەهۆڵدا،

گەرمە وزەی مژراو لەکاتی کوڵانی ئاودا.

**2 نەخشە بکێشە**

یەکەم، بارستەی ئاو بە گرام بگۆڕە بۆ مۆڵ

$$g\ H_2O \times \frac{1\ mol\ H_2O}{g\ H_2O} = mol\ H_2O$$

ئەوجا مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی بەفر بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی بڕی گەرمی مژراو لە کاتی شلبوونەوەیدا، لێکدانی ژمارەی مۆڵەکان لەگەڵ بڕی وزەی پێویستی شلبوونەوەی مۆڵێك بەفر لە پلەی شلبوونەوەدا (مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی سەهۆڵ. هەمان ڕێگە بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی بڕی گەرمی مژراو لەکاتی کوڵانی ئاودا بەبەکارهێنانی موڵە گەرمی هەڵماندن.

بڕی مادده (مۆڵ) (mol) × مۆڵە گەرمی شلبوونەوە یا کوڵان (kJ/mol) = گەرمە وزە (kJ)

**3 بدۆزەرەوە**

$$47.0\ g\ H_2O \times \frac{1\ mol\ H_2O}{18.02\ g\ H_2O} = 2.61\ mol\ H_2O$$

$2.61\ mol \times 6.009\ kJ/mol = 15.7\ kJ$ (لەکاتی شلبوونەوەدا)

$2.61\ mol \times 40.79\ kJ/mol = 106\ kJ$ (لەکاتی هەڵماندن یا کوڵاندا)

**4 هەڵسەنگێنە**

یەکەکان بەڕاستی کورت کراونەتەوە، وەڵامەکە چەندە واتا ڕەنووسێکی تەواوە.

**ڕاهێنانە کارپێکەرییەکان**

1. بڕی ئەو گەرمە وزە دەرپەڕیوە چەندە لەکاتی بەستنی 506 g ئاودا؟
2. بارستەی هەڵمی پێویست بۆ دەرپەڕاندنی $4.97 \times 10^5$ kJ گەرمە وزە، لەکاتی خەستبوونەوەدا چەندە؟

وەڵامەکان:

1. 169 Jk
2. $2.20 \times 10^5$ g

## پێداچوونەوەی کەرتی 4-6

1. بۆچی گەردی ئاو، جەمسەرییە (جەمسەردارە)؟
2. چۆن پێکهاتەی ئاو، کاردەکاتە پەیدا کردنی ڕەوشە دیارەکانی؟
3. ڕێزبوونی گەردەکان، لە ئاو و سەهۆڵدا باس بکە.
4. بۆچی بەفرسەر ئاو دەکەوێت؟ گرنگی ئەم دیاردەیە چییە؟

# پێداچوونەوەی بەندی 6

## کورتەی بەندەکە

**1-6**

- گەردەکانی شل لێك نزیکتر ورێك و پێك ترن لە گەردەکانی گاز و کەم ڕێك و پێك تریشن لەگەردەکانی ڕەق.
- شلەکان قەبارەیان دیاریکراوە چڕییان لە چاوخۆدا بەرزە و، ماددەی نەپەستۆکن ودەڕەون وەك گازەکان بۆیە بە ڕژۆك دادەنرێن و دەتوانن ماددەکانی تربتوێننەوە.
- شلەکان دەتوانن بڵاوببنەوەو، ڕووکرژی پێکدێنن و، دەهەڵمن و دەکوڵێن، کە دەگۆڕدرێت بۆ ڕەق، دەوترێ (بەستوویەتی).

### زاراوەکان

(160) freezing بەستن
(159) evaporation هەڵمین
(159) vaporization هەڵماندن
(159) surface tension ڕووکرژی
(157) fluid ڕژۆك
(159) capillary action مووییە کاریگەری

**2-6**

- تەنۆکەکانی ماددەی ڕەق تەواو ئازاد نین لە جووڵەیاندا، وەك تەنۆکەکانی مادەی شل یان گاز، بەڵکو دەتوانن لە شوێنی خۆیان بلەرێنەوە.
- ماددە ڕەقەکان، شێوەیەکی دیاریکراویان هەیە، دەشێ بلووری یان نابلوری بێت، ماددە ڕەقەکان قەبارەیەکی دیارییکراویشیان هەیە و ڕژۆك پێك ناهێنن، یەکێك لە ڕەوشەکانی تریان ئەوەیە زۆر چڕن و نەپەستۆکن و تێکرای بڵاوبوونەوەیەکی نزم و پلەیەکی شلەوەبوونی دیاریکراویان هەیە (هی بلوورەکان) .
- پێکهاتنی بلووری، پێکهاتنی گشتی سێ دووری تەنۆکەکانی بلوورە. دەتوانرێت بلوور بکەین بە یەکێك لە حەوت سیستمی بلوورییەوە بە پێی پێکهاتنی بلووریی.
- ماددەی ڕەقە نابلوری یەکان شێوەی ڕێکی نیە، ئەو ماددانە کە لە جیاتی ئەوە ئەو شێوانە وەردەگرێ کە ئێمە بۆی دیاری دەکەین.

### زاراوەکان

(162) melting شلبوونەوە
(162) crystal تەورك ، بلور
(163) crystal structure پێکهاتنی بلور
(162) melting point پلەی (پنتی) شلبوونەوە
(162) supercooled liquids شلە ژوور ساردکراوەکان
ماددە ڕەقەبلوورییەکان (162) crystaline solids
ماددە ڕەقە نابلوورییەکان (162) amorphous solids
(163) unit cell یەکەی خانە

**3-6**

- شل لە ناو سیستمێکی داخراودا، بە هێواشی دەگاتە باری هاوسەنگی (شل – هەڵم)، کاتێك تێکرای خەستبوونەوەی گەردەکانی لەگەڵ تێکرای هەڵمینیدا یەکسان دەبێت.
- کاتێك دوو گۆڕانی پێچەوانە بە دوو خێرایی یەکسان ڕوودەدەن لە ناو سیستمێکی داخراودا، لە بارەی سیستمەکەوە دەوترێ کە لە هاوسەنگییەکی جوولۆکدایە ( داینەمیکیدا)، بنەمای لوشاتلیێ دەڵێت: کاتێك سیستمێکی هاوسەنگ دەشێوێت، لە ئەنجامی هۆکارێکی کاریگەردا، ئەو هۆکارە تاکەترین سنوورکەم دەکاتەوە.
- ئەو پەستانەی هەڵمێك لە باری هاوسەنگیدا لەگەڵ شلەکەیدا کاری پێ دەکات لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا، هەڵمەپەستانی شلەکەیەو، شلەکە دەکوڵێت کاتێك هەڵمە پەستانەکەی لەگەڵ کەشە پەستان یەکسان دەبێت و، بەو بڕە گەرمە وزە پێویستەی بۆ هەڵماندنی مۆڵێك شل، لە پلەی کوڵاندنەکەیدا بە بەکاردێت دەڵێن مۆڵە گەرمی هەڵماندن.
- بەستنی شلێك، ونکردنی وزەی گەرمی پێوەدەبێت و شلبوونەوە، گۆڕانێکی فیزیایی ماددەیە لە دۆخی ڕقییەوە بۆ دۆخی شلی بەهۆی گەرمییەوە، بەو بڕە گەرمییەی بۆ شلکردنەوەی مۆڵێك ڕەق پێویست لە پلەی شلبوونەوەکەیدا دەڵێن، مۆڵە گەرمی شلبوونەوە.

### زاراوەکان

(166) equilibrium هاوسەنگبوون
(174) deposition نیشاندن
(174) sublimation هەڵچوون (هەڵکشان)
(167) condensation خەستبوونەوە
مۆڵەگەرمی شلبوونەوە (174) molar heat of fusion
مۆڵە گەرمی هەڵماندن (172) molar heat of vaporisation
(173) freezin point پلەی بەستن
(171) boiling point پلەی کوڵان
(171) volatile liquids شلە زوو هەڵمیوەکان
(169) the vapor pressure هەڵمەپەستان
(171) boiling کوڵان
بنەمای لوشاتلیێ (168) Le Chatelier's principle

پوختەی بەندەکە پاشکۆ

**4-6**

- ئاو ئاوێتەیەکی هاوبەشی – جەمسەرداره و گەردی ئاو شێوەیەکی گۆشەیی هەیە و بارگەی بەشە سالیبی سەرەگەردیلەی ئۆکسجینەکەی و بارگەی بەشە مووجەبی سەر دووگەردیلە هایدرۆجینەکەی کە تێیدان.
- پێکهاتن و جۆرەکانی بەندەکانی ئاوەکە دەتوانرێت پێك بهێنرێت، بەرپرسن لە بەرزیی پلەی کوڵان و پلەی شلبوونەوە و مۆڵەگەرمی هەڵماندن و مۆڵەگەرمی شلبوونەوەی.
- پێکهاتنی ئاو و بەندەکانی، هەروەها، هۆی کشانی ئاولەکاتی بەستنیداو، هۆی کەوتنە سەر ئاوی سەهۆڵ.

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

1. ڕژۆك چییە؟
2. ڕووگرژی چییە؟
3. دوو هۆ بڵێ کە بە بێ ئەوان، هەڵمین بەکردەیەکی گرنگ دابنرێت لە سروشتدا.
4. حەوت ڕەوشتی ماددە ڕەقەکان بژمێرە و هەریەکەیان بەپێی بیردۆزی گەردە جووڵەی ماددە ڕەقەکان ڕاڤە بکە.
5. أ. چوار نموونەی ماددە ڕەقە نا بلوورییەکان بژمێرە.
   ب. بۆچی جاری وا هەیە شووشە وەك مادەیەکی ژوور ساردکراوە دەپۆلێنرێت؟
6. جیاکاری بکە لە نێوان پێکهاتنی بلوری و تۆری بلوری و یەکەی خانەدا.
7. أ. چوار جۆرەکەی بلور بژمێرە، لە سەربنچینەی سروشتی پێکهاتەی تەنۆکەکانی و جۆری بەندی نێوانیان ئەوجا وەسفی بکە
   ب. ڕەوشە فیزیاییەکانی هەر جۆرێك لە جۆرەکانی بلوورە چین؟
8. شێوە 6-12 بەکاربهێنە بۆ خەملاندنی هەڵمە پەستانی نزیکەیی هەریەکە لە مانەی خوارەوە لەو پلە گەرمییە دیاریکراوەدا:
   أ. ئاو لە پلەی گەرمی 40°C دا.
   ب. ئاو لە پلەی گەرمی 80°C دا.
   ج. ئیثەری دوانە ئەثیل لە پلەی گەرمی 20°C دا.
   د. ئیثانۆل لە پلەی گەرمی 60°C دا.
9. أ. هەڵچوون (هەڵکشان) چییە؟
   ب. دوو نموونە لەسەر ئەو ماددە باوانە بڵێ کە لە پلەی گەرمی ژووردا هەڵدەکشێن.
10. مەبەست لە پلەی بەستنی ئاسایی ماددەیەکی دیاریکراوچییە؟
11. هۆی زیادبوونی هەڵمە پەستانی شلێکی دیاریکراو و ڕاڤە بکە لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمییدا.
12. ئەو پێوەندییەی هێزەکانی یەکتر ڕاکێشانی نێوان گەردەکانی شل، بە هەڵمە پەستانەکەیەوە پێکەوە دەبەستی، ڕاڤە بکە.
13. أ. پێوەندیی نێوان کەشە پەستان و پلەی کوڵانی شل ڕاڤە بکە.
    ب. پێوەندی چییە لە نێوان پلەی گەرمی شل و پلەی گەرمی هەڵمەکەیدا، لەو ماوەیەدا کە کوڵان تیدا بەردەوام دەبێت، لەو پەستانەدا؟
    ج. ئەو دیاردەیە چۆن لێك دەدەیتەوە؟
14. ئەو پێوەندییە ڕاڤە بکە، کە بڕی مۆڵە گەرمی هەڵماندنی شلێك دەبەستێ بە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان گەردەکانی ئەو شلەوە.
15. ئەو پێوەندییە ڕاڤە بکە، کە مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی ڕەقێك دەبەستێ بە هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوان تەنۆکەکانیەو.
16. وەسفی پێکهاتەی گەردی ئاوبکە.
17. هەشت ڕەوشتی فیزیایی ئاو بژمێرە.

## چەند پرسێك

### مۆڵە گەرمی (گەرمی مۆڵی)

18. أ. مۆڵە گەرمی هەڵماندنی ئاو دەگاتە 40.79 kJ/mol ، ئەم گەرمییە بەیەکەی J/g دەربڕە.
    ب. مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی بەفر دەگاتە 6.009 kJ/mol ، ئەم گەرمیە بە یەکەی J/g دەربڕە.

**.19** مۆڵە گەرمی هەڵماندنی ئاو دەگاتە 40.79 kJ/mol ، وزەی پێویستی هەڵماندنی ئەمانە چەندە؟
أ. 5.00 mol ئاو
ب. 45.0 g ئاو
ج. $8.45 \times 10^{10}$ گەرد ئاو

**.20** مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی سەهۆڵ دەگاتە 6.009 kJ/mol ، چەند وزە بۆ شلکردنەوەی ئەمانە پێویستە:
أ. 12.75 mol بەفر
ب. $6.48 \times 10^5$ kg بەفر

**.21** مۆڵە گەرمی هەڵماندنی ماددەیەك بدۆزەرەوە، كە هەر ی 0.433 mol ی 36.5 kJ ی وزە دەمژرێت لە كاتی هەڵماندنیدا.

**.22** ئەگەر زانیت مۆڵە بارستەی ماددەیەكی دیاریكراو 259.0 g/mol و هەر 71.8 g ی 4.307 kJ دەمژێت لە كاتی شلبوونەوەییدا، ئەمانە بدۆزەرەوە:
أ. ژمارەی مۆڵەكانی لە نموونەیەكیدا كە بارستەكەی 71.8 g ی ئەو ماددەیە بێت.
ب. مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی.

**.23** أ. ژمارەی مۆڵەكانی نموونەیەكی شلی ماددەیەك، كە مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی 3.811 kJ/mol بێت، ئەگەر بزانیت ئەو نموونەیە 83.2 kJ وزە دەدات لەكاتی بەستنیدا.
ب. مۆڵە بارستەی ئەو ماددەیە بدۆزەرەوە، ئەگەر بارستەی نموونەكە 5519 g بێت.

**.24** كام لەم دوو نموونەیەی خوارەوە گەردە ئاوی زۆرتری تێدایە:
5.00 $cm^3$ بەفر لە پلەی گەرمی 0°C دا یان 5.00 $cm^3$ ئاو لە هەمان پلەی گەرمیدا؟ نموونە گەورەكە چەندی لە نموونە بچووكەكە زیاترە؟ ڕێژەی نێوان ژمارەی گەردە ئاوی دوو نموونەكە هەریەكەیان بۆ ئەوەی تریان چەندە؟

## پێداچونەوەی هەمەجۆر

**.25** بەهای مۆڵە گەرمی هەڵماندنی ماددەیەك بدۆزەرەوە، ئەگەر بزانیت كە 3.21 mol لە و ماددەیە 28.4 kJ وزە دەمژێت، كاتێك لە دۆخی شلەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخی گاز.

**.26** مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی سەهۆڵ 6.009 kJ/mol ، بڕی وزەی پێویستی شلكردنەوەی $7.95 \times 10^5$ g سەهۆڵ بدۆزەرەوە.

**.27** مۆڵە گەرمیی هەڵماندنی ماددەیەك 31.6 kJ/mol ، بڕی ماددە لە نموونەیەكدا چەندە كە هەڵماندنی پێویستیی بە 57.0 kJ وزە هەیە؟

**.28** ئەگەر بزانیت مۆڵە گەرمی هەڵماندیی ئاو 40.79 kJ/mol ، چەند گرام ئاو دەهەڵمێت، ئەگەر 0.545 kJ وزەی بدەینێ؟

**.29** بڕی وزەی پەیدابوو لە بەستنی 13.3 g ی ماددەیەكی شل بدۆزەرەوە ئەگەر بزانیت مۆڵە بارستەی ئەم ماددەیە 82.9 g/mol و مۆڵە گەرمی شلبوونەوەی 4.60 kJ/mol

**.30** ئەم سیستمە (شل – هەڵم) ە ی خوارەوە لە بارەی هاوسەنگییدایە لە پلەیەكی گەرمی دیاریكراودا و لە سیستمێكی داخراودا:

$$H_2O(l) + \text{گەرمە وزە} \rightleftarrows H_2O(g)$$

وادابنێ كە پلەی گەرمی بەرزبۆتەوە لە پلەیەكی گەرمی بەرزتردا هاوسەنگی هاتووەتەدی، كاریگەری ئەم گۆڕانە لەسەرهەریەكە لە مانەی خوارەوە چییە؟
أ. تێكرای هەڵمین
ب. تێكرای خەستبوونەوە
ج. خەستی كۆتایی گەردەكانی هەڵم
د. ژمارەی كۆتایی گەردەكانی شل.

**.31** پلەی گەرمی سیستمێكی هاوسەنگی (شل – هەڵم) چی بەسەر دێت ئەگەر بكەوێتە بەر كاریگەری ئەمانە:
أ. زۆربوونی تێكرای كۆتایی هەڵماندن.
ب. زۆربوونی خەستی كۆتایی هەڵم.
ج. زۆربوونی تێكرای كۆتایی خەستبوونەوە.
د. زۆربوونی ژمارەی كۆتایی گەردەكانی شل.

## بیركردنەوەی ڕەخنەسازانە

**.32** **كارپێكردنی هزر:** كاری ئارەقكردنەوە لە فێنككردنەوەی گەرمی لەش، ڕاڤە بكە.

**.33** **لێكدانەوەی چەمكەكان:** لەكاتی بەستنی ماددەیەكدا، ئەو ماددەیە وزە ون دەكات، لە كاتێكدا پلەی گەرمی سیستمی (شل – ڕەق) ناگۆڕدرێت، ئەم دیاردەیە ڕوون بكەرەوە.

**34. کارپێکردنی نموونە:** پلەی گەرمی سیستمی بەفر – ئاو لە پلەی گەرمی $0^oC$ دا بە جێگیری دەمێنێتەوە لە ژێر پەستانی کەشی ئاساییدا، بێ ڕەچاوکردنی پلەی گەرمی دەوروبەر، لەبەر ڕۆشنایی بنەمای لوشاتلیێدا، ئەو ڕاستییە ڕوون بکەرەوە.

**35.** چۆن بەرز بوونەوەی گەرمی هەڵماندنی ماددەیەك، لە گەرمی شلبوونەوەی لێك دەدەیتەوە؟

**36. لێکدانەوەی چەمکەکان:** میثان $CH_4$ ، کە لە گەردە قەبارە و بارستەدا وەك ئاو وایە، لە پلەی گەرمی ژووردا گازە، بەڵام ئاو لەو پلەیەدا شلە، هۆیەکە ڕوون بکەرەوە.

## پێداچوونەوەی چەمکەکان

**37.** سیرامیك، لەو سیلیکاتەی لە خاکدا هەیە پێك دێت و، هونەرمەندان لە گڵجۆشسازی و کاشیسازیدا بە کاری دێنن، بەڵام ئەندازیار و زانایان ماددەی فرە گەیێن لەسیرامیك دروست دەکەن (لە بواری فرە گەیێنە سیرامیکییەکان و زۆر بەکارهێنانیان (کارپێکردنیان بکۆڵەوە).

**38.** بلوورە شلەکان sliquid crystals ، ئەو ماددانەن، کە ڕەوشەکانی شل و ڕەقی بلووری کۆکردۆتەوە، ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەو ماددانە و کارپێکردنە جۆراوجۆرەکانیان بنووسە.

## بریتییە هەڵسەنگاندن

**39.** لیستێکی ئەو ماددە ڕەقە بلووری و نابلوورییانەی لە ماڵدا هەن ئامادە بکەو، لیستەکەی خۆت بە هی هاوپۆلەکانت بەراوردبکە.

**40.** نەخشەی تاقیکردنەوەی گەشە پێکردنی بلوورەکان لە ماددەی ماڵێکی باو و بێ ترس بکێشە و بارودۆخی نموونەیی گەشەی ئەو بلوورانە جێگیر بکە و بسەلمێنە

# خشتەی خولیی توخمەکان

**کانزاکان**
- کانزا ئەلکیلییەکان
- کانزا ئەلکالییە زەمینییەکان
- کانزا گواستراوەکان
- کانزای تر

**نیمچە کانزاکان**
- نیمچە گەیێنەکان

**نا کانزاکان**
- هاڵۆجینەکان
- ناکانزای تر
- گازە خانەدانەکان (دەگمەنەکان)

| کۆمەڵەی 10 | کۆمەڵەی 11 | کۆمەڵەی 12 | کۆمەڵەی 13 | کۆمەڵەی 14 | کۆمەڵەی 15 | کۆمەڵەی 16 | کۆمەڵەی 17 | کۆمەڵەی 18 | خولەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | | 2 **He** Helium 4.002602 $1s^{2}$ | 1 |
| | | | 5 B Boron 10.811 $[He]2s^{2}2p^{1}$ | 6 C Carbon 12.011 $[He]2s^{2}2p^{2}$ | 7 N Nitrogen 14.00674 $[He]2s^{2}2p^{3}$ | 8 O Oxygen 15.9994 $[He]2s^{2}2p^{4}$ | 9 F Fluorine 18.9984032 $[He]2s^{2}2p^{5}$ | 10 Ne Neon 20.1797 $[He]2s^{2}2p^{6}$ | 2 |
| | | | 13 Al Aluminum 26.981539 $[Ne]3s^{2}3p^{1}$ | 14 Si Silicon 28.0855 $[Ne]3s^{2}3p^{2}$ | 15 P Phosphorus 30.9738 $[Ne]3s^{2}3p^{3}$ | 16 S Sulfur 32.066 $[Ne]3s^{2}3p^{4}$ | 17 Cl Chlorine 35.4527 $[Ne]3s^{2}3p^{5}$ | 18 Ar Argon 39.948 $[Ne]3s^{2}3p^{6}$ | 3 |
| 28 Ni Nickel 58.6934 $[Ar]3d^{8}4s^{2}$ | 29 Cu Copper 63.546 $[Ar]3d^{10}4s^{1}$ | 30 Zn Zinc 65.39 $[Ar]3d^{10}4s^{2}$ | 31 Ga Gallium 69.723 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{1}$ | 32 Ge Germanium 72.61 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{2}$ | 33 As Arsenic 74.92159 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{3}$ | 34 Se Selenium 78.96 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{4}$ | 35 Br Bromine 79.904 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{5}$ | 36 **Kr** Krypton 83.80 $[Ar]3d^{10}4s^{2}4p^{6}$ | 4 |
| 46 Pd Palladium 106.42 $[Kr]4d^{10}5s^{0}$ | 47 Ag Silver 107.8682 $[Kr]4d^{10}5s^{1}$ | 48 Cd Cadmium 112.411 $[Kr]4d^{10}5s^{2}$ | 49 In Indium 114.818 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{1}$ | 50 Sn Tin 118.710 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{2}$ | 51 Sb Antimony 121.757 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{3}$ | 52 Te Tellurium 127.60 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{4}$ | 53 I Iodine 126.904 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{5}$ | 54 Xe Xenon 131.29 $[Kr]4d^{10}5s^{2}5p^{6}$ | 5 |
| 78 Pt Platinum 195.08 $[Xe]4f^{14}5d^{9}6s^{1}$ | 79 Au Gold 196.96654 $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{1}$ | 80 Hg Mercury 200.59 $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}$ | 81 Ti Thallium 204.3833 $[Xe]4f^{14}5d^{10}6p^{1}$ | 82 **Pb** **Lead** **207.2** $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}6p^{2}$ | 83 **Bi** **Bismuth** **208.98037** $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}6p^{3}$ | 84 Po Polonium (208.9824) $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}6p^{4}$ | 85 At Astatine (209.9871) $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}6p^{5}$ | 86 Rn Radon (222.0176) $[Xe]4f^{14}5d^{10}6s^{2}6p^{6}$ | 6 |
| 110 Uun* Ununnilium (269)** $[Rn]5f^{14}6d^{9}7s^{1}$ | 111 Uuu* Ununnilium (272)** $[Rn]5f^{14}6d^{10}7s^{1}$ | 112 Uub* Ununbium (277)** $[Rn]5f^{14}6d^{10}7s^{2}$ | 113 | 114 **Uuq*** **Ununquadium** (285)** $[Rn]5f^{14}6d^{10}7s^{2}7p^{2}$ | 115 | 116 Uuh* Ununhexium (289)** $[Rn]5f^{14}6d^{10}7s^{2}7p^{4}$ | 117 | 118 Uuo* Ununoctium (293)** $[Rn]5f^{14}6d^{10}7s^{2}7p^{6}$ | 7 |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 63 **Eu** **Europium** **151.966** $[Xe]4f^{7}6s^{2}$ | 64 Gd Gadolinium 157.25 $[Xe]4f^{7}5d^{1}6s^{2}$ | 65 **Tb** **Terbium** **158.92534** $[Xe]4f^{9}6s^{2}$ | 66 Dy Dysprosium 162.50 $[Xe]4f^{10}6s^{2}$ | 67 Ho Holmium 164.930 $[Xe]4f^{11}6s^{2}$ | 68 Er Erbium 167.26 $[Xe]4f^{12}6s^{2}$ | 69 Tm Thulium 168.93421 $[Xe]4f^{13}6s^{2}$ | 70 Yb Ytterbium 173.04 $[Xe]4f^{14}6s^{2}$ | 71 Lu Lutetium 174.967 $[Xe]4f^{14}5d^{1}6s^{2}$ |
| 95 Am Americium (243.0614) $[Rn]5f^{7}7s^{2}$ | a96 Cm Curium (247.0703) $[Rn]5f^{7}6d^{1}7s^{2}$ | 97 Bk Berkelium (247.0703) $[Rn]5f^{9}7s^{2}$ | 98 Cf Californium (251.0796) $[Rn]5f^{10}7s^{2}$ | 99 Es Einsteinium (252.083) $[Rn]5f^{11}7s^{2}$ | 100 Fm Fermium (257.0951) $[Rn]5f^{12}7s^{2}$ | 101 Md Mendelevium (258.10) $[Rn]5f^{13}7s^{2}$ | 102 No Nobelium (259.1009) $[Rn]5f^{14}7s^{2}$ | 103 Lr Lawrencium 262.11 $[Rn]5f^{14}6d^{1}7s^{2}$ |




| خولەکان | کۆمەڵەی 1 | کۆمەڵەی 2 | کۆمەڵەی 3 | کۆمەڵەی 4 | کۆمەڵەی 5 | کۆمەڵەی 6 | کۆمەڵەی 7 | کۆمەڵەی 8 | کۆمەڵەی 9 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1<br>H<br>Hydrogen<br>1.00794<br>$1s^1$ | | | | | | | | |
| 2 | 3<br>Li<br>Lithium<br>6.941<br>$[He]2s^1$ | 4<br>Be<br>Beryllium<br>9.012182<br>$[He]2s^2$ | | | | | | | |
| 3 | 11<br>Na<br>Sodium<br>22.989768<br>$[Ne]3s^1$ | 12<br>Mg<br>Magnesium<br>24.3050<br>$[Ne]3s^2$ | | | | | | | |
| 4 | 19<br>K<br>Potassium<br>39.0983<br>$[Ar]4s^1$ | 20<br>Ca<br>Calcium<br>40.078<br>$[Ar]4s^2$ | 21<br>Sc<br>Scandium<br>44.955910<br>$[Ar]3d^1 4s^2$ | 22<br>Ti<br>Titanium<br>47.88<br>$[Ar]3d^2 4s^2$ | 23<br>V<br>Vanadium<br>50.9415<br>$[Ar]3d^3 4s^2$ | 24<br>Cr<br>Chromium<br>51.9961<br>$[Ar]3d^5 4s^1$ | 25<br>Mn<br>Manganese<br>54.93805<br>$[Ar]3d^5 4s^2$ | 26<br>Fe<br>Iron<br>55.847<br>$[Ar]3d^6 4s^2$ | 27<br>Co<br>Cobalt<br>58.93320<br>$[Ar]3d^7 4s^2$ |
| 5 | 37<br>Rb<br>Rubidium<br>85.4678<br>$[Kr]5s^1$ | 38<br>Sr<br>Strontium<br>87.62<br>$[Kr]5s^2$ | 39<br>Y<br>Yttrium<br>88.90585<br>$[Kr]4d^1 5s^2$ | 40<br>Zr<br>Zirconium<br>91.224<br>$[Kr]4d^2 5s^2$ | 41<br>Nb<br>Niobium<br>92.90638<br>$[Kr]4d^4 5s^1$ | 42<br>Mo<br>Molybdenum<br>95.94<br>$[Kr]4d^5 5s^1$ | 43<br>Tc<br>Technetium<br>(97.9072)<br>$[Kr]4d^6 5s^1$ | 44<br>Ru<br>Ruthenium<br>101.07<br>$[Kr]4d^7 5s^1$ | 45<br>Rh<br>Rhodium<br>102.906<br>$[Kr]4d^8 5s^1$ |
| 6 | 55<br>Cs<br>Cesium<br>132.90543<br>$[Xe]6s^1$ | 56<br>Ba<br>Barum<br>137.327<br>$[Xe]6s^2$ | 57<br>La<br>Lanthanum<br>138.9055<br>$[Xe]5d^1 6s^2$ | 72<br>Hf<br>Hafnium<br>178.49<br>$[Xe]4f^{14} 5d^2 6s^2$ | 73<br>Ta<br>Tantalum<br>180.9479<br>$[Xe]4f^{14} 5d^3 6s^2$ | 74<br>W<br>Tungsten<br>183.84<br>$[Xe]4f^{14} 5d^4 6s^2$ | 75<br>Re<br>Rhenium<br>186.207<br>$[Xe]4f^{14} 5d^5 6s^2$ | 76<br>Os<br>Osmium<br>190.23<br>$[Xe]4f^{14} 5d^6 6s^2$ | 77<br>Ir<br>Iridium<br>192.22<br>$[Xe]4f^{14} 5d^7 6s^2$ |
| 7 | 87<br>Fr<br>Francium<br>(223.0197)<br>$[Rn]7s^1$ | 88<br>Ra<br>Radium<br>(226.0254)<br>$[Rn]7s^2$ | 89<br>Ac<br>Actinium<br>(227.0278)<br>$[Rn]6d^1 7s^2$ | 104<br>Rf<br>Rutherfordium<br>(261.11)<br>$[Rn]5f^{14} 6d^2 7s^2$ | 105<br>Db<br>Dubnium<br>(262.114)<br>$[Rn]5f^{14} 6d^3 7s^2$ | 106<br>Sg<br>Seaborgium<br>(263.118)<br>$[Rn]5f^{14} 6d^4 7s^2$ | 107<br>Bh<br>Bohrium<br>(262.12)<br>$[Rn]5f^{14} 6d^5 7s^2$ | 108<br>Hs<br>Hassium<br>(265)**<br>$[Rn]5f^{14} 6d^6 7s^2$ | 109<br>Mt<br>Meitnerium<br>(265)**<br>$[Rn]5f^{14} 6d^7 7s^2$ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 58<br>Ce<br>Cerium<br>140.115<br>$[Xe]4f^1 5d^1 6s^2$ | 59<br>Pr<br>Praseodymium<br>140.908<br>$[Xe]4f^3 6s^2$ | 60<br>Nd<br>Neodymium<br>144.24<br>$[Xe]4f^4 6s^2$ | 61<br>Pm<br>Promethium<br>(144.9127)<br>$[Xe]4f^5 6s^2$ | 62<br>Sm<br>Samarium<br>150.36<br>$[Xe]4f^6 6s^2$ |
| 90<br>Th<br>Thorium<br>232.0381<br>$[Rn]6d^2 7s^2$ | 91<br>Pa<br>Protactinium<br>231.03588<br>$[Rn]5f^2 6d^1 7s^2$ | 92<br>U<br>Uranium<br>238.0289<br>$[Rn]5f^3 6d^1 7s^2$ | 93<br>Np<br>Neptunium<br>(237.0482)<br>$[Rn]5f^4 6d^1 7s^2$ | 94<br>Pu<br>Plutonium<br>244.0642<br>$[Rn]5f^6 7s^2$ |

* ناوی کاتی هێشتا لەلایەن IUPAC وە لەسەری ڕێك نەکەوتوون.

** خەمڵێنراو بەپێی ئەو زانیارییانەی کە ئێستا لای IUPAC هەن.

## خشتەی ( أ - 1 ) پێوانەکانی سیستمی نێودەوڵەتی SI

### پێشگرە مەترییەکان

| پێشگر | هێما | هاوکۆڵکەی ئەندازەیی بنچینەیی |
|---|---|---|
| جیگا | G | 1 000 000 000 |
| میگا | M | 1 000 000 |
| کیلۆ | k | 1 000 |
| هیکتۆ | h | 100 |
| دیکا | da | 10 |
| دەسی | d | 0.1 |
| سەنتی | c | 0.01 |
| میللی | m | 0.001 |
| مایکرۆ | $\mu$ | 0.000 001 |
| نانۆ | n | 0.000 000 001 |
| بیکۆ | p | 0.000 000 000 001 |

### بارستە

| | |
|---|---|
| **1 کیلۆگرام (kg)** | |
| **1 گرام (g)** | 0. 001 kg = |
| **1 میللیگرام (mg)** | 0.000 001 kg = |
| **1 مایکرۆگرام ($\mu$g)** | 0.000 000 001 kg = |

### درێژی

| | |
|---|---|
| **1 کیلۆمەتر (km)** | 1000 m = |
| **1 مەتر (m)** | = یەکەیەکی درێژی بنچینەیی سیستمی نێودەوڵەتی |
| **1 سەنتیمەتر (cm)** | 0. 01 m = |
| **1 مللیمەتر (mm)** | 0. 001 m = |
| **1 مایکرۆمەتر )$\mu$)m** | 0. 000 001 m = |
| **1 نانۆمەتر (nm)** | 0. 000 000 001 m = |
| **1 بیکۆمەتر (pm)** | 0.000 000 000 001 m = |

### ڕووبەر

| | |
|---|---|
| **1 کیلۆمەتر دووجا ($km^2$)** | = 100 هێکتار (ha) |
| **1 هێکتار (ha)** | = 10 000 مەتر دووجا ($m^2$) |
| **1 مەتر دووجا ($m^2$)** | = 10 000 سەنتیمەتر دووجا ($cm^2$) |
| **1 سانتیمەتر دووجا ($cm^2$)** | = 100 میللیمەتر دووجا ($mm^2$) |

### قەبارە

| | |
|---|---|
| **1 لیتر** | یەکەیەکی باو بەکارهێنراوی قەبارەی شلەکانە (کەلە یەکەیەکی SI نییە) |
| **1 مەتر سێجا ($m^3$)** | 1000 L = |
| **1 کیلۆ لیتر (kL)** | 1000 L = |
| **1 میللیلتر (mL)** | 0.001 L = |
| **1 میللیلتر (mL)** | 1 = سەنتیمەتر سێجا |

## خشتەی ( أ - 2 ) نەگۆڕە (جێگیرە) فیزیاییەکان

| بڕ | هێما | بەها |
|---|---|---|
| یەکەی بارستەی گەردیلەیی | amu | $1.660\ 5402 \times 10^{-27}$ kg |
| ژمارەی ئاڤۆگادرۆ | $N_A$ | $6.022\ 137 \times 10^{23}$/mol |
| بارستەی ئەلیکترۆنی ئارام | $m_e$ | $9.109\ 3897 \times 10^{-31}$ kg<br>$5.4858 \times 10^{4-}$ amu |
| جێگری گازی نموونەیی | $R$ | 8.314 L • kPa/mol • K<br>0.0821 L • atm/mol • K |
| قەبارەی مۆڵی گازی نموونەیی لە مەرجەکانی STP دا | $V_M$ | 22.414 10 L/mol |
| بارستەی نیوترۆنی ئارام | $m_n$ | $1.674\ 9286 \times 10^{-27}$ kg<br>1.008 665 amu |
| پلەی کوڵانی ئاوی ئاسایی | $T_b$ | 373.15 K = 100.0ºC |
| پلەی بەستنی ئاوی ئاسایی | $T_f$ | 273.15 K = 0.00ºC |
| جێگیری پلانك | $h$ | $6.626\ 076 \times 10^{-34}$ s • J |
| بارستەی پرۆتۆنی ئارام | $m_p$ | $1.672\ 6231 \times 10^{-27}$ kg<br>1.007 276 amu |
| خێرایی ڕوناکی لە بۆشاییدا | $c$ | $2.997\ 924\ 58 \times 10^{8}$ m/s |
| پلەی گەرمی پنی سیانی ئاو | | 273.16 K = 0.01ºC |

## خشتەی ( أ - 3 ) توخمەکان: هێماکانیان، گەردیلە ژمارە، بارستە ژمارە

| ناوی توخمی | هێما | گەردیلە ژمارە | بارستە ژمارە |
|---|---|---|---|
| ئیتریۆم | Y | 39 | 88.90585 |
| ئیربیۆم | Er | 68 | 167.26 |
| ئەرگۆن | Ar | 18 | 39.948 |
| ئیریدیۆم | Ir | 77 | 192.22 |
| ئۆزمیۆم | Os | 76 | 190.23 |
| ئەستاتین | At | 85 | [209.9871] |
| ئەکتینیۆم | Ac | 89 | [227.0278] |
| ئۆکسجین | O | 8 | 15.9994 |
| ئەلەمنیۆم | Al | 13 | 26.981539 |
| ئەمریسیۆم | Am | 95 | [243.0614] |
| ئەنتیمۆن | Sd | 51 | 121.757 |
| ئیندیۆم | In | 49 | 114.818 |
| ئیتربیۆم | Yb | 70 | 173.04 |
| ئینیشتینیۆم | Es | 99 | [252.083] |
| باریۆم | Ba | 56 | 137.327 |
| پراسۆدیمیۆم | Pr | 59 | 140.908 |
| بەرکیلیۆم | Bk | 97 | [247.0703] |
| برۆم | Br | 35 | 79.904 |
| بیریلیۆم | Be | 4 | 9.012182 |
| بیزموث | Bi | 83 | 208.98037 |
| پلاتین | Pt | 78 | 195.08 |
| پلادیۆم | Pb | 46 | 106.42 |
| پلتۆنیۆم | Pu | 94 | [244.0642] |
| پۆتاسیۆم | K | 19 | 39.0983 |
| بۆرۆن | B | 5 | 10.811 |
| بۆریۆم | Bh | 107 | [262.12] |
| پۆلۆنیۆم | Po | 84 | [208.9824] |
| تربیۆم | Tb | 65 | 158.92534 |
| تەکنیشیۆم | Tc | 43 | [97.9072] |
| تیلۆریۆم | Te | 52 | 127.60 |
| تەنتالیۆم | Ta | 73 | 180.9479 |
| تەنگستن | W | 74 | 183.84 |
| تیتانیۆم | Ti | 22 | 47.88 |
| ثالیۆم | Tl | 81 | 204.3833 |
| ثۆریۆم | Th | 90 | 232.0381 |
| ثۆلیۆم | Tm | 69 | 168.93421 |
| گادۆلینیۆم | Gb | 64 | 157.25 |
| گالیۆم | Ga | 31 | 69.723 |
| جەرمانیۆم | Ge | 32 | 72.61 |
| ئاسن | Fe | 26 | 55.847 |
| زینک | Zn | 30 | 65.39 |
| دوبنیۆم | Db | 105 | [262.114] |
| دیسپرۆسیۆم | Dy | 66 | 162.50 |
| زێڕ | Au | 79 | 196.96654 |
| ڕادۆن | Rn | 86 | [222.0176] |
| ڕادیۆم | Ra | 88 | [226.0254] |
| قورقوشم | Pb | 82 | 207.2 |
| ڕینیۆم | Re | 75 | 186.207 |
| ڕۆبیدیۆم | Rb | 37 | 85.4678 |
| ڕەزەرفۆردیۆم | Rf | 104 | [261.11] |
| ڕۆثینیۆم | Ru | 44 | 101.07 |
| ڕۆدیۆم | Rh | 45 | 102.906 |
| جیوە | Hg | 80 | 200.59 |
| زیرکۆنیۆم | Zr | 40 | 91.224 |
| زەرنیخ | As | 33 | 74.92159 |
| زینۆن | Xe | 54 | 131.29 |
| ساماریۆم | Sm | 62 | 150.36 |
| سترۆنیۆم | Sr | 38 | 87.62 |
| سکاندیۆم | Sc | 21 | 44.955910 |
| سیلیکۆن | Si | 14 | 28.0855 |
| سیلینیۆم | Se | 34 | 78.96 |
| سیبۆرجیۆم | Sg | 106 | [263.118] |
| سیریۆم | Ce | 58 | 140.115 |
| سیزیۆم | Cs | 55 | 132.90543 |
| سۆدیۆم | Na | 11 | 22.989768 |
| فرانسیۆم | Fr | 87 | [223.0197] |
| فێرمیۆم | Fm | 100 | [257.0951] |
| زیو | Ag | 47 | 107.8862 |
| فلۆر | F | 9 | 18.998403 |
| ڤەنادیۆم | V | 23 | 50.9415 |
| فۆسفۆر | P | 15 | 30.9738 |
| تەنەکە | Sn | 50 | 118.710 |
| کادمیۆم | Cb | 48 | 112.411 |
| کالیسیۆم | Ca | 20 | 40.078 |
| کالیفۆرنیۆم | Cf | 98 | [251.0796] |
| گۆگرد | S | 16 | 32.066 |
| کریپتۆن | Kr | 36 | 83.80 |
| کاربۆن | C | 6 | 12.011 |
| کرۆم | Cr | 24 | 51.9961 |
| کلۆر | Cl | 17 | 35.4527 |
| کۆباڵت | Co | 27 | 58.93320 |
| کۆریۆم | Cm | 96 | [247.0703] |
| لەنثانیۆم | La | 57 | 138.9055 |
| لوتیشیۆم | Lu | 71 | 174.967 |

## خشتەی ( أ - 3 ) پاشکۆی

| ناوی توخمی | هێما | ژمارەی گەردیلەی | ژمارەی بارستە |
|---|---|---|---|
| لیثیۆم | Li | 3 | 6.941 |
| لۆرانسیۆم | Lr | 103 | [262.11] |
| مەگنیسیۆم | Mg | 12 | 24.3050 |
| مەندەلیفیۆم | Mb | 101 | [258.10] |
| مەنگەنیز | Mn | 25 | 54.93805 |
| مۆلیبدینۆم | Mo | 42 | 95.94 |
| میتزیۆم | Mt | 109 | [266] |
| نیپتۆنیۆم | Np | 93 | [237.0482] |
| مس | Cu | 29 | 63.546 |
| نۆبلیۆم | No | 102 | [259.1009] |
| نایترۆجین | N | 7 | 14.00674 |
| نیکڵ | Ni | 28 | 58.6934 |
| نیوبیۆم | Nb | 41 | 92.90638 |

| ناوی توخمی | هێما | ژمارەی گەردیلەی | ژمارەی بارستە |
|---|---|---|---|
| نیودیمیۆم | Nb | 60 | 144.24 |
| نیۆن | Ne | 10 | 20.1797 |
| هیسیۆم | Hs | 108 | [265] |
| هافنیۆم | Hf | 72 | 178.49 |
| هۆڵمیۆم | Ho | 67 | 164.930 |
| هایدرۆجین | H | 1 | 1.00794 |
| هیلیۆم | He | 2 | 4.002602 |
| یۆرپیۆم | Eu | 63 | 151.966 |
| یۆد | I | 53 | 126.904 |
| یۆرانیۆم | U | 92 | 238.0289 |

ئەو بەهایانەی خراونەتە نێوان دوو کەوانەوە، بارستە ژمارەی زۆربەی توخمە جێگیرەکان یان هاوتا باوترەکانیانە، بارستەی گەردیلەیی زۆربەی توخمەکان،هەڵەیان تێدایە کەلە $\pm 1$ تی ناپەڕێت لە پلەی کۆتایی دراودا.

## خشتەی ( أ - 4 ) ئایۆنە باوەکان

| کاتایۆن | هێما | ئانایۆن | هێما |
|---|---|---|---|
| ئەلومنیۆم | $Al^{3+}$ | سرکات (ئەسیتات) | $CH_3COO^-$ |
| ئەمۆنیۆم | $NH_4^+$ | ئۆکسید | $O^{2-}$ |
| باریۆم | $Ba^{2+}$ | برۆمید | Br– |
| پۆتاسیۆم | $K^+$ | پێرکلۆرات | $ClO_4^-$ |
| تیتانیۆم (III) | $Ti^{3+}$ | پێرمەنگەنات | $MnO_4^-$ |
| تیتانیۆم (IV) | $Ti^{4+}$ | پیرۆکسید (ژوورۆکسید) | $O_2^{2-}$ |
| ئاسن (II) | $Fe^{2+}$ | دوانە کرۆمات | $Cr_2O_7^{2-}$ |
| ئاسن (III) | $Fe^{3+}$ | شەشە سیانۆی ئاسن | $Fe(CN)_6^{4-}$ |
| زینك | $Zn^{2+}$ | شەشە سیانۆی ئاسن | $Fe(CN)_6^{3-}$ |
| قورقوشم (II) | $Pb^{2+}$ | سیانید | $CN^-$ |
| جیوە (I) | $Hg_2^{2+}$ | فلۆرید | $F^-$ |
| جیوە (II) | $Hg^{2+}$ | فۆسفات | $PO_4^{3-}$ |
| زەرنیخ (III) | $As^{3+}$ | گۆگردات | $SO_4^{2-}$ |
| سترۆنیۆم | $Sr^{2+}$ | هایدرۆ گۆگردات (گۆگرداتی هایدرۆجین) | $HSO_4^-$ |
| سۆدیۆم | $Na^+$ | گۆگردیت | $SO_3^{2-}$ |
| زیو | $Ag^+$ | گۆگردید | $S^{2-}$ |
| تەنەکە (II) | $Sn^{2+}$ | کاربۆنات | $CO_3^{2-}$ |
| تەنەکە (IV) | $Sn^{4+}$ | هایدرۆکاربۆنات، بایکاربۆنات، کاربۆناتی هایدرۆجین | $HCO_3^-$ |
| کالیسیۆم | $Ca^{2+}$ | کرۆمات | $CrO_4^{2-}$ |
| کرۆم (II) | $Cr^{2+}$ | کلۆرات | $ClO_3^-$ |
| کرۆم (III) | $Cr^{3+}$ | کلۆریت | $ClO_2^-$ |
| کۆباڵت (II) | $Co^{2+}$ | کلۆرید | $Cl^-$ |
| کۆباڵت (III) | $Co^{3+}$ | نیترات | $NO_3^-$ |
| مەگنیسیۆم | $Mg^{2+}$ | نیتریت | $NO_2^-$ |
| مس (I) | $Cu^+$ | هایپۆکلۆریت | $ClO^-$ |
| مس (II) | $Cu^{2+}$ | هایدرۆکسید | $OH^-$ |
| نیکڵ (II) | $Ni^{2+}$ | هایدرید | $H^-$ |
| هایدرۆنیۆم | $H_3O^+$ | یۆدید | $I^-$ |

## خشتەی ( أ - 5 ) ڕەوشی توخمە باوەکان

| ناو | شێوە / ڕەنگ لەپلەی گەرمی ژووردا | چڕی $(g/cm^3)$* | پنتی شلبوونەوە (C°) | پنتی کوڵان (C°) | بارەئۆکسانە باوەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ئۆکسجین | گازێکی بێڕەنگە | 1.429* | –218.4 | –182.962 | 2– |
| ئەلەمنیۆم | کانزایەکی زیوییە | 2.702 | 660.37 | 2467 | 3+ |
| باریۆم | کانزایەکی سپی شینباوە | 3.51 | 725 | 1640 | 2+ |
| برۆم | شلێکی سوور - قاوەییە | 3.119 | -7.2 | 58.78 | 7+ ،5+ ،3+ ،1+ ،1– |
| پلاتین | کانزایەکی زیوییە | 21.45 | 1772 | 100±3827 | 4+ ،2+ |
| پۆتاسیۆم | کانزایەکی زیوییە | 0.86 | 63.25 | 760 | 1+ |
| تیتانیۆم | کانزایەکی زیوییە | 4.5 | 1660 ± 10 | 3287 | 4+ ،3+ ،2+ |
| جەرمانیۆم | نیمچە کانزایەکی خۆڵەمێشەییە | 5.325 [25] | 937.4 | 2830 | 4+ |
| ئاسن | کانزایەکی زیوییە | 7.86 | 1535 | 2750 | +3 ،2+ |
| زینك | کانزایەکی سپی - شینە | 7.14 | 419.58 | 907 | 2+ |
| زێڕ | کانزایەکی زەردە | 19.31 | 1064.43 | 2±2808 | 3+ ،1+ |
| قورقوشم | کانزایەکی سپی شینباوە | 11.343716 | 327.502 | 1740 | 4+ ،2+ |
| زەرنیخ | نیمچە کانزایەکی خۆڵەمێشییە | 5.727[41] | (28 atm) 817 | 613 | 5+ ،3+ ،3– |
| جیوە | کانزایەکی شلی زیوییە | 13.5462 | –38.87 | 356.58 | +2 ،1+ |
| سترۆنیتیۆم | کانزایەکی زیوییە | 2.6 | 769 | 1384 | 2+ |
| سیلیکۆن | نیمچە کانزایەکی خۆڵە مێشییە | 0.01±2.33 | 1410 | 2355 | 4+ ،2+ |
| سۆدیۆم | کانزایەکی زیوییە | 0.97 | 97.8 | 882.9 | 1+ |
| زیو | کانزایەکی سپییە | 10.5 | 961.93 | 2212 | 1+ |
| فلۆر | گازێکی زەردە | 1.69• | –219.62 | –188.14 | 1– |
| فۆسفۆر | ڕەقێکی زەردە | 1.82 | 44.1 | 280 | 5+ ،3+ ،3– |
| تەنەکە | کانزایەکی سپییە | 7.28 | 231.88 | 2260 | 4+ ،2+ |
| کالیسیۆم | کانزایەکی زیوییە | 1.54 | 2±839 | 1484 | 2+ |
| گۆگرد | ڕەقێکی زەردە | 1.96 | 119.0 | 444.674 | 6+ ،4+ ،2– |
| کاربۆن | ئەڵماس | 3.51 | (36.5 atm) 3500 | 3930 | 4+ ،2+ |
| | گرافت | 2.25 | 3652 | | |
| کرۆم | کانزایەکی خۆڵە مێشییە | 7.2028 | 20±1857 | 2672 | 6+ ،3+ ،2+ |
| کلۆر | گازێکی سەوز - زەردە | 3.214* | –100.98 | –34.6 | 7+ ،5+ ،3+ ،1+ ،1– |
| کۆباڵت | کانزایەکی خۆڵەمێشییە | 8.9 | 1495 | 2870 | 3+ ،2+ |
| لیثیۆم | کانزایەکی زیوییە | 0.534 | 180.54 | 1342 | 1+ |
| مەگنیسیۆم | کانزایەکی زیوییە | 1.745 | 648.8 | 1107 | 2+ |
| مەنگەنیز | کانزایەکی سپی - خۆڵە مێشییە | 7.20 | 3±1244 | 1962 | 7+ ،6+ ،4+ ،3+ ،2+ |
| مس | کانزایەکی سوورە | 8.92 | 4.3801±2.0 | 2567 | 2+ ،1+ |
| نایترۆجین | گازێکی بێڕەنگە | 1.2506* | –209.86 | –195.8 | 5+ ،3+ ،3– |
| نیکڵ | کانزایەکی زیوییە | 8.90 | 1455 | 2730 | 3+ ،2+ |
| نیۆن | گازێکی بێڕەنگە | 0.9002* | –248.67 | –245.9 | 0 |
| هایدرۆجین | گازێکی بێڕەنگە | 0.0899* | –259.34 | –252.8 | 1+ ،1– |
| هیلیۆم | گازێکی بێڕەنگە | 0.1785* | (26 atm) –272.2 | –268.9 | 0 |
| یۆد | ڕەقێکی ڕەش - شینە | 4.93 | 113.5 | 184.35 | +7 ،+5 ،3+ ،1+ ،1– |
| یۆرانیۆم | کانزایەکی زیوییە | 10.02±9.05 | 0.8±1132.3 | 3818 | 6+ ،4+ ،3+ |

* چڕی دراون لە پلەی گەرمی 20°C دا.
• چڕی فلۆر بە g/L دراوە لە ژێر پەستانی 1 atm کەش و پلەی گەرمی 15°C دا .
* چڕی گازەکان بە g/L دراون لە باری STP دا.

## خشتەی ( أ - 6 ) هەڵمەپەستانی ئاو

| پلەی گەرمی (°C) | پەستان (mm Hg) | پەستان (kPa) |
|---|---|---|
| **0.0** | 4.6 | 0.61 |
| **5.0** | 6.5 | 0.87 |
| **10.0** | 9.2 | 1.23 |
| **150.** | 12.8 | 1.71 |
| **15.5** | 13.2 | 1.76 |
| **16.0** | 13.6 | 1.82 |
| **16.5** | 14.1 | 1.88 |
| **17.0** | 14.5 | 1.94 |
| **17.5** | 15.0 | 2.00 |
| **18.0** | 15.5 | 2.06 |
| **18.5** | 16.0 | 2.13 |
| **19.0** | 16.5 | 2.19 |
| **19.5** | 17.0 | 2.27 |
| **20.0** | 17.5 | 2.34 |
| **20.5** | 18.1 | 2.41 |
| **21.0** | 18.6 | 2.49 |
| **21.5** | 19.2 | 2.57 |
| **22.0** | 19.8 | 2.64 |
| **22.5** | 20.4 | 2.72 |
| **23.0** | 21.1 | 2.81 |
| **23.5** | 21.7 | 2.90 |
| **24.0** | 22.4 | 2.98 |
| **24.5** | 23.1 | 3.10 |
| **25.0** | 23.8 | 3.17 |
| **26.0** | 25.2 | 3.36 |
| **27.0** | 26.7 | 3.57 |
| **28.0** | 28.3 | 3.78 |
| **29.0** | 30.0 | 4.01 |
| **30.0** | 31.8 | 4.25 |
| **35.0** | 42.2 | 5.63 |
| **40.0** | 55.3 | 7.38 |
| **50.0** | 92.5 | 12.34 |
| **60.0** | 149.4 | 19.93 |
| **70.0** | 233.7 | 31.18 |
| **80.0** | 355.1 | 47.37 |
| **90.0** | 525.8 | 70.12 |
| **95.0** | 633.9 | 84.53 |
| **100.0** | 760.0 | 101.32 |

## خشتەی ( أ - 7 ) چڕی گازەکان بە پێیٚ سیببیلیبل

| گاز | چڕی $(g/cm^3)$ |
|---|---|
| ئۆکسجین | 1.429 |
| ئەمۆنیا | 0.771 |
| یەکۆکسیدی کاربۆن | 1.250 |
| یەکۆکسیدی نایترۆجین | 1.340 |
| یەکۆکسیدی دوانە نیترۆجین | 1.977 |
| ئیثین | 1.165 |
| دوانۆکسیدی گۆگرد | 2.927 |
| دوانۆکسیدی کاربۆن | 1.997 |
| گۆگردیدی هایدرۆجین | 1.539 |
| کلۆر | 3.214 |
| کلۆریدی هایدرۆجین | 1.639 |
| میثان | 0.7168 |
| نیترۆجین | 1.2506 |
| هەوای وشك | 1.293 |
| هایدرۆجین | 0.0899 |
| هیلیۆم | 0.1785 |

## خشتەی ( أ - 8 ) چڕی ئاو

| پلەی گەرمی (°C) | چڕی $(g/cm^3)$ |
|---|---|
| **0** | 0.999 84 |
| **2** | 0.999 94 |
| **3.98** | 0.999 973 |
| **4** | 0.999 97 |
| **6** | 0.999 94 |
| **8** | 0.999 85 |
| **10** | 0.999 70 |
| **14** | 0.999 24 |
| **16** | 0.998 94 |
| **20** | 0.998 20 |
| **25** | 0.997 05 |
| **30** | 0.995 65 |
| **40** | 0.992 22 |
| **50** | 0.988 04 |
| **60** | 0.983 20 |
| **70** | 0.977 77 |
| **80** | 0.971 79 |
| **90** | 0.965 31 |
| **100** | 0.958 36 |

# زاراوەکان

## ئـ

**ئانایۆنییە ئۆکسجینییەکان (ئۆکسیدی ئانایۆنییەکان)** oxyanions
ئەو ئانایۆنە فرە گەردیلانەن، کە ئۆکسجینیان تێدایە. (13)

**ئاویتە دوانییەکان** binary compounds
ئەو ئاوێتانەن، کە هەریەکەیان لە دووتوخمی جیاواز پەیدا بووە. (10)

**ئایۆنە یەکە گەردیلییەکان** monatomic ions
ئەو ئایۆنان، کە لە گەردیلەیەك پێك دێن (8)

**ئەو ژمارکارییە کیمیاییانەی کە لەسەر کارلێککردن دامەزراون :** reaction stoichiometry
ئەو ژمارکارییانەن، کە بایەخ بە بارستە پەیوەندی نێوان ماددە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان دەدەن لە کارلێکی کیمیاییدا. (77)

**ئۆکسانە ژمارەکان** oxidation numbers
ئەو ژمارانەن کە لە باری ئۆکسانی گەردیلە یان ئایۆنەکان لە ئاوێتەیەکدا وەردەگیرێن و سیستەمی ناونانی ستۆك پشتیان پێ دەبەستێت (20)

## ب

**بلوورە پێکهاتن (پێکهاتنی بلووری)** crystal structure
گشتە ریزبوونی سێ دووری گەردەکانی بلوورە. (163)

**بەستن** freezing
گۆڕانێکی فیزیاییە، لە ماددەیەکی شلەوە بۆ ڕەق بەگەرمی لابردن. (160)

**بڵاوبوونەوە** diffusion
لە خۆوە تێکەڵبوونێکی تەنۆکەکانی دوو ماددەیە، بە هۆی جووڵەی ئەو تەنۆکە نارێك جولاوانەوە. (101)

**بارۆمەتر (پەستان پێو)** barometer
ئامێرێکە، بۆ پێوانی پەستانی هەوا بەکاردێت. (106)

**بلوور (تەورك)** crystal
ماددەیەکە تەنۆکەکانی بەشێوەیەکی ئەندازەیی ڕێك و پێك و تەرزێکی چەند بارەوە بوو ریز دەبن. (162)

**بەرزاندن (هەڵکشاندن)** sublimation
گۆڕانە لە دۆخی ڕەقەوە بۆ گاز، بێئەوەی بە دۆخی شلیدا تێ بپەڕێت. (174)

**بەشە پەستان** partial pressure
پەستانی هەموو گازێك لە تێکەڵە گازێکدا (119)

**بنچینەی لوشاتلیێ** principle Le Chatelier's
کە سیستمێکی هاوسەنگ بخریتە بەر هەر کاریگەرییەك، سیستمەکە بەرە و بارێکی هاوسەنگی نوێ دەچێت، کەتا کەمترین سنوور کاریگەرییەکەی کە خراوەتە سەری کەم دەکاتەوە . (168)

**بارەکانی ئۆکسان** oxidation states
باری گەردیلە یان ئایۆنەکانی ئاوێتەیەکە، کە باری ئۆکسانەکانی لێ وەردەگیرێت. (20)

**بەرهەمی کردەیی (داهاتی کردەیی)** actual yield
بڕی پێوراوی بەرهەمە لە کارلێکێکی کیمیاییدا (91)

**بەرهەمی بیردۆزی** theoretical yield
ئەو پەری بەرهەمی بیردۆزانە دیاریکراوە، لە دیارییکارییە کیمیاییەکاندا. (91)

**بیردۆزی گەردە جووڵە** kinetic-molecular theory
بیردۆزێکە لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە تەنۆکەکانی ماددە لەباری جووڵانێکی هەمیشەییدان . (99)

## پ

**پاسکاڵ** pascal
ئەو پەستانەیە، کە هێزی نیوتنێك کاری پێ دەکاتە ڕووبەری مەتر دووجایەك. (107)

**پلەی شلبوونەوە:** melting point
ئەو پلە گەرمییەیە، کە ماددەی ڕەقی تێدا شل دەبێتەوە . (162)

**پلەی بەستن** freezing point
ئەو پلە گەرمییەیە، کە هەریەکەی ڕەق و شل لە باری هاوسەنگیدا دەبن، لە ژێر پەستانی یەك کەشدا 1 atm (101.3 kPa) . (173)

**پلەی گەرمی و پەستانی پێوانەیی** standard temperature and pressure
ئەوەی زانایان لە سەریان ڕێك کەوتوون، ئەمانەن: پەستان 1 atm کەش و پلەی گەرمی سفر پلەی سەدی. (108)

**پلەی کوڵان** boiling point
ئەو پلە گەرمییەیە، کە هەڵمەپەستان تێیدا یەکسانە بە پەستانی هەوا (کەش). (171)

**پەستان** pressure
هێزی کاریگەریی سەر یەکەی ڕووبەری ڕووتەختێکە. (104)

## ت

**تۆڕ** torr
پەستانی مللیمەترێك جیوەیە. (107)

## ج

**جیرە پێکداکەوتن** elastic collision
پێکداکەوتنی نێوان گەردەکانی گاز خۆیان و نێوان تەنۆکەکانی گاز و دیواری دەفرەکەیە، کە لەوماوەیەدا وزەی جووڵە هیچ کەم ناکات. (99)

# زاراوەكان

**جێگیری گازی نموونەیی**
ideal gas constant
جێگیری $R$ ە ، دەكاتە:
0.082057584 L • atm/mol • K . (137)

## خ

**خەستبوونەوە** condensation
كردەیەكە بەهۆیەوە دۆخی گازێك
دەگۆڕدرێت بۆ شل . (167)

**خوێ** salt
ڕەقێكە لە كارلێكی ترش و تفتێك پەیدا
دەبێت. (19)

## د

**دەرپەڕین** effusion
كردەیەكە، بەهۆیەوە تەنۆكەكانی گاز
بەكونێكی بچووكدا تێ دەپەڕن. (111)

**دیاریكار و كارلێككردووی (كارلێككردووی دیاریكەر)** limiting reactant
ئەو ماددەیە یە، كە پاش تەواوبونی
كارلێكی كیمیایی دەمێنێتەوە ( بەزیادە و
كارلێك نەكردوویی). (89)

## ر

**ڕەووشی مووینێتی** capillary action
ڕاكێشانی ڕووی شلێكە بۆ ڕووی
ماددەیەكی ڕەق. (159)

**ڕژۆكەكان؛ شلگاز** fluids
ئەو ماددانەن كە دەشێ برژێن، بۆیە
شێوەی ئەو دەفرە دەگرن كە تێیدان، وەك
شل و گازەكان. (100)

**ڕێژەی سەدی پێكهاتن**
percentage composition
بارستەی ڕێژەی سەدی هەموو
توخمەكانی ئاوێتەیەكە . (34)

**ڕێژەی سەدی بەرهەم**
percent yield
ڕێژەی سەدی بەرهەمی كردەییە، بۆ
بەرهەمی بیردۆزی . (91)

**ڕووە كرژی** surface tension
هێزێكە، بەشەهاوسێكانی ڕووی شل
پێكەوە ڕادەكێشێت، ئەوەش ڕووبەرەكە
كەم دەكاتەوە بۆ بچووكترین بەهای
گونجاو. (159)

## ز

**زنجیرەكانی چالاكی** activity series
لیستی ئەو توخمە كیمیاییانەیە، كە بە
پێی ئاسانی بەشداریكردنی لە
كارلێكردنەكاندا ڕێزكراون (68)

## ژ

**ژماركارییە كیمیاییەكانی پێكهاتن**
composition stoichiometry
ئەو ژماركارییانەن، كە بایەخ بە بارستە
پەیوەندی نێوان توخمەكان لە
ئاوێتەكاندا دەدات. (77)

**ژمارەی ئاڤۆگادرۆ** Avogadro's number
ژمارەی ئەو تەنۆكانەیە كە لە مۆڵێكی
ماددەیەكی خاوێندا هەن و، نزیك
كراوەتەوە بۆ: $6.022 \times 10^{23}$ (27)

## س

**سفری پەتی** absolute zero
پلەی گەرمی ( $-273.15^{\circ}C$ ی سەدییە)،
كە بەرانبەری بەهای سفرە لە پێوەری
كەلڤندا. (113)

## ش

**شلبوونەوە** melting
گۆڕانێكی فیزیاییە، ماددەیەكی ڕەق
دەگۆڕدرێت بۆ شل، بەگەرمكردنی. (162)

**شلە زوور ساردكەرەوەكان**
supercooled liquids
ئەو ماددانەن، كەهەندێ ڕەوشی شلەكان
دەپارێزن، تەنانەت لەو پلە
گەرمییانەیشدا، كە ماددەكان ڕەق
دەردەكەون. (162)

**شلە هەڵمیووەكان** volatile liquids
ئەو شلانەن، كە بە ئاسانی دەهەڵمن.
(171)

**شێوگە هاوكێشە** formula equation
ئەو هاوكێشە كیمیاییەیە، كە ماددە
كارلێككردوو بەرهەمهاتووەكانی بە هێما
و شێوگ پێشان دراون. (49)

**شێوگە بارستە (بارستە شێوگ)**
formula mass
كۆی تێكرای بارستەی
گەردیلەیی(گەردیلە بارستەی) ئەو
گەردیلانەیە كە لە شێوگەكە دا هەن. (25)

**شێوگی باری یان كردەیی**
empirical formula
سادەترین ڕێژەی هێمای توخمە
یەكگرتووەكانی ئاوێتەیەكە (37)

## ق

**قەبارەی مۆڵی پێوانەیی گاز**
standard molar volume of gas
قەبارەی مۆڵێكی گاز لە بارەی
پێوانەییەكانیدا . (131)

## ك

**كارلێكی یەكگرتن** synthesis reaction
كارلێكی دوو ماده یان زۆرترە، بۆ
پێكهێنانی ئاویتەیەكی نوێ (60)

**كارلێكی سووتان** combustion reaction
یەكگرتنی ماددەیەك لە گەڵ ئۆكسجین و
دەرپەراندنی وزەیە بە شێوەی گەرمی ، و
ڕووناكی (66)

**كارلێكی پێچەوانە** reversible reaction
كارلێككردنێكی كیمیاییە، بەهەرمەكانی
یان بەرهەمەكەی، ماددە كارلێككردووە
بنچینەییەكانی پێك دەهێننەوە (51)

# زاراوەکان

## ك

**كارلێكی لادان یان جێگرتنەوە (پێگۆرینەوە)** displacement reaction
كارلێكی جێگرتنەوە (پێگۆرینەوە) ی توخمێك، یان زۆرترە، بە لێكچوویەكی،لە توخمەكانی ئاوێتەیەكی دیاریكراودا. (64)

**كارلێكی تاكە گۆرینەوە**
single replacement reaction
كارلێككردنێكی كیمیایە توخمێكی ئاوێتەیەكی تێدا دەگۆردرێتەوە بە توخمێكی تر (64)

**كارلێكی جووتە گۆرین**
double replacement reaction
ئایۆن گۆركێ نێوان دوو ئاوێتەی جیاوازە، بۆ پێكهێنانی دوو ئاوێتەی نوێ (65)

**كارلێكی لێكهەڵوەشان و شیبوونەوە**
decomposition reaction
كارلێككردنی كارلێككردوویەكە، دوو ماددە یان زۆرتری كەمتر ئاڵۆزی لێ پەیدا دەبێت (62)

**كارلێكی پێكهێنان**
composition reaction
كارلێكی نێوان دوو ماددە یان زۆرترە، بۆ پێكهێنانی ئاوێتەیەكی نوێ (60)

**كارۆ شیكردنەوە (بەكارەبا شیكردنەوە)**
electrolysis
لێك هەڵوەشانی ماددەیەكی دیاریكراوە، لە گیراوە یان شلەوەبوویەكدا لەكاتی پێدا تێپەراندنی تەزوویەكی كارەباییدا (63)

**كوڵان** boiling
كردەی گۆرانی شلە بۆ هەڵم و، لە ناو شلەكە و لەسەر رووە كەیشی روو دەدات، كوڵان كاتێك روودەدات، كە هەڵمە پەستانی شلەكە یەكسان بێت بە پەستانی هەوا. (171)

## گ

**گەرمی مۆڵی شلبوونەوە:**
molar heat of fusion
ئەو برە وزە گەرمییەیە، كە بۆ شلكردنەوەی مۆڵێكی ماددەی رەق پێویستە، لەپلەی شلبوونەوەیدا. (174)

**گەرمیی مۆڵیی هەڵماندن**
molar heat of vaporization
ئەو برە وزە گەرمییەیە، كە بۆ هەڵماندنی مۆڵێكی شلێك پێویستە، لەپلەی كوڵانەكەیدا. (172)

**گازی راستەقینە** real gas
گازێكە، كە بەتەواوی گریمانەكانی بیردۆزی جووڵەی گەردی (گەردەجووڵە) ناهێنێتەدی. (102)

**گازی نموونەیی** ideal gas
گازێكی ئەندێشەییە، كە بەتەواوی هەموو گریمانەكانی بیردۆزی جووڵەی گەردی (گەردەجووڵە) دەهێنێتەدی. (99)

## م

**ماددە رەقە بلوورییەكان**
crystalline solids
ماددە رەقە لە بلوور پێكهاتووەكانن . (162)

**ماددە رەقە نا بلوورییەكان**
amorphous solids
ئەو ماددە رەقانەن، كە تەنۆكەكانیان بە شێوەیەكی نارێك رێزبوون. (162)

**مۆڵ** mole
ئەو برەی ماددەیە، كە ژمارەیەك تەنۆكەی تێدایە، دەكاتە ژمارەی گەردیلەكانی كاربۆن لە12 گرام كاربۆن −12 دا . (26)

**مۆڵە بارستە** molar mass
بارستەی مۆڵێكی ماددەیەكی خاوێنە (27)

**مۆڵە رێژە (رێژەی مۆڵی)** mole ratio
هاوكۆلكەی گۆرینی بری دوو ماددەی كارلێككردنێكی كیمیاییە بۆ مۆڵ. (78)

**میللیمەتر جیوە** millimeter of mercury
یەكەیەكی پەستانی زۆربەكارهێنراوە. (107)

## ن

**ناونان** nomenclature
سیستمێكی ناونانی توخم و ئاوێتە كیمیاییەكانە (10)

**نیشاندن** deposition
گۆرانە لە دۆخی گازەوە بۆ رەق، بێئەوەی بە دۆخی شلیدا تێبپەرێت. (174)

**نیشتە : نیشتوو** percipitate
ئەو رەقەیە، كە لە كارلێككردنێكی كیمیایی لە گیراوەیەكدا پەیدا دەبێت. (47)

**نیوتن** Newton
ئەندازەی یەكەی SI ی هێزە و، ئەو هێزەیە كە دەتوانێ خێرایی بارستەیەكی یەك كیلۆگرامی، مەترێك لە چركەیەكدا زیاتر بكات، هەر چركەیەك هێزەكەی تێدا كارپێ بكرێت. (105)

## هـ

**هاوسەنگبوون(هاوسەنگی)** equilibrium
بارێكی جووڵۆكە، دوو گۆرانی پێچەوانەی تێدا روودەدات بە دوو خێرایی یەكسان لە سیستمێكی داخراودا. (166)

**هاوكۆڵكە** coefficient
ژمارەیەكی تەواوە، لە پێش شێوگەكانی هاوكێشەی كیمیاییدا دەردەكەوێت. (48)

**هاوكێشەی كیمیایی**
chemical equation
ئەو كۆمەڵە هێمایە و شێوگانەیەكە توخم و ئاوێتە كارلێككردوو بەرهەمهاتووەكان و رێژە برەكانیان پێشان دەدەن . (47)

**هەڵمێن** evaporation
کردەیەکە، بە هۆیەوە تەنۆکەکان ڕووی شلێك لە پێش کوڵاندا بەجێ دەهێڵن و دەچیتە دۆخی گازەوە. (159)

**هەڵماندن** vaporization
کردەیەکە بە هۆیەوە ماددەیەکی شل یان ڕەق دەگۆڕدرێت بۆ گاز. (159)

**هەڵمە پەستان** the vapor pressure
ئەو پەستانەیەکە هەڵم کاری پێ دەکات، لەباری هاوسەنگی لەگەڵ شلەکەیدا لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا. (169)

## و

**ووشە هاوکێشە** word equation
ئەو هاوکێشە کیمیاییەیە، کە ماددە کارلێککردوو بەرهەمهاتووەکان بە ووشە پێشان دراون. (49)

## ی

**یاسای ئەڤوگادرۆ** Avogadro's law
قەبارە یەکسانەکانی گازە جیاوازەکان، هەمان ژمارە گەردیان تێدایە، لە هەمان بارودۆخی پەستان و پلەی گەرمیدا (130)

**یاسای بۆیڵ** Boyle's law
قەبارەی بارستەیەکی دیاریکراوی گاز، پێچەوانە هاوڕێژە دەبێت (دەگوڕدێت) لەگەڵ پەستان، لەکاتی جێگیریی پلەی گەرمیدا (110)

**یاسای گایلۆساك** Gay-Lussac's law
پەستانی بارستەیەکی دیاریکراوی گاز، ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت (دەگۆڕێت) لەگەڵ پلەی گەرمی بە کەلڤن، لەکاتی جێگیریی قەبارەدا. (116)

**یاسای قەبارەی گازە یەکگرتووەکانی گایلۆساك**
Gay-Lussac's law of combining volumes of gases
دەتوانرێت، گازە کارلێکردوو بەرهەمهاتووکان بە ڕێژەی ژمارەیی سادە دەربڕدرێت، لەکاتی جێگیری پلەی گەرمی و پەستاندا. (129)

**یاسای دەرپەڕینی (گراهام)**
Graham's law of effusion
تێکرایی (خێرایی) دەرپەڕینی گازەکان، پێچەوانە هاوڕێژە دەبن (دەگۆڕێن) لەگەڵ ڕەگی دووجای مۆڵە بارستەکانیان، لە هەمان باری پلەی گەرمی و پەستاندا. (147)

**یاسای بەشەپەستانەکانی داڵتۆن**
Dalton's law of partial pressure
گشتە پەستانی تێکەڵە گازێك، دەکاتە کۆی بەشەپەستانەکانی ئەو گازانەی تێکەڵەکەیان لێ پێك دێت. (119)

**یاسای شارڵ** Chrale's law
قەبارەی بارستەیەکی گاز، ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت (دەگۆڕێت)، لەگەڵ پلەی گەرمی بە کەلڤن، لەکاتی جێگیری پەستاندا. (113)

**یاسای گشتی گازەکان**
combined gas law
پەیوەندییەکی بیرکاریانە، پەستانی بڕێکی دیاریکراوی گاز و قەبارە و پلەی گەرمییەکەی پێکەوە دەبەستێ. (117)

**یاسای گازی نموونەیی** ideal gas law
پەیوەندییەکی بیرکارییانەیە، پەستانی گاز و قەبارە و پلەی گەرمی و ژمارەی مۆڵەکانی پێکەوە دەبەستێ. (135)

**یاساکانی گاز** gas laws
پەیوەندی بیرکاری سادە، قەبارەی گاز و پلەی گەرمی و پەستان و بڕەکەی پێکەوە دەبەستێ. (109)

**یەکەی خانە** unit cell
بچوکترین بەشی تۆڕی بلوورییە، نموونەی سیانە دووریی تۆڕەکە بە تەواوی دەردەخات. (163)

**یەکەی ئەندازەیی پەستانی هەوا**
atmosphere of pressure
بەتەواوی دەکاتە، 760 mm Hg ملم جیوە . (107)

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| أرقام سفلية | ژێرە ڕەنووس |
| أرقام علوية | ژوورە ڕەنووس |
| استيعاب | تێگەیشتن |
| أداء | ڕاییکاری |
| إنجاز | ڕاپەڕاندن، تەواوکردن، بەرهەم |
| امتلاك | هەبوون |
| استقصاء | ڕێبەرێی |
| إدراك | هەستپێکردن |
| إتقان | قاڵبوون |
| الربط التقاطعي | پێوەستیی یەکتربڕی |
| الخرائط المفاهيمية | نەخشە چەمکییەکان |
| استجابة | بەدەنگەوەچوون |
| ابتكار | داهێنان |
| اكتشاف | دۆزینەوە |
| إبداع | جوانکاری |
| بند | بڕگە |
| تنفيذ | جێبەجێکردن |
| تقويم | هەڵسەنگاندن |
| تقدير | نرخاندن، قەبڵاندن |
| تواصل | بەردەوامی، درێژەپێدان |
| تقليدي | کۆنباو |
| تفريع | لقکاری، پەلهاویشتن |
| تطبيق | کارپێکردن |
| تعديل | ڕاستکردنەوە |
| حسابات | ژمارکاری |
| خبرة | شارەزایی |
| خِيار | هەڵبژاردن |
| دليل التقويم | ڕێبەری هەڵسەنگاندن |
| عصري | نوێباو |
| فائض | ماوە، کارنەکراو، زیادە |
| قائمة تدقيق | لیستی وردکاری |
| لائحة | لیست، ڕست |
| مردود | داهات |
| متفاعل | کارلێکردوو |
| معيار، مقياس | پێوەر |
| مؤشر الأداء | نیشانەی ڕاییکاری |
| ملف | فایل، دۆسیێ |
| معرفة | زانیاری |
| محتوى | ناوەرۆك |
| مهارة | کارامەیی |
| ممارسة | کارتیاکردن |
| مبتدئ | تازە دەستپێکردوو |
| مقبول | پەسند |
| مبرّر | پاساو |